




مەریوان وریا قانیع

# شوناس و ئاڵۆزی

چەند وتارێك دژ بە دۆگماتیزم

مەریوان وریا قانیع

# شوناس و ئاڵۆزی

## چەند ووتارێک دژ بە دۆگماتیزم



لە بڵاوکراوەکانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی

ناوی کتێب: شوناس و ئاڵۆزی
بابەت: کۆمەڵێک ووتار
ناوی نووسەر: مەریوان وریا قانیع
وێنەی بەرگ: ئێشەر
تیراژ: ٣٠٠٠
ژمارەی سپاردن.
چاپ:چاپخانەی ڕەنج
سلێمانی ٢٠٠٤

بۆ هەورامانی برام،

پیاوێکی هێمن و بێدەنگ لە وڵات و سەردەمێکی پڕ دەنگەدەنگدا.

## ناواخن

## پێشەکی: عەقڵ، دۆگماتیزم، مانا

ئەگەرچی ئەم کتێبە لە کۆمەڵێک ووتاری هەمەجۆر پێکهاتووە، کە لە ئان و ساتی جیاوازدا و لەپەیوەندیاندا بە بۆنە و ڕووداوی جیاوازەوە نووسراون، بەڵام هەموویان لەو خاڵەدا یەکدەگرنەوە کە بەگژاچوونەوەییەکی فرەلایەنی شێوە جیاجیاکانی دۆگماتیزمی فیکرین. ئەم ووتارانە وەڵامدانەوەیەکی فیکری ئەو دیدە سادە و یەکلایەن و بێخەیاڵانەن کە جیهان بەڕادەیەکی ترسناک سادەدەکەنەوە بۆ باش و خراپ، ڕاست و درۆ و ڕەش و سپی و بەهەشت و جەهەنەم. لە ڕاستیدا ئەم کتێبە بەگژاچوونەوەی ئەو دۆخی بیرنەکردنەوە و کڕکەوتنەیە بەسەر کۆمەڵێک قەناعەتی ئایدیۆلۆژی و دینی سادەدا کە لە ڕۆشنبیریی و فیکری سیاسی کوردیدا ساڵانێکی درێژە بەرجەستەن و دۆخێکی ترسناکی دۆگماتیزم و سادەگۆیی و غەیبانیەتیان سەروەرکردوە کە سەرەکیترین دەرکەوتیان نەبینینی ئاڵۆزییەکانی جیهان و ئاڵۆزییەکانی کۆمەڵگا و ئاڵۆزییەکانی ئەو دیاردانەیە کە ئەمڕۆ لە چواردەوری ئێمەدا ئامادەن. نەبینینی ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەو پێکهات و ڕووداو و چوارچێوانەن کە ئینسان و کۆمەڵگای کوردی تیایاندا دەژین و بیردەکەنەوە و ڕاڤەدەکەن.

دۆگماتزیم مانای باڵادەستبوونی بیرێک، بۆچوونێک یان سەرنجێک بەسەر کۆی تواناکانی بیکردنەوە و تێڕامان و تێفیکریندا تا ڕادەی ئیفلیجکردنی هەمەلایەنەی ئەم توانایانە. مانای بەندکردنی کۆی تواناکانی بیکردنەوە لە وێنەیەک، تێزێک یان تیورەیەکی تایبەتدا دەربارەی جیهان، کە زۆرجار کەسێکی دەسەڵاتدار هەڵگریەتی. ئەم کەسەش هەرجارە و ناوێک لە خۆی دەنێت، هەندێک جار خۆی وەک کەسێکی موقەدەس نیشانئەدات، هەندێکجار وەک عاریف و ڕۆحانییەک، هەندێکجاریش وەک سەرکردە و ڕابەرێکی سیاسی. کەسی دۆگماتیست دەشێت دینی بێت، دەشێت عەلمانی بێت، دەشێت هیچیشیان نەبێت. ئەوەی لە دۆگماتیزمدا ئامادەیە داخستنی ئەگەرەکانی بیرکردنەوە و تێڕامان و ڕاڤەکردنە بەڕووی یەک شێواز و یەک دید و یەک تێزدا.

دۆگماتزیم لەو لۆژیکە سادەیەی دابەشکردنی جیهاندا ئامادەیە کە شتەکان بۆ ڕەش و سپی، باش و خراپ و «من» دژ بە «ئەوانیدی»دا دابەشدەکات. پەیوەندی

نێوان دۆگامتیزم و سادەگۆیی لە فۆرمی دابەشکردنی شتەکاندا بۆ ڕەش و سپی و باش و خراپ، پەیوەندییەکی بونیادی و قووڵە و لەزیاد لە ئاست و مەودایەکدا هاوماڵ و نیشتەجێی ناو یەک عەقڵەیت و خەیاڵ و وێناکردنی سیاسی و ڕۆشنبیرین. دۆگماتیزم، کە لۆژیکی زاڵکردنی دۆگمایەک، واتە بیرۆکەیەکە، بەسەر کۆی دۆگماکانی دیکەدا، جگە لەوەی نیشانەی تەمبەڵییەکی فیکرییە، یان وەک یئمانۆێل کانت دەڵێ نیشانەی ناکامڵی و پێنەگەیشتنی ئینسانە، لەهەمانکاتدا بەخشینی کاراکتەری «ڕاستییەکی ڕەهاشنە» بەو بیرۆکەیە لە پەیوەندیدا بە هەر بیرۆکە و دۆگمێکەوە لەدەرەوەی ئەودا ئامادەبێت. واتە دۆگماتیزم بۆیە دۆگماتیزمە چونکە ئامادە نییە جگە لە ڕاستی و دروستی گریمانکراوی ناو دۆگماکانی خۆی ڕاست و دروستی هیچ دۆگمێکی دیکە ببینێت. جگە لەوەی کە لە خۆی ڕادەمێنێ و حیکمەتەکانی خۆی ئەزبەردەکات و بەسەرچاوەی دواهەمین و تاقە ڕاستییەکیان دەزانێت، ئامادە نییە ئەگەری هەقیقەتێکی سادەش لەناو دۆگم و بۆچوونەکانی دیکەدا ببینێت. بەمەش هەمان ئەو دابەشکردنە دوو جەمسەرییە سادەیە دووبارە دەکاتەوە کە سادەگۆکان لە ڕێگایەوە هەموو ئاڵۆزییەکانی جیهان و بوون و فیکر بۆ چەند دۆگم و تەوەرە و پۆلێکی دژ بەیەک دابەشدەکەن. بەم مانایە وەکچۆن دۆگماتیزم دایکی سادەگۆییە، ئاواش سادەگۆیی پەرژینەکانی دۆگماتیزم بەهێز و قایم دەکاتەوە، هەر یەکێک لەم دووانە ئەویدیان بەهێز و پتەو دەکات. لەگەڵ دۆگماتیزمدا عەقڵ بەیەک مانا و یەک پێناس و یەک دۆگم گەمارۆدەدرێت و ئەو جیهانە لە بیرۆکە و بۆچوون و توانای لێکدانەوەی جیاواز نابینرێت کە لەدەرەوەی دۆگماتیزمدا ئامادەیە. بۆیە دەرکەوتنی ڕاستەقینەی ئاڵۆزییەکان ئەم جیهانە، نیشاندانی مانا و توانا و ئەگەرە فرەڕەنگەکانی هەنگاوی یەکەم و گرنگی کۆتاییهێنانە بە دابەشکردنە سادەکان. لەڕاستیدا گەڕانەوەی ئاڵۆزی بۆ جیهان و بۆ دیاردەکانی ناو جیهان سەرەتای کۆتایهێنانە بە دۆگماتیزم. پەیامی سەرەکی ئەم کتێبە بەرگریکردنە لە ئاڵۆزییەکانی جیهان بەرامبەر بەو سادەگۆییە ئایدیۆلۆژییانەی لە ڕۆشنبیری و فیکری سیاسی کوردیدا ئامادەیە.

دۆگماتیزم و سادەگۆیی زیانیان زۆرە، بەڵام لەهەموویان ترسناکتر ئەوەیە کە ناهێڵن عەقڵ تواناکانی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە وەگەڕبخات، ناهێڵن عەقڵ لە پەیوەندیدا بە جیهانەوە ئازاد و سەربەخۆ بێت، ڕێگرن لەبەردەم

کرانەوەی دیاردەکاندا بەڕووی عەقڵ و لەبەردەم کرانەوەی عەقڵیشدا بەڕووی دیاردەکاندا. لەو شوێنانەدا کە ئینسان پێویستە بیربکاتەوە و شتەکان زانستییانە ڕاڤەبکات، لەوێدا دیوارێک لەنێوان توناکانی بینین و بیستن و هەستکردن و ئەرگومێنت هێنانەوەدا و لەنێوان جیهاندا هەڵدەچنن کە جگە لە تاریکی هیچی دی نەبینرێت. بەم کارەشیان داخرانێکی مەعریفی و میتۆدی دەخەنەوە کە چەند ڕێگرن لەبەرهەمهێنانی زانیاری نوێ بۆ تێگەیشتن لە جیهان، بەهەمان ئەندازەش لەڕووی ئەخلاقییەوە نابەرپرسیار و گوناهکارن. ئەوەی نەهێڵێت جیهان لە ئاڵۆزییەکانیدا ببینرێت ناشهێڵێت هەڵویستی ئەخلاقی ڕاستەقینەیان بەرامبەر وەربگیرێت. بەم مانایە دۆگماتیزم چەند مانای ئیفلیجکردنی عەقڵ و داخستنی دەرگاکانە لەبەردەم بەرهەمهێنانی زانیارییەکی ڕاستەقینەدا بەرامبەر بە جیهان، ئاواش مانای ڕێگرتنە لەبەردەم دروستبوونی ئەخلاقێکدا کە بەرپرسیارانە لە ئینسان و کۆمەڵگا و جیهان بڕوانێت. لێرەوەیە کە دۆگماتیزم و سادەگۆیی دوژمنی هەرە سەرەکی ڕۆشنگەرین، ڕۆشنگەری بە مانا کانتییەکەی کە بریتییە لە توانای وەگەڕخستنێکی ئاشکرا و سەربەخۆ و ڕەخنەییانەی عەقڵ، کە لەسەرێکەوە مەعریفەیەکی کراوە و زانستی بەرهەمدەهێنێت لەسەرێکی دیکەوە بە ئینسان جۆرێک لە بەرپرسیاریەت دەبەخشێت کە بۆ داینکردنی ژیانێک ڕێزدار هێجگار گرنگە.

لەهەر شوێنێکدا باسمان لە ڕۆشنگەریی کرد لە پەیوەندیدا بە بەگژاچوونەوەی دۆگماتیزمەوە، لەوێدا باس لە عەقڵێکی کراوە و سەربەخۆ و ڕەخنەیی دەکەین. بەڵام عەقڵ چییە؟ لە چ پرۆسەیەکدا دروستدەبێت و چۆن دەتوانێت سنوورێک بۆ دۆگماتیزم و سادەگۆیی دابنێت؟

ئەڵبەتە من لێرەدا کات و ساتی ئەوەم نییە بەدرێژی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە، بەڵام دەتوانم زۆر بە کورتی چەند ڕاستییەکی سادە لە پەیوەندییاندا بە عەقڵ و بە بەکارهێنانی عەقڵەوە، بخەمە ڕوو. لەمەشدا دەگەڕێمەوە بۆ بۆچوونەکانی فەیلەسوفی ڕۆشنگەریی ئیمانوێل کانت، کە وەک یەکێک لەو فەیلەسوفانە ناسراوە کە جوگرافیای عەقڵ بەباشی دەناسێت. (Gude 2004). کانت پێیوایە عەقڵ ئەرک یان ئەمرێکە سروشت بەسەر ئێمەیدا سەپاندووە. واتە شتێکە ئێمە وەک بوونەورێکی سروشتی هەڵگرین و هەمانە. ئەوەی لەم بۆچوونەی کانتدا گرنگە ووشەی «ئێمە» یە. چونکە ئەم «ئێمە» یە هێما بۆ

ونێکی کۆمەڵایەتی پێکەوەیی و دەستەجەمعی دەکات کە لە ساتەوەختێکی یبەتدا ماهیەتێکی تایبەت بە عەقڵ دەبەخشێت (هـ. س. پ)

کەوابوو گەرهاتوو عەقڵ ئەمرێکی سروشتیی، یان پێدراوێکی خوداییش بێت، لام لە جەوهەردا شتێکی کۆمەڵایەتییە، دەرنجامی گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێ و کەوتنە، پەیوەندی بە گۆڕینەوە و ئاڵوگۆڕی ئەرگومێنت و ڕا و بۆچوونی یاوازەوە هەیە. لای کانت عەقڵ شتێکی تاکەکەسی نییە هەندێک بلیمەت ەیانبێت و ئەوانیدیش لێی بێبەشبن. عەقڵ توانایەکی تاکەکەسی نییە، بەڵکو ڕانایەکی گشتی و دەستەجەمعییە، چالاکییەکە تاکەکەسەکان دەتوانن تێیدا شداربن، بەڵام ئەم چالاکییە شتێک نییە تاکەکەسێک بەتەنها دایهێنابێت یان اوەن و هەڵگریبێت (هـ. س. پ ).

ئەوەی عەقڵ بەرهەمیدەهێنێت زانیارییە و ئەم زانیارییانەش ئەو سەرزەمینە شتییەن کە ئێمە بەیەکەوە گرێدەدەن. بێگومان ئەگەر عەقڵ چالاکی بێت و لە یوەندییەکی ئاڵوگۆڕکەر و دیالۆگئامێزی بەردەوامدا بێت لەگەڵ واقیع و نسان و دەوروبەردا، ئەوکات عەقڵ دەبێتە بوونەوەرێکی بگۆڕ، پێکهاتێکی ۆچەر و فرە جێ و فرە شوێن و فرە ئاراستە. واتە عەقڵ ناتوانێت لەسەر یەک ـز و یەک بۆچوون و یەک زنجیرە چەمک کرێکەوێت و وەک نەگۆڕ و موتڵەق امەڵەیان بکات. بۆیە عەقڵ لە ئازادی خۆیدا دژ بە دۆگماتیزمە، دژ بە ادەگۆیی و ڕەهاگەراییە، دژ بە سنووردارکردنی چالاکییەکانیەتی لە جوغزێکی چووک و بەرتەسک و داخراودا. عەقڵی ئازاد و دۆگماتیزم دوو پێکهاتی بەیەک کۆکن و ناکرێت لە یەک یەکەدا کۆبکرێنەوە.

وەک گوتمان عەقڵ لای کانت دەرنجامی گفتوگۆ و ئاڵۆگۆڕی ئەرگومێنت و گۆڕکێیە، واتە بەرەنجامی پرۆسەی دانووسانێکی کۆمەڵایەتی و مەعریفی ردەوامە. بەڵام کانت باوەڕی بە دانووسانی بەردەوام و بێکۆتایی نییە، کانت و مەترسییە ئاگادارمان دەکاتەوە کە دانووسانی بەردەوام دەشێت ڕێگربێت بەردەم بڕیارداندا و نەهێڵێت بە هیچ بڕیارێک بگەین. دانووسانی بەردەوام ەشێت ببێتە هۆی دروستبوونی گفتوگۆیەکی بێکۆتایی و هەمیشەیی کە بۆ ەقڵ مەودایەک بەجێنەهێڵێت بڕیاربدات. یان گفتوگۆ و دانووسانی بەردەوام بکات هیچ ئەنجامێک دروستنەبێت و شتەکان هەر لە ئاستی گفتوگۆدا

بمێننەوە. لای کانت عەقڵ پێویستی بەوەیە بڕایار بدات، یان بە بڕیار بگا
بڕیارنەدان مانای زاڵبوونی ڕۆحیەتی بێدەربەستی و گوێپێنەدان و نەبوو
بەرپرسیارێتی، بڕیارنەدان مانای هەڵبژاردنی هەڵوێستی تەماشاکەرێکی سل
کە تەنها کۆمەڵێک قسە دەکات و دەڕوات. کانت ئەم هەڵوێستە بە هەڵوێستێ
سلبی و خراپ دەزانێت. گوێپێنەدان و بڕیارنەدانیش هەلومەرجێک دروستدەکا
کە تێیدا ئینسان یان چاوی لە دەستی خودا بێت بڕیاری بۆ بدات یان لە دەس
کەسێک یان کەسانێکی کەم، کە بەناوی خودا یان هەر دەسەڵاتێکی دیکە
بدوێن. ڕەنگە بۆ تێگەیشتن لەم دیدە کانتییە بۆ عەقڵ نموونەی دانوسانی نێو
هێزە سیاسییەکانی کوردستان بۆ یەکخستنەوەی ئیدارە کوردییەکـ
یارمەتیدەربێت. هەمووومان دەزانین پارتی و یەکێتی لە ساڵی ١٩٩٧ەوە لیژنە
ئاشتییان هەیە و خەریکی دیالۆگ و دانووسانی بەردەوامن، بەڵام ئ
دانووسانانە دانووسانی بێبڕیار بوون، دانوسانێک بوون هەر خەریکی قسەکرد
و وتووێژ و ڕاگۆڕینەوەی دەرەوەی بڕیاردان بوون، بۆیە تا ئێستاش پرۆژەیەک
ڕاستەقینەی ئاشتی و یەکخستنەوەی ئیدارەکان لەئارادا نییە. لە دیدی کانتە
ئەوەی لێرەدا غائیبە ئامادەگی عەقڵێکی بڕیاردەرە کە بەدوای دەرەنجامـ
بگەڕێت، خۆی مەرجەعی خۆی بێت و ئازادبێت لە ئەنجامگیریدا و بوێرێ
بڕیاربدات. ئەوەی لە کوردستاندا ئامادەیە عەقڵێکی «بێدەربەست»
«گوێپێنەدەر» و نابەرپرسیارە» کە چاوی لە دەستی خودایەک یان نوێنە
سیاسییەکانی ئەو خودایەیە کە بڕیاریان بۆ بدات.

کانت ڕەگەزەکانی دۆگماتیزم لەناو خودی عەقڵ خۆیدا نیشتەجێدەکات و عە
خۆی دەکاتە سەرچاوی دۆگماتیزم. بەباوەڕی کانت کوشندەترین نەخۆش
ئەوەیە کە عەقڵ بەو ڕاستییە قایل نەبێت کە بڕیارەکانی بڕیاری کاتین
هەمیشەیی نین، ڕاستییەکانی ڕاستی ساتەوەختین و ئەبەدی نین. ویست
داخوازی عەقڵ بۆ ئەوەی بڕیارێکی یەکجارەکی و هەتاهەتایی بدات، دو
کێشەی گەورە دەخاتەوە. یەکەمیان کێشەی لەدایکبوونی دۆگماتیزمـ
دووهەمیان کێشەی لەدایکبوونی گومانگەراییە. من لێرەدا و لەپەیوەندیدا ب
پێشەکییەوە تەنها کەمەکێک لەسەر دۆگماتزیم دەوەستم. بەباوەڕی کان
کێشەی دۆگماتیزم لەوێوە دەستپێدەکات کە ئینسان بیەوێت بە وەڵامە کاتییەکا
سیفەتێکی ئەبەدیی ببەخشێت، ئەوەی ئەمڕۆ بڕیاری لەسەردەدرێت ببێت

بڕیارێک بۆ ئایندە، بۆ سبەینێ و دوو سبەی و سێ سبەی (هـ. س. پ ).
بەخشینی سیفەتی «ئەبەدی» بە «کاتیی» دەشێت لەلایەن کەس یان لایەنێکەوە ئەنجامبدرێت کە خۆی بە خاوەنی مافی دەرکردنی بڕیاری لەو بابەتە بزانێت، واتە بەخشینی سیفەتی ئەبەدی بە شتە کاتییەکان دەشێت بڕیاری تاکەکەسێک یان گروپێک بێت، یاخو لەڕێگای پەنابردنە بەر کەلەپوورەوە ئەنجامبدرێت، یان لەڕێگای هەر هێزێکەوە کە خۆی بە هێزێکی بان ئینسانی بزانێت (هـ. س. پ ). بەڵام لەبەرامبەر ئەم دۆخەدا چی دەکرێت؟ بۆ ڕزگاربوون لە دۆگماتیزم چی لەبەردەستدایە و چی دەتوانێت بەگژ دۆگماتیزمدا بچێتەوە؟

چارەسەری کانت بۆ ڕزگاربوون لە دۆگماتیزم و گومانگەرایی، ڕەخنەیە. ڕەخنە لای کانت چالاکییەکە بەهۆیەوە سنوور دادەنرێت بۆئەوەی بزانین هەقیقەتێک لە هەقیقەتەکان تا کوێ بڕدەکات، لەکوێدا دەزانین کە دەزانین و لەکوێدا دەزانین کە نازانین. ڕەخنە مانای وازهێنان لە ڕۆحیەتی گومانکاری تا ڕادەی باوەڕنەبوون بە هیچ، هەروەها مانای بەگژاچوونەوەی دۆگماتزیم بە مانای هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانی موتڵەقی بەردەوام. ڕەخنە دێت بۆئەوەی ئەو کلیلە بشکێنێت کە دۆگماتیستەکان پێیان وایە بەهۆیەوە دەتوانن هەموو دەرگاکان بکەنەوە و هەموو نهێنییەکان ئاشکرابکەن، لەنهێنییە ناوەکییەکانی ئینسانەوە بۆ نهێنییەکانی گەردوون و ئەودیوی گەردوون و ئەودیوی ئەودیوی گەردوون. لێرەوەیە لای کانت ڕۆشنگەری و ڕەخنە لەیەکدی جیانابنەوە.

ئەگەر لە ناوەندێکی ڕۆشنبیری و سیاسیدا دۆگماتیزم باڵادەست بێت، ئەگەر سادەگۆیی ناو دۆگماتزیم ببێتە گوتاری باڵادەستی بەرهەمهێنانی زانیاری، ئەوکات ئەوەی دەبێت بپشکنرێت پرۆسەی بەرهەمهێنانی زانیارییە. کۆی ئەو پەیوەندییانەیە کە عەقڵ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ دەوروبەر و دیاردەکاندا دروستیدەکات، ئەو شێوازی پێکەوەبوونەیە کە عەقڵ دەکەوێتە ناوییەوە و لەچوارچێوەیدا دەستبەکاردەبێت. ئەو میکانیزمانەیە بەهۆیانەوە دانووسان دروستدەبێت یان نابێت، بوون و نەبوونی توانای دیالۆگ و ڕاگۆڕکێیە. لێرەوە ڕەخنە لە دۆگماتیزم دەبێتە ڕەخنە لە عەقڵ و ڕەخنەش لە عەقڵ دەبێتە ڕەخنە لەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفیی و کولتوورییانەی کە بە عەقڵ چوارچێوەی کارکردن دەبەخشن.

ئەم ڕاستییانەیە وادەکەن دۆگماتیزم لەپاڵ ئەوەدا کە دەرکەوتێکی تایبەت بێت لە دەرکەوتەکانی عەقڵ، لەهەمانکاتدا دەرکەوتێک بێت لە دەرکەوتە تایبەتەکانی ئەو ناوەندە سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوورییەی کە عەقڵ لەناویدا دەستبەکارە. بۆیە ڕەخنە لە عەقڵ لە ڕەخنە لە کۆمەڵگا جیانابێتەوە و ڕەخنە لە کۆمەگاش لە ڕەخنە لە عەقڵ دانابڕێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەدا ووتارەکانی نێو ئەم کتێبە لەیەکاتدا ڕەخنەن لەو کەش و هەوا فیکری و ڕۆشنبیرییەی لە واقیعی ئێمەدا باڵادەستە، وەکچۆن ڕەخنەشن لەو بارودۆخە سیاسی و کۆمەلایەتییەی لە کوردستاندا سەروەرە. ئەم ووتارانە چەند ڕەخنەن لە سادەگۆییەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی، ئەوەندەش ڕەخنەن لە شێوازی کارکردنی ئەو دەسەلاتەی کە بە واقیعی ئێمە شوناسێکی سیاسی و کۆمەلایەتی دیاریکراو دەبەخشێت. لێرەوە زەحمەتە ڕەهەندە مەعرفییەکانی ئەم کتێبە لە ڕەهەندە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی جیابکەینەوە.

زۆربەی هەرە زۆری ئەو دۆگمانەی ئەم کتێبە بەگژیاندا دەچێتەوە دۆگمە تازەکانی ناو ڕۆشنبیری و فیکری سیاسی کوردین. هەڵەیەکی گەورە دەکەین پێمان وابێت دۆگماکانی ناو ڕۆشنبیرییەک توانای تازەبوونەوەیان نییە. چۆن توانا ڕەخنەییەکانی ناو ڕۆشنبیرییەک قابیلی تازەبوونەوەن ئاواش دۆگماکانی قابیلی تازەبوونەوەن. ئەو دۆگمانەی ئەمڕۆ ئامادەن جیاوازن لە دۆگماکانی سی ساڵ لەمەوبەر. سی ساڵ لەمەوبەر باس لە «ژێرخان» و «سەرخان»ی کۆمەڵگا، پێنج قۆناغی گەشەکردن، حەتمیەتی هاتنی سۆسیالیزم، ئابووری وەک هۆکاری دەستنیشانکەر دەکرا. واتە بەشی هەرە گەورەی دۆگما فیکرییەکان دۆگمای مارکسیستی بوون و لە خوێندنەوەیەکی سادەی مارکسیزمەوە سەرچاوەیان گرتبوو. بەلام ئەمڕۆ ئەو دۆگمایانە هێزی جارانیان لەدەستداوە و لای نوخبەیەکی زۆر بچووک و بێکاریگەریی نەبێت نەماونەتەوە. لەشوێنی ئەمانەدا کۆمەڵێک دۆگمای دیکە دروستبوون کە وابەستەی مێژووی هاوچەرخی کۆمەڵگای ئێمە و تێکەڵبوونی بەشە جیاوازەکانی جیهانە بەیەکدی. ئەمە سەرەڕای لەدایکبوون و ئامادەگی بزوتنەوە جیاوازەکانی «ئیسلامی سیاسی» لە کوردستاندا کە خەیاڵی ڕۆشنبیری و سیاسی ئێمەیان پڕکردوە لە دۆگمی دینی. لەم ڕەوتەدا ووتاری «جیهانگیری و ماناکانی» بەگژ کۆمەڵێک دۆگمادا دەچێتەوە کە لە چەند ساڵی ڕابووردودا لە ڕۆشنبیری ئێمەدا لەسەر دیاردەی جیهانگیری

هاتوونەتەکایەوە. لە ڕۆشنبیری ئێمەدا ئەم دیاردە نوێییە کۆمەڵێک دۆگمی بەرهەمهێناوە کە ڕۆشنبیرە عەلمانییە سادەگۆ و سەلەفییە دینییەکان پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن. یەکێک لە دۆگما هەرە بەهێزەکان دەربارەی جیهانگیری بریتییە لە یەکسانکردنی ئەم دیاردەیە بە پرۆسەی بە «ئەمریکاییکردنی جیهان». دۆگمایەکی دیکە بریتییە لە دۆگمای سڕینەوەی جیهناگیری بۆ شووناس و کولتووره ڕەسەنەکان، یان دۆگمای بە کۆکاکۆلابوون و بە ماکدۆناڵدبوونی کولتووره ناوچەییەکان. دۆگمایەکی دیکەی ناو ڕۆشنبیری ئێمە بەرامبەر بە جیهانگیری بریتییە لە نیشاندانی جیهانگیری وەک شەڕێکی ڕەها، یان نیشاندانی وەک خێرێکی ڕەها. بەکورتی ووتاری «جیانهانگری و ئاڵۆزی» هەوڵدانێکی فیکرییە بۆ لێدانی ئەو دۆگما نوێیانەی ڕۆشنبیریی ئێمە لەچەند ساڵی ڕابووردودا لەسەر جیهانگیری بەرهەمیهێناوە. ئەم ووتارە لەڕێگای نیشاندانی ڕەهەندە ئاڵۆز و هەمەلایەنەکانی جیهانگیرییەوە خوازیاری ئەوەیە کە خوێندنەوە و تێگەیشتن لەم دیاردەیە لەو تێزە سادانە ڕزگارکات کە هێمامان بۆ کردن. هەروەها پێ لەسەر ئەو ڕاستییە ئەنترۆپۆلۆژیە دادەگرێت کە ئینسان بوونەوەرێکی هێرمۆنۆتیکییە، بۆیە هەر بەرهەم و دید و پێدراوێکی کولتووری بچێتە بەردەمی و ببێت بە بەشێک لەو ژینگەیەی تێیدا دەژی، سەرلەنوێ پێناسی دەکاتەوە و لە دیدی خۆیەوە مانا و ئەرک و دەلالەتی نوێی پێدەبەخشێت.

لە ووتاری «جیهان لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە» کۆمەڵێک دۆگما ڕەخنەدەکرێن کە بەشێوەیەکی بەربڵاو لە جیهانی سیاسی و ڕۆشنبیریی ئێمەدا ئامادەن. یەکێک لەو دۆگمانە ئەوەیە کە پێیوایە دەکرێت لە جیهانی ئەمڕۆدا وڵاتێک، ناوچەیەک یان کیشوەرێک لە کۆی بەشەکانی تری جیهان داببڕێت. ١١ سێپتێمبەر نیشانیدا کە ناشیرینییەکانی شوێنێک دەشێت کۆی جیهان بەسەریەکەوە ناشیرین بکات. هەروەها لە هەمان ووتاردا دۆگمای ئەو لێکدانەوە کولتوورییانەش ڕەخنەدەکرێت کە پێیوایە ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهاندا ڕوودەدات پێکدادانی کولتوورەکانە و بۆ تێگەیشتن لە مانای دیاردەکان دەبێت بۆ کولتوور بگەڕێینەوە. ئەم ووتارە ئەو دۆگمایەش ڕەخنەدەکات کە پێیوایە بەگژاچوونەوەی تێرۆریزم بەتەنها بە چەک و بەکارهێنانی توندوتیژی ئەنجامئەدرێت بەبێ دەسکاریکردنێکی گرنگی ئەو پەیوەندییانەی کە بەشە جیاوازەکانی جیهان و بەشە جیاوازەکانی ناو یەک کۆمەڵگا بەیەکەوە گرێدەدات.

ووتاری «بنەماکانی ئوسولیەت» تەرخانە بۆ ڕەخنەکردنی ئەو دۆگمایەی کە پێیوایە ئوسولیەت بەتەنها دیاردەیەکی دینییە. ئەم ووتارە نیشانیئەدات کە دەشێت ئایدیۆلۆژییە عەلمانییەکانیش و فیکرێک کە خۆی بە دوژمنی ئوسولیەت بزانێت بەهەمان میکانیزمەکانی بیرکردنەوە و تێڕامانی ئوسولییانە کاربکات. لەپاڵ ئەمەدا ئەم ووتارە دید و دۆگماکانی ئوسولیەت ڕەخنەدەکات بەوەی کە بنەماکانی تێڕوانینی ئوسولییانە بۆ کۆمەڵێک ڕەهەندی گرنگی ژیان و فیکر و هەقیقەت نیشانئەدات.

لە ووتاری «ئایا جوندول ئیسلام کۆمەڵێک ڕێبوار و کۆچبەری ئاینی و ئایدیۆلۆژین؟» ئەو دۆگمایە ڕەخنە دەکرێت کە پەیدابوونی ئەم هێزە تەنها بە بەرهەمی دەستێوەردانی دەرەکی دادەنێت و ڕەگوڕیشە سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتییەکانی ئەم هێزە لە کوردستاندا نەفیدەکات. لەڕاستیدا ئەمڕۆکە ئەم دۆگمایە یەکێکە لە دۆگما سیاسییە هەرە بەهێزەکانی ناو فیکری سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردی. فیکری سیاسی کوردی ناوێرێت و ناتوانێت ڕەگوڕیشە ناوەکییەکانی زۆر دیاردەی ناشیرین لە کوردستاندا دەستنیشانبکات و دان بەوەدا بنێت کە زۆر لەو دیاردانە کاردانەوەن بەڕووی ئەو دۆخە سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتییەی ئەم هێزانە لە دەیەی نەوەدەکاندا دروستیانکردوە. سەرچاوەی ئەم نەفیکردنە بەردەوامە لەو ڕاستییەدا بەرجەستەیە کە توانای خۆ ڕەخنەکردن لەناو هێزە سیاسییە بالادەستەکانی کوردستاندا هێجگار لاوازە و ئەگەر نوزەیەک لە ڕەخنەکردنیش جارجارە لێرە و لەوێ سەرهەڵبدات ڕەخنەیەکی ناڕاست و بێقولایی و ئایدیۆلۆژییە.

لە ووتاری «تەقینەوەکانی هەولێر: چەند سەرنجێک لەسەر ڕەگوڕیشە ئایدیۆلۆژییەکانی توندوتیژی لە کوردستاندا» بە توندی ڕەخنە لەو دۆگما ئایدیۆلۆژییە دەگیردرێت کە پێیوایە دیاردەی بەکارهێنانی توندوتیژی داهێنراوی هێزە ئیسلامییەکانە بەتەنها. ڕاستە گروپە ئیسلامییە توندڕەوەکانی ئەمڕۆکە ناشیرینترین شێوازی توندوتیژی بەکاردەهێنن و تاوانی هێجگار گەورە ئەنجامئەدەن، بەلام بەرز نرخاندنی توندوتیژی دیدێکی فیکری و ئایدیۆلۆژییە کە بەر لە ئیسلامییەکان ئامادەبووە، بەتایبەتی لە بزوتنەوە ناسیۆنالیستی و مارکسییەکاندا. کارل مارکس خۆی یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرز دەنرخێنێت و پێیوایە گۆڕانە گەورەکانی مێژوو بەبێ

بەکارهێنانی توندوتیژی بەرپانابن. ئەم فەیلەسوفە تا ئەو شوێنە دەڕوات کە توندوتیژی وەک «مامانی مێژوو» بناسێنێت.

بە کورتی هەر یەکێک لە ووتارەکانی ئەم کتێبە ڕووی لە تێکشکاندنی هەندێک دۆگمای ڕۆشنبیریی و سیاسی و مەعریفی هاوچەرخی ناو جیهانی ئێمەیە. هەر ئەم ئەرکەشە وایکردوە نووسەرانی لەبابەتی ئێدوارد سەعید و فەیلەسوفێکی وەک نیتشە و چەمکێکی وەک «کۆمەڵگای مەدەنی» و بابەتێکی وەک «ڕیشە ئایدیۆلۆژییەکانی توندوتیژی» هتد... ببنە بابەتی نووسین و بیرکردنەوەی ئەم کتێبە.

ئەگەر ئەم کتێبە بتوانێت بیری خوێنەر بۆلای چەند دۆگما و سادەگۆییەکی دیکەی ناو ڕۆشنبیریی و فیکری سیاسی کوردی ڕابکێشێت و ئەم ڕاکێشانەش ببێتە سەرەتای بیرکردنەوەیەکی نوێ لەلای، ئەوا ئەرک و ویست و پەیامی خۆی بە تەواوی گەیاندووە. گەر ئەم کارەشی پێنەکرا ئەوا ئەوەی لەم مەسەلەیە بەرپرسیارە منم، کە دەشێت نەمتوانیبێت مەبەستەکان بەباشی و بەڕوونی بگەیەنم و بەخوێنەر کۆمەڵێک چەمک و ئامراز و ئەگەری بیرکردنەوە ببەخشم کە یارمەتیدەری بێت لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا.

ئەم وتارانە گەرچی پێشتر لە شوێن وجێی جیاوازدا بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە دوای پێداچوونەوە و دەسکاریکردن و گونجاندنیانە لەگەڵ فۆرم و مەبەستەکانی ئەم کتێبەدا.

ئەمستردام

هاوینی ٢٠٠٤

سەرچاوەکان:

René Gude. Vermogensbeheer en denkeconomie.

De Groene Amsterdammer | 31 januari 2004

# جیهانگیری و ماناکانی

### ١. سەرەتا

خەونی جیهانگیرییانە بەردەوام بەشێک بووە لە ئارەزو و خەون و ترسەکانی مرۆڤ. ئینسان هەمیشە لەو خەیاڵەدا بووە کە جیهان لە جوگرافییایەکی «فرە شوێنەوە» بگۆڕێت بۆ جوگرافیایەکی «یەک شوێن»، دوورییەکان بسڕێتەوە، بەشە جیاوازەکانی زەوی بداتە دەم یەک، گەردون بکاتە ماڵی خۆی، زەوی بکات بە ڕایەخ و ئاسمان بە لێفەی سەرسەری. بەم مانایە جیهانگیری هەمیشە بەشێک بووە لە خەیاڵی ئینسان بۆ سڕینەوەی سنووره جوگرافی و سیاسی و ئابوری و کولتووری و ویژدانییەکان، بەشێک بووە لە خولیایەکی ئینسانی کە ویستوویەتی جیهان بکات بە ماڵێکی گەورە و ئینسان لەو ماڵەشدا بە بوونەوەرێکی جیهانی.
لە ئایینە تاکخوداییەکانەوە بۆ ئیمپراتۆریەتە گەورەکانی مێژوو، لە خەونی شاعیران و فەیلەسوفان و هونەرمەندانەوە بۆ خەونی سوڵتان و خەلیفە و جەنەراڵە کۆلۆنیالیستەکان، لە حیکمەتی شارستانیەتە کۆنەکانەوە بۆ بەندەکانی بەیاننامەی مافی مرۆڤ، خەونی بەجیهانیبوون مەنزڵ بە مەنزڵ و قۆناغ بە قۆناغ و سەردەم بە سەردەم هاتووە و ڕەنگ و ڕووی جیاواز و فرەچەشنی گرتۆتەخۆی. دەکرێت بڵێین تەمەنی خەونی جیهانگیریی بەئەندازەی تەمەنی ئینسان خۆیەتی.

بێگومان خەونی بەجیهانیبوون هەمیشە خەونێکی ئەرخەوانی نەبووە، خەونێک نەبووە دوور لە ترس و دڵەڕاوکێ و گومان. لەڕاستیدا خەونی گەورەبوونی جیهان هەمیشە هاوشانبووە بە ترس لەم گەورەبوونەی جیهان، لەوکاتەدا کە ئینسان خەونی ئەوەی بینیوە کە سنوورەکان بسڕێتەوە و جیهان بکاتە نیشتیمانێکی گەورە، لەهەمانکاتدا ترسی ڕەوانەوەی سنوورەکان و لەدەستدانی ماڵە بچووکەکانی خۆی لادروستبووە. ئینسان چەند بوونەوەرێکە دەخوازێت جیهان وەک گشتێک بکاتە شوێنی ئامادەگی و زیندەگی و خەونەکانی، ئەوەندەش لە گەورەیی و بێکۆتایی و مەترسییەکانی ئەو جیهانەش دەترسێت.

لە جیهانی کۆندا خەونی کردنی جیهان بە یەک شوێن هاوسێ بووە بە ئەگەری ئامادەبوونی کۆمەڵێک نەهامەتی و ترس و کارەساتی هێجگار گەورە کە هەریەکێکیان کارەکتەرێکی جیهانیی هەبووە و لە شوێن و کۆمەڵگا و ناوچەیەکی

تایبەتدا سنووربەندنەبوون. نەخۆشییە کۆنەکانی وەک تاعون و کۆلێرا، پەلامارە گەورەکانی سروشت لە فۆرمی ڕەشەبا و گێژەلوکە و لافاوی وێرانکاردا، بوومەلەرزە و قات و قڕییە ناوەختەکان، هەموویان کاراکتەرێکی جیهانییان هەبووە و بێ بەربەست لەم بەشی جیهانەوە بۆ ئەو بەشی جیهان ڕۆیشتوون و ئەوەی قابیلی وێرانکردنبێت، وێرانیان کردوە و لەدوای خۆشیانەوە ترسێکی بێسنووریان لە ڕۆحی ئینساندا بەجێهێشتوە. ڕەنگە ڕیشە قووڵەکانی هەندێک فۆرمی تایبەتی ترسی هاوچەرخ لە جیهانگیری لەم ترسە دێرینەیەدابێت لە بەجیهانیبوونی کارەساتەکاندا، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییە نەناسراوانەدا کە دەشێت لەودیوی سنوورەکانەوە بێن و خۆیان بە ناو زادگا و ماڵ و شوێنە تایبەتەکانماندا بکەن.

بە مانایەکی تر هەمیشە لەپاڵ خەون و خولیا و ئارەزوی مرۆڤدا بۆ کۆکردنەوەی جیهان لە ماڵێکدا، ترس لە هێرشی هەمان جیهان بۆ ناو ئەو ماڵە لە ئارادابووە، لەپاڵ ئارەزووی بە هاوڵاتیبوونی جیهانیدا ترس لە کێشە و گرفت و نەهامەتییەکانی تێکەڵاوبوون بە نەناس و نەزانراو ئامادەبووە. شانبەشانی پێکەوەبوون و خەونی سەرتاسەری و جیهاننیشتیمانی، ترس لە نەمانی سنوور، ترس لە کەوتنە ناو پانتایی بێسەرەتا و بێکۆتایی و بێمەودا، ترس لە نەناسراو، ترس لە لەدەستدانی دڵنیاییە سادەکان هەمیشە بەشێک لە ڕۆح و وێناکردنەکانی مرۆڤ بووە. ئینسان یەکێکە لەو بوونەوەرانەی نە بێماڵ و نە بێجیهان دەتوانێت بژی، لەپاڵ خەونی هەبوونی ماڵێکدا خەونی هەبوونی جیهانی هەیە و لەپاڵ بەجیهانیبووندا هەمیشە سەرقاڵی جیاکردنەوەی ماڵی خۆیەتی لەدەوروبەری، بەرامبەر بە هێزی پێکەوەگرێدان، هێزی دابڕان و بەرامبەر بە خەونی پێکەوەبوون، مەیلی جیابوونەوە و بەرامبەر بە ئارەزوی لەویدیچوون ویستی لەویدینەچوون لەئارادابووە و لەئارادیە.

لەمرۆکەشدا ئەم دوو مەیلە مێژووییە بە شێوەی جیاجیا هەم لەنێوان کەسەکاندا لەگەڵ یەکدا و هەم لەنێو یەک کەسیشدا بەتەنها، ئامادەیە. حەزکردن لە بینینی جیهان و ترس لە هەمان جیهان پێکەوە و لە فۆرمی جیاجیادا ئامادەن. هێزی گرنگ و چالاک هەن کە ڕوویان لە جیهانگیرییە و بەدوای کرانەوەی زیاتری سنووری ماڵەکانی خۆیان و سنووری جیهاندا دەگەڕێن، هێزی دیش هەن لەڕێی بنیادنانی دیواری سیاسی و کولتووریی و

ڕەمزیی ئەستوورەوە خۆیان لە جیهان و دەوروبەریان دادەبڕن. هێز هەیە لە قۆناغێکدا کراوە و لە قۆناغێکدا داخراوە، گروپ هەیە نیوەی ڕوو لەجیهان و نیوەکەی دی پشت لە جیهان، ئایدیۆلۆژیا هەیە لە ساتێکدا جیهان شوێنی پراکتیککردنی بووە، دواتر کشاوەتەوە بۆناو سنوورەکانی دەوڵەت یان نیشتیمانێکی دیاریکراو.

ئەوەی گرنگە ئاگاداریبین تێکەڵنەکردنی «خەیاڵی جیهانگیریی»ە بە «واقیعی جیهانگیریی». یەکەمیان دیاردەیەکی کۆن و دێرینە و بەشێکە لە پێکهاتی خەیاڵی ئینسان، دووهەمیان واقیعێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری نوێ و هاوچەرخە. ئینسانی قۆناغە دێرینەکان خەیاڵی جیهانگیرییانەی هەبووە و ویستویەتی ببێتە هاووڵاتییەکی جیهانی و بیری لە نەهێشتن و سڕینەوەی سنوورەکان کردۆتەوە، ئاینەکان شاهیدی ئەمەن. بەڵام ئەم ئینسانە لە واقیعێکی «نا ـ جیهانگیریدا» ژیاوە. ڕاستە ئەم ئینسانە ویستویەتی جیهانی وەک «تاقە شوێنێک» هەبێت، بەڵام کەرەستەکانی کردنی جیهانی بە «تاقە شوێنێک» لەبەردەستدا نەبووە؛ خولیای جیهانگیرییانەی هەبووە، بەڵام جیهانگیری بەشێک نەبووە لە کاراکتەری ئەو جیهانەی ئەو خولیایەی تێدا بەرهەمهاتووە، ویستویەتی سنوورەکان بسڕێتەوە بەڵام ئامرازە تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەم سڕینەوەیەی لەبەردەستدا نەبووە. ئەم نەبوونیانە وایانکردوە جیهانگیری لە قۆناغەکانی پێشوتری مێژووی مرۆڤایەتیدا تەنها ئەگەرێکی فیکری و ڕۆحی و خەیاڵی بوویێت، نەک ئەگەرێکی مێژوویی. لە فۆرمی ترس و حەز و ئارەزودا بەرجەستەبوویێت نەک لە فۆرمی دەزگا و هێز و تەکنیک وپرۆسەی بە جیهانیبوون خۆیدا. بەمانایەکی دیکە لە جیهانی کۆندا میکانیزمی دابەزینی خەونی جیهانگیرییانە بۆ ناو واقیع و مێژوو و جوگرافیا جیاوازەکان لە ئارادانەبووە، گەرچی خەونەکان خۆیان هەبوون، خەونی جیهانگیری هەبووە بەڵام واقیعی جیهانگیریانە لەئارادانەبووە.

دوو کۆسپی سەرەکی لەبەردەم پیادەکردنی خەونی جیهانگیرییانەی ئینسانەکانی بەر لەمڕۆدا هەبووە. یەکەمیان نەبوونی هێزێک، یان چەند هێزێکی کۆمەڵایەتییە کە ویستبێتیان و توانیبێتیان پیادەکردنی ئەم کارە لە جیهاندا بگرنەئەستۆ. واتە نەبوونی کۆمەڵێک هێزی جیهانیی کە توانای پیادەکردنی خەونی جیهانگیرییان هەبێت.

دووهەمیان لەئارادانەبوونی توانا و تەکنیک و تەکنۆلۆژیای پەیوەندیکردنە کە توانیبێتی بەشە جیاوازەکانی جیهان بەیەکەوە گرێبدات و سنوور و دووری و مەسافەکان بسڕێتەوە.

ئەوەی جیهانی ئەمڕۆمان لە جیهانی بەر لە ئێستا جیادەکاتەوە ئامادەگی ئەم دوو مەرجەیە. جیهانی ئەمڕۆ هەم گەشەیەکی تەکنۆلۆژیی بێوێنەی کردوە کە توانای گرێدانی قوژبن و بەشە جیاوازەکانی جیهانی بەیەکەوە هەیە، هەم چەندان هێزی کۆمەڵایەتیشی بەرهەمهێناوە کە خوازیاری بەرەوپێشەوەبردن و پیادەکردنی پرۆسە ئاڵۆز و جیاوازەکانی جیهانگیرین.

با لەو هێزە کۆمەڵایەتییانە بدوێین کە جیهانگیریان مەیسەرکردوە و وەک چوارچێوەیەکی هاوبەش بۆ جیهانی ئەمڕۆمان چالاکانە کاری تێدادەکەن. لەسەرەتاوە دەبێت ئەو ڕاستییە ئاشکرابکەین کە ئەو هێزانەی لە جیهانگیرییەوە ئالاون هێزی جیاجیان، هەندێکیان دۆستی یەکدین و هەندێکیان دوژمنی سەرسەختی یەکتری، هەنێکیان هاریکار و هاوکارن ئەوانیدیان ناکۆک و دژ بەیەک، هێزیان هەیە ئابوورییە و هەیانە سیاسی و هەیانە کولتووری و هەشە سەربازی. یەکێکیان ئینساندۆست و ژینگەدۆست، ئەویدیان دژ بە ژینگە و دژ بە ئینسان، تێیاندایە لۆکاڵی و هەشیانە گلۆباڵی، هەندێکیان خاوەن بانک و کۆمپانیا و سەرمایەی گەورەن، هەندێکی دیکەین نووسەران و هونەرمەندان و وەرزشەوانانن، بەشێکیان مۆسیقاژەن و شانۆکار و سینەماین، ئەوانی دییان گروهی منداڵان و ئافرەتان و گەنجانن، هەندێک سیاسەتمەدار و هەندێک پارەدار و هەندێک گروهی ئایینین، هەم قاچاخچی و هەم تیرۆریست و هەم بازرگان و هەم ئەکتیڤیستی مافەکانی مرۆڤ لەم پرۆسەیەدا بەشدارن، میلەتانی خاوەن دەوڵەت و میلەتانی بێدەوڵەت، ناتۆ و ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ئەمریکا و ڕێکخراوی ئەل قاعیدە، بوش و ئوسامە بن لادن، لیبرالیزم و فەندەمێنتالیزم بەشێکن لەم هێزانە. ئەمە سەرەڕای ئامادەیی دەیان و سەدان گروه و هێزی کۆمەڵایەتی حکومی و ناحکومی، دەزگای نەتەوەیی و بان نەتەوەیی دیکەش کە هەریەکێکیان بەشێوەی تایبەت لە جیهانگیری و پرۆسەی بچووککردنەوەی جیهانەوە ئالاون.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی بۆبکەین ئەو ڕاستییەیە کە هەریەکێک لەم هێزانە بۆ مەبەست و ئامانج و ستراتیژی جیاواز دەستبەکارن، هەندێکیان تەواو

دژ بەویدیکەیان و هەندێکیان دۆست و لایەنگری ئەویدین، بەڵام بەسەریەکەوە مێژوویەکی جیهانی ئاڵۆز و هەمەلایەن و فرەڕەهەند بەرهەمدەهێنن کە زەحمەتە تێیدا لۆکاڵ لە گلۆباڵ، ئێرە لە ئەوێ، من لە ئەویدی و ناوەوە لە دەرەوە جیابکرێتەوە. ئەم ئاڵۆزییە وایکردوە تیوریستێکی گرنگی جیهانگیری ئەم پرۆسەیە ناوبنێت «گلۆکالیزەیشن»، کە تێکەڵکردنی گلۆبالیزەیشنە بە لۆکالیزەیشن (Robertson 1995: 25). هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە ئەو هێزنانەن کە ئەمرۆکە لەهەناوی جیهانگیریدا ئامادەن و پرۆسە ئاڵۆزەکانی بەڕێوەدەبەن و مانا و ڕەهەند و ستراتیژی جیاوازی پێدەبەخشن.

لەڕووی تەکنیکیشەوە تەکنۆلۆژیای پەیوەندیکردن و توانای بەرفراوانی کۆچ و گواستنەوە و ئاڵوگۆڕ لەمڕۆدا لەو پەڕی گەشەکردن و تازەبوونەوە و پێشکەوتندان. ئەمڕۆ تۆڕێکی جیهانی پەیوەندیکردن بەشە جیاوازەکانی جیهانی بەیەکەوە گرێداوە . ئەوەی چارەکەسەدەیەک لەمەوبەر وەک فانتازیا دەردەکەوت ئێستا بۆتە واقیعێکی تەکنۆلۆژی و ئەوەی ئەمڕۆ لە مەحاڵ ئەچێت سبەینێ لەشێوەی ئامێر و ماشێندا لە بازاڕەکاندا ئامادەیە. ئەگەر حیکایەتی گۆڕانی «خەیاڵی تەکنیکی» بۆ «واقیعێکی تەکنیکی» بە دروستکردنی تەلەگراف و داهێنانی تەلەفۆن و بەرهەمهێنانی ڕادیۆ دەستی پێکردبێت، ئەمڕۆکە واقیعی تەکنۆلۆژی ئەو سنوورانەی تێپەڕاندوە و لە فۆرمی فاکس و تەلەفیزۆن و ساتالایت و کۆمپیوتەر و مانگی دەستکرد و ئینتەرنێتدا ئامادەیە. بەشێکی گرنگی ئەم تەکنیکە نوێیانەش هێشتاکو لە بێشکەدان و قۆناغە هەرە سەرەتاییەکانی ئامادەبوونیان لەئارادایە. لەڕاستیدا جیهان لەم ئاستەدا گۆڕانی ڕیشەیی و قووڵ و هەمەلایەنی بەسەردا هاتووە. جیهانی داهێنانی پەیوەندی کۆمپیوتەریی زۆر جیاوازە لە جیهانی دۆزینەوەی هێزی هەڵم و تەلەگراف و شەمەدەفەر. ئەمڕۆ ئاسمانی جیهان بە تۆڕێکی بەرفراوانی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی ئەلەکترۆنی داپۆشراوە، لە چەند ئاستێکدا ئەم سەری جیهان بەو سەری جیهانەوە گرێدراوە و لەزۆر ڕووەوە گۆی زەوی بۆتە «تاقە شوێنێک» کە هەمووان پێکەوە لەناو ئاڵۆزییەکانیدا دەژین. ئەو سنوورانەی لە قۆناغی هەڵم و تەلگراف و شەمەندەفەردا نەدەبڕان ئەمڕۆکە بە ئاسانی دەبڕێن و ئینسان و وێنە و سەرمایە و فیکر و شتەکانی دیکە ئاودیو دەبن.

دوای ئەم کورتە سەرنجانە دەکرێت جیهانگیری وەک هەلومەرجی ئەمڕۆکەی جیهان پێناسەبکەین، واتە جیهانگیری بریتییە لەو دۆخە ئێستاییەی لەمڕۆدا

جیـهـانی تێـیکەوتووە، دۆخـێک کـە تیایدا بەشـە جیـاوازەکـانی جیـهـان لە هـەلومـــەرجـــێکی چڕ و بەهێـــز و هـەمـــەلایـەنـی توانـای پـەیوەندیکردن و پێکەوەبوونـدان. جیـهـانگیری جیـهـانە لە دۆخی سـەفـەر و گـواسـتنەوە و کۆچ و بەناویەکداچوونی ئینسان و ئابووری و کولتوور و یاسا ونۆرم و بەها و کێشە و گرفت و مەترسییەکاندا بەیەکدی، بریتییە لەو پرۆسە تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەی کە مانایەک بۆ دووری ناهێڵێتەوە و شتەکان بە جوڵەیەکی خێرا لەیەکدی نزیکدەکاتەوە. هەموو ئەمانەش بەسەریەکەوە کاریگەریی گەورە لەسەر ژیانی سـیـاسـی و ئابووری و کـولتـووری و ئەخـلاقی کـۆمـەڵگا جیـاجیـاکـان بەجێدەهێڵێن. لە پەیوەندیشیدا بە مێژووەوە جیـهانگیری مێژووە جیاجیاکان لەیەکدی نزیکدەخاتەوە، بەیەکدییانەوە گرێدەدات، بەیەکدیان تێکەڵدەکات بەڵام نایانکات بە مـێژوویـیـەکی جـیـهـانی و گـەردوونی یـەکگرتوو. بەمـانـایەکی دیکە جیهانگیری مانای دروستبوونی مێژوویەکی هاوشێوە و لێکچوو نییە بۆ هەموو جیهان، مانای ئەوە نییە هەموان لەهەمانکاتدا هەمان کێشە و هەمان باس و خـواس و هـەمـان گرفت و چاوەڕوانـی و هـەمـان لێکدانـەوە و وێناکردنیـان هـەیە، بـەڵام نـاشکرێت کـــۆی ئەم شـــتـــانـە بەدابڕاوی لەیەکـــدی و لە سـنـووری ناوچەداخراوەکاندا قەتیسکەین و ڕەهەندە جیهانییەکەی زۆر لەو شتانە نەبینین. لۆکاڵەکانی جیهان مێژووی جیاواز دەژین بەڵام ئەم مـێژووانە لە پەیوەندییەکی ئاڵۆز و فرەلایەندان بە یەکدییەوە.

بێئەوەی سـروشـتێکی ئەفسانەیی بە جیـهـانگیری بدەین، دەتوانین بڵـێین جیـهـانی ئەمـڕۆ زۆر جیـاوازە لەو جیـهـانەی چارەکـە سـەدەیەک لەمـەوبەر لە ئارادابوو، ئەم جیاوازییە تەنها لە ئامادەگی ئەو توانا گەورەیەی پەیوەندیکردن و جوڵە و گـەشـەکردنی تەکنۆلۆژیادا بەرجـەسـتـە نییـە کـە باسـمـانکرد، بەڵکو لە ئاسـتی سیاسـی و ئابووری و کولتـووری و سـەرلەنوێ داڕشـتنەوەی نەخـشـەی جیۆپۆلیتیکی جیـهـانیـشـدا تەواو بەرجسـتە و ئامـادەیە. بەبۆچوونی من دەکرێت گـرنگـتـرین جـیـاوازییـەکـانی ئەم جـیـهـانـە تازەیە کـە جـیـهـانگیـری ڕۆژانە دروستیدەکات و دروستیکردوە، لەگەڵ جیهانی چارەکەسەدەیەک لەمەوبەردا، لەم چەند خاڵەدا کۆکەینەوە:

١ـ جیهانی ئێستا جوگرافیایەکی «یەک جیهانییە». ئەم گریمانکردن و وێناکردنەی جیهان وەک گشتێکی یەکگرتوو، وەک گریمان و وێناکردنێکی سادە و ناڕاست و ئایدیۆلۆژی نییە، شتێک نییە لە واقیعدا ڕەگ و بنەما و بناغەی نەبێت و خەیاڵی ئەم ڕۆشنبیر یان ئەو ئایدیۆلۆژیست دروستیکردبێت. بەپێچەوانەوە «یەک جیهانی» شوناسی ئەمڕۆکەی ئەم ئەستێرەیەیە کە تۆڕێک پەیوەندی ئابووری و سیاسی و کولتووری، ئەم سەری بەو سەرییەوە و ئەم سوچ و قوژبنی بەو سوچ و قوژبنییەوە گرێدەدات. بەڵام وەک لە پەرەگرافی پێشوودا باسمانکرد ئەم «یەک جیهانییە» مانای «یەک مێژوویی» ناگەیەنێت.

٢ـ یەکێک لە دەرکەوتە گرنگەکانی ئەم «یەک جیهانیە» بریتییە لە ڕاوەستانی جیهانی ئەمڕۆ لەبەردەم کۆمەڵێک کێشە و مەترسی و تەحەدای ترسناکدا کە چارەسەرکردنیان بە هیچ جۆرێک لە ئاستی دەوڵەتێک یان چەند دەوڵەتێکدا مەیسەر نابێت و هەر هەوڵێکی ڕاستەقینەی بەرەنگاربوونەوەشیان پێویستی بە کۆمەکێکی جیهانی سەرتاسەری هەیە. پیسبوونی ژینگە (لە کونبوونی توێژی ئۆزۆنەوە بیگرە بۆ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی)، کێشەی هەژاری، تاوانی نێودەوڵەتی، کێشەی زیادبوونی بێئەندازەی ژمارەی دانیشتوان، کێشەی شوێن و جێی ئافرەت، مەسەلەی تیرۆر، مەسەلەی پێشێلکردن و پەیڕەکوردنی مافەکانی مرۆڤ هتد... نموونەی هەندێک لەو کێشانەن کە دەبێت لە ئاستی جیهانیدا چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە، نەک بەتەناهـ و لە سنووری ئەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەتدا، ئام یان ئەو کۆمەڵگادا. هەندێک نووسەر هەن تا ئەو شوێنە پێدادەگرن و دەڵێن چارەنووسی سیستمی دیموکراسی خۆشی وابەستەی ئەوەیە تاچەند ئەم سیستمە لە ئاستی دەوڵەتەوە بۆ ئاستی جیهانی دەگوێزرێتەوە و سیستمێکی نێودەوڵەتی دیموکرات دێتەکایەوە کە تێیدا لانیکەمی دادپەروەری جیهانییانە ئامادەبێت.

٣ـ دەرکەوتێکی دیکەی «یەک جیهانی» لەوەدایە کە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی ڕوودان و هاتنەکایەی زۆر دیاردەی سیاسی و ئابوری و کولتووری چیدی جوگرافیای داخراوی سنوورەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی نییە، ئەو بڕیارانەی کە ئەدرێن تەنها لە ژێر کاریگەریی هۆکارە ناوەکییەکانی ناو دەوڵەتی نەتەوەییدا نین، هەندێک ئۆرگان و دەزگا و دامەزراوی «بان ـ نەتەوەیی» لە ئارادان کە کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگا جیاجیاکان، گەر لە دەزگانی دەوڵەتی نەتەوەیی

گەورەتر نەبێت، کەمتر نییە، ڕەنگە دەزگاکانی ئەوروپای یەکگرتوو لەم ڕووەوە بەرچاوترین نموونەیەک بن کە هێزی دەزگا و دامەزراوە بان نەتەوەییەکانمان نیشاندەن.

٤ـ هەندێک کۆمەڵناس و زانای کۆمەڵایەتی ئەو خاڵەی سەرەوە ڕادیکاڵتر دەکەنەوە و دەڵێن بۆ تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی زۆر دیاردەی هاوچەرخی ناو کۆمەڵگا و دەوڵەتە نەتەوەییەکان ناتوانین چیدی لە چەمکی «کۆمەڵگا» وە دەستپێبکەین، یان بۆ تێگەیشتن لە ژیانی کۆمەڵایەتی پێویستمان بە چەمکی کۆمەڵگا نییە(Featherstone &Lash 1995: 2) لە سەردەمانی جیهانگیریدا چەمکی کۆمەڵگا چیدی یەکەی سەرەکی شیکردنەوە و ڕاڤەکردن نییە، چیدی ئەو چوارچێوەیەی کە دیاردەکانی تێدا نیشتەجێن چواچێوەی ئەم یان ئەو کۆمەڵگا نین بە تەنها، بەڵکو ئەو چوارچێوە جیهانی و گلۆبالیەیە کە بەشێکی گرنگی پێدراوەکانی دەکەونە دەرەوەی هەر کۆمەڵگایەکەوە بەتەنها. بۆ نموونە گەر بمانەوێت لە دیاردەی «ئیسلامی سیاسی» لە کوردستاندا بگەین چیدی ئەوە بەس نییە بەتەناھ تەماشای کۆمەڵگای کوردی بکەین، بەڵکو دەبێت لەو ڕەوتە گلۆبالی و جیهانییەش ڕامێنین کە لەدەرەوەی کۆمەڵگای کوردیدا ئامادەیە، پەیوەندی نێوان هەندێک هێزی ئیسلامی لە کوردستاندا لەگەڵ ڕێکخراوی ئەل قاعیدە و هاریکاریکردنی مادی هەندێک هێزی تری ئیسلامی سیاسی کوردستان لەلایەن هەندێک ئۆرگانی بان نەتەوەیی ئیسلامی جیهانییەوە دەربڕی ئەم ڕاستییەن. ئەمە جگە لەوەی خودی کۆمەڵگای کوردی ئەمڕۆکە بەشێکی لە هەولێرە و بەشەکەی دی لە بەرلین، پێیەکی لە سلێمانییە و پێکەی دیکەی لە ستۆکهۆڵم، گروهێکی لە شاخەکانی هەورامانە و گروهێکی دیکەی لە نەرویج.

٥ـ هەموومان ئەزانین بەر لە ڕووخانی دیواری بەرلین جیهانی هاوچەرخ یەک جیهان نەبوو. تا کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم ئەم ئەستێرەیەی ئێمە لە «سێ جیهان» پێکهاتبوو: جیهانی سەرمایەداری، جیهانی سۆسیالیستی و جیهانی سێ. ئەمڕۆ ئەم دابەشبوونەی جیهان کۆتاییپێهاتوە و هەمووان سەرتاپا لە جیهانێکی سەرمایەداریی بەرفراواندا دەژین (هەندێک حەز بە ووشەی سەرمایەداری ناکەن و دەڵێن لە جیهانی مۆدێرنەدا دەژین). بەڵام کاتێک وشەی سەرمایەداری دەبیستین، دەبێت مانا و دەلالەتەکانی نەبەستینەوە بەو مانا و دەلالەتانەوە کە مارکسیزمی تەقلیدی بە چەمکی سەرمایەداری

دەبەخشێت. سەرمایەداری لە جیهانی ئەمڕۆدا پرۆژەیەکی مێژوویی ئاڵۆز و فرەلایەن و فرەئەگەرە، یەکێک لە گرنگترین بەرجەستەبوونە مێژووییەکانی مۆدێرنەیە، تێکەڵێکی ئاڵۆزە لە مژدە و نائومێدی، پێشکەوتن و دواکەوتن، دیموکراتیەت و فاشیەت، زۆنی پێشکەوتو و زۆنی دواکەوتو. چەند سیستمێکی ئابوورییە ئەوەندەش سیستمێکی سیاسی و ئیداری و یاسایی و کولتوورییە، چەند لەشێوەی سەرمایەی مادیدا بەرجەستەیە، ئەوەندەش لە شێوازی ڕەمزییانەی سەرمایەدا ئامادەیە. کە قسە لەسەر جیهانی ئەمڕۆ دەکەین قسە لەم جیهانە سەرمایەدارییە ئاڵۆز و فرەڕەهەند و گەورەیە دەکەین کە جیهانێکە پڕە لە ئەگەر و بەڵێن و مژدە و مەترسی و کارەسات لەیەککاتدا.

هەموو ئەو پێرداوانەی سەرەوە نیشانیئەدەن کە جیهانی ئەمڕۆ و پرۆسەکانی جیهانگیری لەناویدا وەک چوارچێوەی مێژوویی ڕووداوەکان، پێکهاتێکی هێجگار ئاڵۆزە، نەک ناکرێت خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی هەموو ڕەهەندەکانی لە چوارچێوەی یەک تیورەدا کۆبکەینەوە و نەک ناتوانین بە بەرهەمی ئەم یان ئەو کۆمەڵگای بزانین بە تەنها، بەڵکو لە هەر بەرخورد و ڕاڤە و لێکدانەوەیەکمدا دەبێت لەو ڕاستییە سادەیەوە دەستپێبکەین کە ناکرێت ڕەهەندە جیاواز و ناکۆک و ئاڵۆزەکانی ئەم دیاردەیە بۆ چەند حوکمێکی سیاسی و ئەخلاقی سادە کورتبکەینەوە. نابێت ئاڵۆزی و فرەڕەهەندی ئەم دیاردەیە وەک ئەمڕۆ هەندێک ئاینگەرا و ناسیۆنالیست و کۆنەچەپ دەیکەن کورتکەینەوە بۆ قسەگوتن بە ئەمریکا و ڕۆژئاوا.

### ٢- تیوریزەکردنی جیهانگیری

ڕەنگە مارکس یەکەمین کەس بوویێت بەشێوەیەکی بەرفراوان جیهانگیری تیۆریزە کردبێت. ئەم فەیلەسوف و ئابووریناسە گەورەیەی سەدەی نۆزدهەم، لەگەڵ فریدریک ئەنجلسدا، لە (مانیفێستی کۆمۆنیستدا) باس لە توانا و ویست و تەماحی بێئەندازەی سەرمایە دەکات بۆ بەجیهانیبوون، ئەو میکانیزمانە نیشانئەدات کە پاڵ بە سەرمایەوە دەنێت سنوورەکانی دەوڵەت، ڕێگرەکانی بازاڕی نەتەوەیی، ماناکانی نیشتیمان و کولتوور و بەهای ناوچەیی تێپەڕێنێ و هەموو جهیان وەک بازاڕێکی یەکگرتوو وێناکات. لەسەدەی نۆزدەهەمەوە مارکس بەو دەرەنجامە گەیشتوە کە سەرمایە سنوور ناناسێت، هەر کە لە

گیرفانی سەرمایەداران چووە دەرەوە دەشێت هەموو جیهان بکاتە نیشتیمانی خۆی. ئەم دیدەی مارکس بۆ خەیاڵ و ویست و عەقڵی سەرمایە دیدێکە ڕاستەقینە و یەکێکە لە پێشبینییە هەرە زیرەکەکانی ئەم فەیلەسوفە گرنگەی سەدەی نۆزدەهەم. بەڵام ئەوەی لەم دیدەدا هەڵەیە و هەڵەیەکی گەورەش، بەستنەوەی ئەم کاراکتەرە بان نەتەوەیی و جیهانییەی سەرمایەیە بە کۆمەڵێک دەرەنجامی «حەتمی» نادروستەوە، لەوانە: یەکگرتنی کرێکارانی جیهان لە پرۆژەی بنیادنانی کۆمۆنیزمدا، نەمانی دەوڵەت، نەمانی ملکیەتی تایبەت، نەمانی چین، حەتمیەتی بەرەوپێشەوچوونی بەردەوامی مێژوو لەسەر هێڵێکی ڕاست. ئەمە سەرەڕای کردنی ئابووری بە تاقە هۆکارێک بۆ لێکدانەوەی دیاردەکان هتد... دوو سەدەیە مێژووی مرۆڤایەتی کۆی ئەم پێشبینیانە یەک بە یەک بە درۆ دەخاتەوە. ئەمڕۆ بڵاوبوونەوەی سەرمایەداری بە جیهاندا سیستمەکەی بەهێزتر کردوە لاوازی نەکردوە، بە کرێکارانی جیهان نیشتیمانی نەتەوەیی بەخشیوە بێنیشتیمانی نەکردون، چەندان هێزی نوێی دروستکردوە کە ڕۆڵی شۆڕشگێڕ و گۆڕەریان لە پرۆلیتاریا سەندۆتەوە، لەزۆر شوێندا سەرمایەداری سروشتێکی یاسایی و کۆمەڵایەتی و ئینساندۆستی گرتۆتەخۆی و سروشتی نایاسایی و بەربەریانەی لەدەستداوە، دەوڵەتی سەرمایەداریانە لەباتی یاسا بێڕەحمەکانی بازاڕ، یان لە پاڵ ئەو یاسایانەدا، خەریکی دەستێوەردانێکی یاساییە کە زۆرجار سنوورێک بۆ خراپەکارییەکانی سەرمایە دائەنێت. هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە نەک نەبوونەتە هۆکاری ڕوخاندن و لەناوچوونی سەرمایەداری، نەک سیستمەکەیان لاوازنەکردوە، نەک بە تارمایی کۆمۆنیزم گەمارۆنەدراوە، بەڵکو بوونەتە هۆکاری کرانەوەی ئاسۆی نوێ لەبەردەمیدا.

خاڵێکی لاوازی دیکەی لێکدانەوەی تیۆریيانەی مارکسیزم بۆ جیهانگیری سنوربەندیکردنیەتی لە کایەی ئابووری و لێکدانەوەی ئابووریدا، واتە بینینی جیهانگیرییە وەک دیاردەیەکی ئابووری و بەستنەوەشی بە تەنها بە ویست و تەماحەکانی سەرمایەوە. لەکاتێکدا جیهانگیری ڕەهەندی تەکنۆلۆژی و کولتووری و ڕەمزی و سیاسیشی هەیە کە بەهیچ مانایەک ڕەنگدانەوەی ماهیەتێکی ئابووری نین و لە هەندێک دۆخیشدا ڕۆڵیان لە بەرپاکردنی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریدا زۆر لە ڕۆڵی ئابووری گەورەترە. لێرەوە، کە دەستەواژەی سەرمایەداری بەکاردەهێنین و دەڵێین جیهانگیری

بریتییە لە بوونی جیهان بە سیستمێکی سەرمایەداری گەورە، قسە لە سیستمێک دەکەین کە چەند سەدەیەک مێژووی پڕ گۆڕان وهەڵبەزودابەز و هەمەلایەنی هەیە، کۆمەڵێک کاراکتەری گرنگی پەیداکردوە کە دەشێت زۆر بە گشتی بە سیستمی «ئابوری بازاڕی ئازاد» و «لیبرالیزمی سیاسی» و «لیبرالیزمی کۆمەلایەتی» و «لیبرالیزمی کولتووری» ناونووسیانکەین. هەریەکێکیش لەم ڕەهەندانە کایەی تایبەتی گەشە و گۆڕان و قەیرانی خۆی هەیە. سەرمایەداری، یان لانیکەم ئەو سەرمایەدارییەی بیەوێت ببێتە بەشێکی زیندوی پرۆسەی جیهانگیری و بتوانێت بەشداربێت لە بەرپاکردنی گەشەیەکی گشتی و ئینسانیدا، ناتوانێت ئەمرۆکە هەمان سەرمایەداری سەردەمانی مارکس و بەر لە مارکس بێت، سەرمایەدارییەک بێت لەسەر چەوساندنەوەیەکی بێسنوور و قووڵ و دڕندانەی ئینسان دامەزرابێت. (وەک ووتمان هەندێک نووسەر بۆ پێناسەکردنی جیهانگیری دەستەواژەی سەرمایەداری و دەستەواژەی کۆمەڵگای پیشەسازی و هەندێکی دیکە دەستەواژەی مۆدێرنە بەکاردەهێنن، واتە ئەوە ئەمرۆ بەجیهانی دەبێت مۆدێرنەیە، یان کۆمەڵگای پیشەسازییە)

بێگومان سەرمایەدارییەک دەرەقەتی پرۆسەکانی جیهانگیربێت و خۆشی بەشێکی چالاکی ئەو پرۆسانەبێت سەرمایەدارییەکە، تا ڕادەیەکی دیاریکراو، ناچارکراوە ڕووکارێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و یاسایی کراوەی هەبێت، قابیلی ڕێکخستن و پێداچوونەوە و گۆڕانبێت، سیستمی شەڕی گشت دژی گشت نەبێت، سیستمێک نەبێت تێیدا سەرمایە کوێر و نابینا و داماڵراو لە هەر فۆرمێکی بەرپرسیاریەت دەستبەکاربێت. بە مانایەکی دیکە هەموو جۆرەکانی سەرمایەداری «بازاڕی ئازاد» ناتوانن ببن بە بەشێکی زیندو و کاریگەر و بەسود لە پرۆسەی بەجیهانیبووندا، بۆئەوەی بتوانیت لە ئاستی جیهانیدا ئامادەبیت و بەشداربیت لە کۆی ئەو ململانێ ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتورییانەدا کە جیهانگیری دەیانخاتەوە، پێویستت بەو شێوازەی سەرمایەداری هەیە کە بە یاسا و بەها و بەرپرسیارێتی گەمارۆدراوە. سەرمایەدارییەک گەمارۆدراو بە سیستمی باج و دەستێوەردانی دەوڵەت و چاودێریکردنی بەردەوام. (بێگومان ئەم چاودێری و گەمارۆ و دەستێوەردانە هەرگیز سەد دەر سەد و هەمەلایەن نابێت). لەم ڕەوتەدا ئەوەی پێیدەگوترێت

ئابووری «بازاڕی ئازاد» ئابوورییەکە جیاواز لەو بێ سەروبەری وناڕێکی و فەوزا ئابوورییەی لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێ و لای ئێمەش ئامادەیە، ئەوەی لە جیهانی سێدا ناوی ئابووری «بازاڕی ئازادی» لێنراوە، ئابوورییەکە تێیدا «کەرتی گشتی» یان «کەرتی دەوڵەت» هەڕاجکراوە و فرۆشراوە بەو نوخبە سیاسییە مافیاییەی دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوەیە. ئەم نوخبەیە، بۆ نموونە لە شوێنێکی وەکو عێراق یان میسر یان ڕوسیادا، ڕاستەوخۆ دەستیگرتووە بەسەر کەرتی ئابووری دەوڵەتیدا و ئەو کەمە دەستکەوتانەشی لەناوبردوە کە ئابووریی دەوڵەت، لەپاڵ هەموو نەهامەتییەکانیدا، بە خەڵکی دەبەخشی. ئەوەی من لێرەدا دەخوازم بەرگری لێبکەم ئەو ڕاستییەیە کە سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد، دوای چوار تا پێنج سەدە مێژووی ئاڵۆزی پڕ لە گەشەکردن و ڕاپەڕین و ڕەخنەکردن و ڕیفۆرمکردن، چیدی سیستم و بازاڕێکی بێیاسا و بێبەها و بێدەستێوەردان و بێڕێکخستن نییە، وەک «لیبرالیزمی نوێ» بانگێشەی بۆدەکات و دەشخوازێت وەک تاقە شێوازی بەجیهانیبوونی ئابووریش پێشنیاریبکات. بەڵکو بەشێکی گرنگی سەرمایەداری لە فۆرمەکانی ئەمڕۆیدا سیستمێکی یاساییە و بۆ مانەوە و گەشەکردن و پێشکەوتنی پێویستی بە سیستمی خوێندنی مۆدێرن و توانا و سەلیقەی ئازاد و ئاشکرا هەیە، پێویستی بە یاسای کراوە هەیە بۆ ململانێ و کێبەرکێ و پێشکەوتنی ئازاد، پێویستی بە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی کۆمەڵایەتی هەیە، میکانیزمی تایبەتی پێویستە ڕێ لە کۆبوونەوەی دەسەڵات و سامان و بڕیاردان بگرێت لەدەستی نوخبەیەکی بچوک و زۆرجار مافیاییدا، پێویستی بە ئامادەگی سیستمێکی دادپەروەرانەی باج هەیە، پێویستی بە دەوڵەتێکە لە خەمی کۆمەڵگادابێت و بە سیاسەتێکیش نە لەسەر درۆ و پڕۆپاگەندە و دزی و جەردەیی دروستبووبێت، بەڵکو ڕاستگۆ و شەفاف و بەرپرسیاربێت، کە هەڵەی کرد لابچێت و بڕیاردانی سیاسی بۆ هێز و لایەنی دی جێبهێڵێت، پێویستی بە دابینکردنی بڕێکی تایبەتی دڵنیایی کۆمەڵایەتی هەیە کە لانیکەمی پێویستییەکانی هەر هاوڵاتییەکی بێکار دابینکات، (ئەو کرێکارانەی لە ئەوروپادا وەک دەرەنجامی ململانێی ئابووری بێکاردەبن، لەبرسا نامرن، بەڵکو دەوڵەت دەیانپارێزێت تا لەماوەیەکی تایبەتدا سەرلەنوێ دەست بەکار بکەنەوە). بە کورتی کە باس لە سەرمایەدارییەکی قابیلی ژیان دەکەین، قسە لە بوونی بازاڕ و دەوڵەت و کۆمەڵگایەک دەکەین یاسا بەڕێوەیانببات، ئەوەی نایاسایی بەرامبەر کرا

بتوانێت لە دادگایەکی سەربەخۆدا مافەکانی وەربگرێتەوە، ئەوەی نەخۆش کەوت و پیر بوو لەبرسا نەمرێت، خەڵک مافی خوێندن و فێربوونیان هەبێت هتد... بەم مانایە مەسەلەی بە لیبرالکردنی بازاڕ و دەوڵەت و سیاسەت و کۆمەڵگا، لە بەشێکی گەورەی جیهاندا، هەنگاوێکی هێجگار گرنگە بەرەوپێشەوە و ڕۆڵێکی گرنگیش دەبینێت لە تازەبوونەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی و دەوڵەتی و کولتووریدا.

جیهانگیری دەشێت یارمەتیدەری دروستبوونی ئەم فۆرمە تایبەتەی سەرمایەداریبێت و هێزێکی گرنگی پیادەکردنی ئەو گۆڕانەبێت، وەکچۆن دەشێت هەڵگری پیادەکردنی دڕندەترین شێوازی سەرمایەداری و بێقانوونی و تالانی و تێرۆربێت. جیهانگیری وەکچۆن دەشێت لە فۆرمی دەوڵەتی یاسا و بازاڕێکی عەقلانیدا بەرجەستەببێت، بەهەمانشێوە دەشتوانێت لە فۆرمی چەوساندنەوە و ڕووتانەوەیەکی ئابووری سیاسی و کولتووریدا بەرجەستەبێت. بەلام بۆ بالادەستبوونی هەریەکێک لەم دوو سیناریۆ دژ بەیەکە هەمیشە کۆمەڵێک گەمەکەری کۆمەلایەتی لۆکاڵی پێویستن کە جیهانگیری ڕادەکێشنە ناو سیاقە لۆکاڵییە تایبەتەکانەوە. بۆیە هەم بۆ پیادەکردنی سیسمتێکی ئینسانی مژدەبەخش و هەم بۆ پیادەکردنی شێوازە دڕندەکانی سەرمایەداری پێویستت بە هەلومەرجێکی ناوەکی هەیە کە یەکێک لەم دوو سیناریۆیە سەروەربکات. ئەوانەی کە دەتوانن دەستنیشانی ئەوبکەن کام فۆرمی سەرمایەداری و کام بەرجەستەبوونی مۆدێرنە سەروەربێت تەنها کۆمپانیا بان نەتەوەییە سنووربەزێن و گلۆبالییەکان نین، گەرچی توانای ئەم هێزانە زۆر گەورەیە، بەڵکو ئەو هێز و بزوتنەوە کۆمەلایەتییانەشن کە لە لۆکاڵەکاندا ئامادەن و ململانێییەکی بەردەوام لەسەر دابەشکردنەوەی سەروەت و سامانی کۆمەلایەتی دەکەن و لەهەوڵێکی بەردەوامی بە یاسایکردنی ژیانی ئابووریدان و خوازیاری کرانەوەی زیاتری ژیانی سیاسی و سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی مانا و ڕەمز و پێناسەکانن.

### ٣. جیهانگیری و ئابووری

تیۆرەی جیاواز و ناکۆک سەبارەت بە دەرەنجامە ئابوورییەکانی جیهانگیری لەئارادان؛ هەندێکیان باس لە باشتربوونی جیهان دەکەن و هەندێکی دیکەیان باس لە خراپتربوونی هەمان جیهان دەکەن. کەسانێک هەن جیهانگیری وەک

تاقه دەروازەیەکی گۆڕان و گەشەکردنی ئابووری دەبینن، کەسانی دی هەن بەردەوامبوونی جیهانگیری وەک کارەساتێکی ئابووری گەورە وێنادەکەن، هەن بە چارەسەری سیحری هەموو کێشەکانی دادەنێن و هەشن بە هۆکاری هەموو خراپەکارییەک. گومانی تێدا نییە جیهانگیری هەڵگری هەردوو ڕەهەندەکەیە و لەنێوان ئەو دو ڕەهەندەشدا دەیان و سەدان سیناریۆی دیکە هەن کە لەنێوان «ئەوپەڕی باشی» و «ئەوپەڕی خراپیدا» نیشتەجێن. جیهانگیری لەسەرێکەوە هەلی گەشەکردنی ئابووری ئەو وڵاتانەی گەورەتر و زیادکردوە کە بەشێکن لە پرۆسەی جیهانگیری و بە ملیۆنان فرسەتی کاری خوڵقاندوە، وڵاتانی وەک هۆنگ کۆنگ، سەنگافورە، مالیزیا، تایلاند و هیند دیارترینی ئەو نموونانەن کە جیهانگیری فرەستی کاری تێدا زیادکردوون. بەبۆچوونی لێزانانی بواری ئابووری لە ژمارەی دووسەد وڵات لە جیهاندا تەنها ٣٠ وڵات بە چالاکی لە جیهانگیری ئابووریدا بەشدارن کە بریتین لە وڵاتەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئاسیای ڕۆژهەڵات و ئەمریکای باکور.

بەڵام شوێنی دوو دڵیش نییە کە جیهانگیری لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا جیاوازی نێوان بەشە هەژار و بەشە دەوڵەمەندەکەی جیهانی زۆر لە جاران گەورەترکردوە، هەندێک کۆمپانیا دروستبوون بەتەنیا بەقەد هەموو وڵاتانی ئەفریقا دەوڵەمەندن، سەرمایەداری وا هەیە بە تەنیا ئەوەندەی چەند دەوڵەتێک پارەدارە. ئەم جیاوازییانەش بەڕادەیەک ڕوو لە گەورەبوونن هەندێک تیوریست باس لە گواستنەوە دەکەن لە «نایەکسانییەوە» بۆ «نائینسانییەت».

بێگومان ئەم ڕەهەندە ئابوورییە نێگەتیفە پەرگیرە هەموو سیناریۆ ئابوورییەکانی جیهانگیری نین، وەکچۆن دەوڵەمەندبوون و پێشکەوتنیش تاقە سیناریۆ نییە. جیهانگیری لەم دوو سیناریۆ پەڕگیرە گەورەترە و بۆ سەلماندنی ئەم ڕایەش با سەرنج لە دوو ڕەهەندی ئابووریی دیکەی جیهانگیری بدەین. یەکەمیان مەسەلەی بەشداری هەرچی زیاتری ئافرەتە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا، دووهەمیان کۆچ و دەرەنجامەکانیەتی.

وڵاتێکی وەک مالیزیا لەڕێگای لابردنی ڕێگرە ناوەکییەکانەوە لەبەردەم وەگەڕخستنی سەرمایەی دەرەکیدا، سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لە کۆمپانیا گەورەکانی جیهانی ڕاکێشاوە و سەرمایەیەکی زۆری دەرەکی ڕاکێشاوەتە ناو

اتەکەوە. بێگومان ئەم سەرمایە دەرەکییە بۆ قازانجکردن چۆتە ئەو وڵاتە، دوای دەستی کاری هەرزان و تێچوونی کەمدا دەگەڕێت، واتە نەچووە مالیزیا زەبکاتەوە و دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤی بۆ ببات. بەڵام کارکردنی ئەم ەرمایە کۆچکردوە لەو وڵاتەدا بۆتە هۆی دروستبوونی هەلێکی زۆری کارکردن ، بۆ پڕکردنەوەیان ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان لە ماڵەکانیان هاتوونەتە دەرەوە چوونەتە ناو کارخانەکانەوە. ئەمەش جگە لە سود و قازانجی ئابووری و جگە بەرزبوونەوەی ڕێژەیی ئاستی ژیان لەو وڵاتەدا لەهەمانکاتدا هەنگاوێکی ـنگیش بووە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی ئافرەت و چارەسەرکردنی بەشێک کێشەکانی و بەرجەستەکردنی سەرەتاکانی عەدالەتی کۆمەڵایەتی. لە وڵاتێکی ک سەنگافورەدا کە ژمارەی دانیشتوانەکەی لە چوار ملیۆن مرۆڤ تێناپەڕێت، تەنها نیوەی ئەو سیدییە جۆربەجۆرانە بەرهەمدەهێنێت کە پیشەسازی ـمپیوتەر لە جیهاندا پێویستی پێیەتی.

کە لە ٧٠٪ پیشەسازی بەرهەمهێنانی جلوبەرگ لە ئەڵمانیاوە ئەچێت بۆ هیند پاکستان، یان لە ئیتالیاوە بۆ مەغریب، ئەمە بەدیوێکدا هۆکاری بێکاربوونی ـارەیەکی گەورەی کرێکارانی ئەڵمانی و ئیتالییە لەناو ئەوروپادا، بەڵام ودیودا هۆکاری دروستبوونی هەلی کارکردنە بۆ هەزاران هەزار کرێکار لە ـند و لە مەغریبدا، هەمان ڕاستی لە کۆچی زۆر پیشەسازی دیکەدا بۆ ـرەوەی ڕۆژئاوا و بۆ دەرەوەی وڵاتە تازە پێگەیشتوەکانی دیکەش، هەر ڕاستە.

گەر سەرنجێکی خێراش لە مەسەلەی کۆچ و هەندێک لەو دەرەنجامانە بدەین ـە هێناونتییە کایەوە، دەشێت کۆمەڵێک ڕەهەندی پۆزەتیڤ لەم دیاردەیەدا ۆزینەوە. بڕی ئەو پارانەی کە کۆچبەران تەنها لە ساڵی ١٩٩٧ بۆ وڵاتەکانی ـیانیان ناردۆتەوە ٧٧ بلیۆن دۆلارە. ئابووریناسەکان پێیانوایە بڕی ئەم پارەیە ـردەوام ڕوو لەزیادبوونە. بەشێکی گەورەی داهاتی نەتەوەیی کۆمەڵێک وڵاتی ک تورکیا و مەغریب و فلیپین و باکستان و میسر پشتئەستوورە بەو سەرمایە ـرەی لە دەرەوەڕا کۆچبەران دەینێرنەوە. گەر دوور نەڕۆین و کوردستنای ـۆمان وەک نموونە وەرگرین دیسانەوە هەمان دیاردە تێبینیدەکەین. لەبەشە ـکییەکەی کوردستاندا خودی بزوتنەوە سیاسییەکەی کورد لەڕێی کرێکارە ـوردە کۆچکردوەکانەوە یارمەتیدەدرێت و نرخ و تێچوونی دەزگا گەورە و ـنگەکانی ئەم بزوتنەیەوە لەلایەن کۆچبەرانی کوردەوە دەدرێت. حیکایەتی

کوردستانی عێراقیش هەمان ڕاستی دەسەلمێنێت، گەر سەرمایەی کۆچبەرە کوردەکانی ئەم بەشەی کوردستان نەبوایە دەکرا بارودۆخی ئەمڕۆکەی کوردستانی عێراق لە ئاستی هەژارترین بەشەکانی جیهاندا بووایە.

لێرەوە ناتوانین پرۆسە ئابوورییەکانی جیهانگیری وەک شەڕ و خراپەکاری ڕەها ببینین و بێهیچ لێکۆڵینەوە و تێڕامان و خوێندنەوەیەکی ڕاستەقینە بە دۆزەخ یەکسانیبکەین. بێگومان ئێمە نامەنەوێت ئەو بۆچوونە ئایدیۆلۆژییە بسەلمێنێن کە پێیوایە جیهانگیری چاکەی ڕەهایە، بەڵام ئەو دیدەشمان پێ ناڕاست و ئایدیۆلۆژییە کە بە خراپەی ڕەها یەکسانی دەکات. لە هەموو بارێکدا کۆی ئەم گۆڕانانە و کۆی زۆربەی دەرەنجامەکانی تری جیهانگیری پابەستی ئەوەن کام هێز و کام سیاسەت و کام پێکهاتی کۆمەڵایەتی و کام دیدی کولتووری لە لۆکاڵەکاندا ئامادەیە و چۆن ئەم گۆڕانە تازانە وەردەگرێت و بە چ شێوەیەک دەیانخاتە گەڕ و بەرەو کام ئاییندە ئاراستەیان دەکات.

## جیهانگیری و سیاسەت

گرنگترین بابەتێک کە کاریگەرییەکانی جیهانگیری لەسەر سیاسەت نیشانبدات پەیوەندی نێوان دەوڵەتی نەتەوەیی و جیهانگیرییە. لەم چەند ساڵەی دواییدا بە دەیان کتێب و سەدان ووتار لەسەر ئەم مەسەلەیە نووسراون، بەدەیان و سەدان کۆڕو کۆبوونەوەی فیکری و زانستیش سازدراون کە باس لە کاریگەرییەکانی جیهانگیری بۆسەر دەوڵەت دەکەن. لەم لێشاوە زۆرەی نووسیندا باس لە ڕەهەندە جیاجیاکانی ئەو پەیوەندییە کراوە بەچەندان پرسیاری گرنگ کراون، بۆ نموونە: کاریگەرییەکانی جیهانگیری چین لەسەر تواناکانی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ چاودێریکردنی پرۆسە ئابوری و سیاسی و کولتوورییەکان؟ کاریگەری جیهانگیری چییە لەسەر تواناکانی دەوڵەت بۆ دەرکردنی یاسا، بۆ پاراستنی بیرۆکەی سەروەری، السیادە، بۆ چۆنیەتی پێناسەکردنەوەی مەسەلەی هاووڵاتیبوون؟ کاریگەری جیهانگیری لەسەر گۆڕانی پێکهاتی ئەتنی و کولتووری و کۆمەڵایەتی چییە؟ هتد... هەموو ئەم مەسەلە جیاوازانەش سەرلەنوێ لە پرۆسەی پێداچوونەوە و پێناسەکردنەوە و ڕاڤەکردنی نوێدان.

نووسەرێکی گرنگی بواری ئابووریی سیاسی نێودەوڵەتی، سۆزان زترێنج، لە بەرخوردیدا لەسەر تواناکانی دەوڵەتی نەتەوەیی لە پەیوەندیدا بە جیهانگیرییەوە ئەم چوار کایەیە لەیەکدی جیادەکاتەوە: کایەیەی ئاسایش، کایەی بەرهەمهێنان، کایەی دراو و کایەی مەعریفە. بەبۆچوونی سترێنج دەوڵەتی نەتەوەیی تەنها توانای چاودێریکردن و بەڕێوەبردن و مۆنۆپۆلکردنی کایەی ئاسایشی هەیە، هەرچی کایەکانی دیکەیە لەژێر دەستی دەوڵەتی نەتەوەییدا نەماون و لە کۆنترۆڵ و چاودێری و مۆنۆپۆلکردنی ئەو دەربازبوون.

بێگومان ئەو دۆخەی سترێنج باسیدەکات دۆخێکی نوێیە. لەم سێ سەدەیەی دواییدا دەوڵەت تاکە گەمەکەرێکی نەتەوەیی و بان نەتەوەیی بووە. لە ئاستی نەتەوەییدا ئەو هێزەبووە کە بڕیاری لەسەر مەسەلە نەتەوەییەکان داوە و لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا بە پێکەوەیی و لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەدا بڕیاریان لەسەر مەسەلە نێودەوڵەتییەکان داوە. ئەمەش وایکردوە دەوڵەت هەم لە ئاستی نەتەوەییدا و هەم لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا، ئەو هێزەی هەبێت کە خاوەنی دواهەمین بڕیار و دواهەمین قسەبێت لەو کێشانەدا کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. یەکێک لە دەرەنجامە گرنگەکانی جیهانگیری دەسکاریکردنێکی قووڵی ئەم توانا بێسنوورەی دەوڵەتە لەبڕیاردانی ناوەکی و دەرەکیدا. جیهانگیری کۆمەڵێک لایەن و هێز و گەمەکەری نوێی بەرهەمدەهێنێت کە شانبەشانی دەوڵەت ڕۆڵی گرنگ و تایبەتیان لە بڕیاردان و هێنانەپێشەوەی چەندان مەسەلەدا هەیە کە سی ساڵێک لەمەوبەر تەنها دەوڵەت پێیانەوە خەریکبوو. گرنگترین دەرەنجامێک لەم پەیدابوونەی شەریکی نوێ بۆ دەوڵەت کەوتبێتەوە لاوازبوونی بیرۆکەی «سەروەری نەتەوەیی» یان «سەروەری نیشتیمانییە» السیادە القومیە یان السیادە الوتنیە.

چەمکی دەوڵەت هێما بۆ یەکەیەکی سیاسی و یاسایی سەربەخۆ دەکات کە لە سەرزەمینێکی دیاریکراودا هەڵگری سەروەرییە، ئەم سەروەرییە ئەو مافە بە دەوڵەت ئەدات کە لەو شوێنە دیاریکراوەدا هەموو توانایەک بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی بەکاربێنێت، تا بە بەکارهێنانی هێز و توندوتیژیش دەگات، دژ بە هەموو ئەو گروهە ناوەکی و دەرەکیانەی دەیانەوێت ئارامی و ئاسایشی

ناوخـۆیی ئەو دەوڵەتە تێکبـدەن. بیـرۆکـەی سـەروەری تاڕادەیەکی زۆر دەوڵەت دەکاتە بوونەوەرێکی ئازاد لە پەیوەندیدا بە کۆمەڵگا، نەتەوە یان بەوانەوە کە لە سنووری ئـەو دەوڵەتدا دەژین. ئەم بیـرۆکـەیە لەهەمـانکاتدا ئەوەدەگـەیەنێت کـە دەوڵەت تاقە دەسـەڵات و دواهەمین دەسـەڵاتێکە کە بۆی هەیە لەناو سنوورەکانی خۆیدا ئەو کارانە پیادەبکات کە دەیەوێت و ئەو یاسایانەش دەردەکات کە دەبێت تاکـەکـەس و گروپ و دەزگـا و ئۆرگـانە ناوخـۆیی و دەرەکـیـیـەکان ڕێزیبگرن و پیادەیبکەن. لەم ئاسـتەدا دەوڵەت بالاترین هێزی یاسـایی و سیاسییە، لەدەرەوەی دەوڵەتدا هێـزک نییـە بۆی هەبێت لـە دەوڵەت بپرسـێتـەوە و بەرپرسـیـاری بکات بەرامبەر ئەو شتانەی کە دەیانکات.

جـیـهـانگیـری، لە هـەندێک ئاسـتـدا، ئەم دۆخـە تایبـەتەی سـەروەری و ئەم دەسـەڵاتە ڕەهایەی دەوڵەتی لاوازکـردوە. مێژووی ئـەم دە سـاڵەی دوایی شـایەتی ئەوە ئەدات کە هەندێکجار پاراستنی مافـەکانی مرۆڤ و بە دەمەوەچوونی گروهە لاوازەکانی ناو دەوڵەتێکی نـەتەوەیی دیاریکراو، لە پاراستنی بیرۆکەی سەروەری نەتەوەیی گـرنگتـربووە. دەسـتـێـوەردان لە کـاروباری سـربیـادا بۆ پاراسـتنی ئەلبانییە کۆزۆڤۆییەکان، بڕیاردان بۆ سەربەخۆیی تیمۆری ڕۆژهەڵات، پاراستنی کـوردسـتـانـی عێراق دژ بە دەوڵەتەکەی سـەدام، نموونەی بەرجـەسـتـە و بەرچاوی لاوازبوونی پرنسـیپی سـەروەری نەتەوەیین، لەهەمـوو ئەم دۆخـانەدا بەرگـرتن بە پێشێلکردنێکی سەخت و هەمەلایەنی مافـەکانی مرۆڤ گرنگتـربووە لە پاراستنی بیرۆکەی سـەروەری نەتەوەیی. بێگومـان کاریگەری جیـهانگیری لەسـەر دەوڵەت تەنهـا لەم ئاسـتـەدا بەرجـەسـتـە نیـیـە، من لێرەدا زۆر بـە کـورتی لە هـەندێک ڕەهەندی دیکەی ئەو کـاریگەرییانە نیشانئەدەم کە جیـهانگیری لەسـەر دەوڵەتی نەتەوەییی هـەیەتی (Lechner &Boli 2000: part V&VI):

١ـ جیـهانگیری مـۆدێلی دەوڵەتی نەتەوەیی کردۆتە مـۆدێلێکی جیهـانی. ئەمڕۆ ئەم مـۆدێلە تاقـە مـۆدێلێکە کـە لە جـیــهـانـدا دەسـتـبـەکـارە و کـۆی ئەو پێکهـاتە سـیاسـییانەش کە لە دەوڵەتـی نەتەوەیی گەورەترن لەزۆر ڕووەوە هـەر دەرەنجـامـی بڕیاری نەتەوەیین.

٢ـ جیـهانگیری مـۆدێل و وێناکردنێکی تـیبەتی دەوڵەتی بە جیـهانیکردوە کە هـەر دەوڵەتێک بیـەوێت وەک دەوڵەت ئامـادەبێت ناچارە بەشـێکی گەورەی ئەو مـۆدێل و

وێناکردنە جێبەجێکات، بۆ نموونە دەوڵەت لەپاڵ کارە کلاسیکییەکانیدا کە بریتین لە بەرگری سەربازی و ڕێکخستنی سیاسەتی دەرەکی، دەبێت لە هەوڵی دابینکردنی سیستمی خوێندن و سیستمی تەندروستی و ڕێکخستنی ئابووری و هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی هەژاری و ڕێکخستنی مەسەلەی خانەنشینی و کۆمەکی کۆمەڵایەتیشدابێت. ئەمە جگە لەوەی چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە هەر دەوڵەتێک لانیکەمی پرنسیپە دیموکراسییەکان پیادەبکات و پەرلەمانی هەبێت و هەڵبژاردن ئەنجامبدات و مافی دەنگدانی یەکسان بە هاوڵاتییەکانی ببەخشێت.

٣ـ یەکێک لە دەرنجامە هەرە گرنگەکانی جیهانگیری سیاسی بریتییە لە دروستبوونی سەدان و هەزاران ئۆرگانی (نێو ـ دەوڵەتی) کە چەندان ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و کولتووری جیاجیا دەبینن. ئۆرگانی نەتەوە یەکگرتوەکان، یۆنسکۆ، ئۆرگانی تەندروستی جیهانی، ئۆرگانی بازرگانی جیهان WTO، سندوقی دراوی نێودەوڵەتییIMF، نموونەی هەرە دیاری ئەم شێوە تایبەتانەی ئۆرگانی نێودەوڵەتین کە کاریگەری گەورەیان لەسەر بڕیاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی نێو دەوڵەتە نەتەوەییەکان هەیە. بێگومان ئەم کاریگەریانە جیاوازن، هەندێکجار باش و هەندێجار خراپن، ئەوەی لێرەدا مەبەستی ئێمەیە باسیبکەین دروستبوونی گەمەکەری نوێیە لەدەرەوەی دەوڵەتدا کە ڕۆڵی گرنگ لە داڕشتنی سیاسەتی جیهانیدا دەبینن.

٤ـ لەدایکبوونی ژمارەیەکی هێجگار گەورەی ئۆرگانی (نا ـ دەوڵەتی) لە ئاستی جیهانیدا. ئەم ئۆرگانە نادەوڵەتییانە زۆرجار ئۆرگانی خۆبەخشی خەڵکانێکن کە لە ئاستی جیهاندا بۆ بەرگریکردن لە مەسەلەیەکی دیاریکراو خۆیان تەرخان دەکەن. تا ساڵی ١٩١٠ ژماری ئەو ئۆرگانە نادەوڵەتیانەی لە هەموو جیهاندا هەبوون بریتیبوون لە ٥١ ئۆرگان، لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەم ژمارەیە دەبێت بە زیاد لە ٥٠٠٠ ئۆرگان و بە بەشێکی زۆری کۆمەڵگاکانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە. ڕەنگە بەناوبانگترینیان ئۆرگانی ئەمنیستی ئینتێرناسیۆنال Amnesty International، هیومان ڕایت وۆچ Human Rights Watch، وۆرڵد واید فۆند فۆر نەیچەر Worldwide Fund for Nature، گرین پیس Greenpeace و مانگ و خاچی سور، پزیشکە بێسنوورەکان و ڕۆژنامەنووسە بێسنوورەکان، ویلدلایف فۆند و چەندانی دیکە بن. بەشێوەیەکی گشتی ئەم ئۆرگانانە سەرقاڵی جێبەجێکردنی ویست و ئارەزووی هێز و لایەن و گروهە

کۆمەلایەتی و کولتوورییە جیاجیاکانن نەک ویستەکانی دەولەت، لەهەندێک دۆخدا کاری ئەم ئۆرگانانە ڕاستەوخۆ دژ بە ویستی دەولەت و پلانەکانی دەولەتە، بەلام لەهەندێک دۆخی دیکەدا لەگەل دەولەتدا پێکەوە کاردەکەن.

٥- لەدایکبوونی ژمارەیەکی زۆری «بزوتنەوەی کۆمەلایەتی جیهانیانە». لەوانەش بزوتنەوەی بەرگریکردن لە مافەکانی منال و ئافرەت و پیر، بەرگریکردن لە ژینگە، لە مافە مەدەنییەکان، بزوتنەوەی دژ بە چەک و هێزی ئەتۆمی وچەندانی دیکەش.

هەموو ئەم هێزە نوێیانە وایانکردوە لە ئاستی جیهانیدا دەولەت چیدی تاقە گەمەکەرێک نەبێت، بەلکو لەپال دەولەتدا ئەم ئۆرگان و ناوەند و هێزە نوێیانە ئامادەبن و هەریەکە و لە شوێنی خۆیەوە بەجۆرێک لە جۆرەکان کاریگەری لەسەر چۆنیەتی دارشتنی پلان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەولەتان هەبێت، هەندێکجار ئەم کاریگەرییانە گەورە و هەندێکجار بچووکن، هەندێکجار دەولەتان ناچارن گوێ لەم ئۆرگانانە بگرن، هەندێکجار تەواو پشتگوێدەخرێن. بەلام لە هەموو دۆخێکدا کە باس لە جیهانی ئەمرۆ دەکەین ناتوانین ئەم هێزە نوێیانە بەتەواوی پشتگوێخەین و چاو لەبوون و ئامادەگیان بنووقێنین.

بێگـ ـان هەمـ ئەم مەسەلانە ئەوە ناشارنەوە کە هەندێک هێزی جیهانی کاریگەری هێجـ ـر گەورەیان لەسەر سیاسەتی جیهانی هەیە، لانیکەم ئەو هێزانەی کە مافی ڤیتۆیان لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هەیە، لەدەرەوەی ئەم ئەنجومەنەشدا هێزی ئەمریکا لە دەستنیشانکردنی کۆمەلێک ئاراستەی تایبەتی سیاسەتی جیهانیدا بۆ هەموو کەس ئاشکرایە، بەلام ئەمە سەرەتا و کۆتایی چۆنیەتی کارکردنی سیاسەت و کارکردنی هێزە سیاسییەکانی سەردەمانی جیهانگیری نین. سەرەڕای ئەمە هێز و توانای سیاسی ئەمریکا خۆشی لە ڕەوتێکی جیهانی و نێودەولەتیدا ئامادەیە کە ناتوانێت بەتەواوی ئەو ڕەوتە تێپەڕێنێت و چاو لە ئاستی پێدراوەکانیدا بنووقێنێت.

## ٤ـ جیهانگیری و کولتوور

له ئاستی کولتووریدا کەس ناتوانێت نکوڵی لەوەبکات کە یەکێک لە دەرەنجامە کولتوورییەکانی جیهانگیری بریتییە لە بڵاوبوونەوەی کولتووری ئیستیهلاک و کەیفسازیی بەجیهاندا. بڵاوبوونەوەی وێنەکانی مادۆنا و مایکل جاکسۆن و سپایس گیرل و دیزنی لاند و کۆکاکۆلا و ماکدۆناڵد، نموونەی بەرچاوی ئەم مەسەلەیەن. لەیدی هەندێک تیوریستدا ئەم بڵاوبوونەوەیە بەرادەیەک هەمەلایەن و بەربڵاوە وایکردوە جیهان ببێتە جیهانێکی یەک کولتووریی کە تیایدا «کولتووری کۆکاکۆلا» بەسەر کۆی کولتوورەکانی دیەکدا زاڵ بووە و کولتوورێکی «هاوشێوە و وێکچوو» بەسەر هەموو جیهاندا سەپاوە. لەم دیدە ئەم بڵاوبوونەوە گریمانکراوەی «یەک کولتووریی» هەندێکجار بە «غەزووی کولتووری» و هەندێکجار لەژێر ناوی «فەوتان و لەدەستدانی ڕەسەنایەتی» و زۆرجاریش لەژێر ناوی «بە ئەمریکایبوونی» جیهاندا باسدەکرێت، کە دواهەمین دەرەنجامەکانی بریتییە لە هەژارییەکی کولتووری و عەدەمیەت و زیانی گەورە بە کۆی ئەو کولتوورانەی نایەنەوێت تەسلیم بەم هێرشە کولتوورییە ئیستیهلاکییە بن. بێگومان لە ئاستێکی زۆر سادە و سەرەتاییدا ئەم تێزە برێکی کەم ڕاستی تێدایە، ئەمرۆ ماکدۆناڵدا لە بەشێکی زۆری جیهاندا هەیە و وێنەکانی جانێت جاکسۆن و مادۆنا و سپایس گیرل لەزۆر شوێنی جیهاندا ئامادەن و کەم میللەت لە سەر ئەم ئەستێرەیەدا ماوە کۆکاکۆلا نەناسێت. بەڵام ئەمە هەموو ڕاستییە کولتوورییەکانی جیهانگیری نییە و بەهیچ مانایەک دەربڕی ئەو پرۆسە کولتوورییە قووڵ و ئاڵۆز و فرەلایەنە نییە کە جیهانگیری لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی.

لەپاڵ بڵاوبوونەوەی ئەم ڕەهەندە ئیستیهلاکی و کەیفسازییەی کولتووردا، بڵاوبوونەوەی بەردەوامی کولتوری دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و بەهاکانی لێبوردن و ڕێزی ژینگە و بەرگری لە جیاوازی و لە مافی گروهە بچووک و کەمە نەتەوایەتییەکانیش ئامادەیە. لە بەشێکی گەورەی جیهاندا کۆڕ و کۆمەڵ و هێزی کۆمەڵایەتی تایبەتی دروستبوون کە بە زمانی ئەم پێدراوە کولتوورییە گرنگانە ئەدوێن. لە ڕاستیدا بڕی ووشیاربوون بەم بەها کولتوورییانە ئەمڕۆکە لە دوێنێ زیاترە و ئەم دەیەی دوایی زیاتر لە دەیەکانی بەر لەخۆی بەم مەسەلانە ئاشنابووە. لە جیهانی ئەمڕۆدا ووشیاربوون بەم مەسەلانە زۆر زیاترە لە

جیهانی چارەکەسەدەیەک لەمەوبەر، هەر خودی ئەو شەڕە ئەتنی و ئاینی و نەتەوەییە خوێناوییانەی لەم دە ساڵەی دواییدا ڕوویانداوە، لە ئاستێک لە ئاستەکاندا، دەرەنجامی بڵاوبوونەوەی ئەو بەها کولتووری و ووشیارییە تایبەتەیە کە بەم بەها کولتوورییانەوە پابەستە. کتێبەکانی هینتکتۆن و کتێبەکانی ئیدوارد سەعید، نووسینەکانی فوکویاما و نووسینەکانی سەلمانی ڕوشدی، ڕۆمانە پۆلیسییەکان و ڕۆمانەکانی نەجیب مەحفوز وەک یەک بە جیهاندا بڵاودەبنەوە، دەنگی بوش و دەنگی ئەمنستی ئینتێرناشناڵ لەهەموو شوێنێکدا ئامادەیە.

دەشێت لەو ئەدەبیاتە زۆر و هەمەلایەنەدا کە لەسەر کاریگەرییە کولتوورییەکانی جیهانگیری نووسراوە دوو هەڵوێستی جیاواز لەیەکدی جیاکەینەوە. یەکەمیان ئەو هەڵوێستەیە کە باس لەوە دەکات کە جیهانگیری تا دێت هاوشێوەبوون و لێکچوونی هەرچی زیاتری کولتوورە جیاوازەکانی جیهان، گەورەدەکات. دووهەمیان ئەو هەڵوێستەیە کە ڕێک پێچەوانەی ئەم دیدە نیشانئەدات و باس لەوە دەکات کە جیهانگیری بڕی جیاوازیی و لێکنەچوون و فرەڕەنگییەکانی لە جیهاندا گەورەتر کردوە. هەریەکێکیش لەم دوو دیدە ئەرگومێنت و بۆچوون و لۆژیکی تایبەتی بیرکردنەوەی خۆی هەیە. ئەوانەی باس لە «هاوشێوەبوونی جیهان» دەکەن لەوباوەڕەدان کە بوونی میدیاییەکی جیهانی هاوچەرخ و بوونی تەکنۆلۆژیاییەکی بەرفراوانی پەیوەندیکردنی بان - سنووری، وەک تەلەفۆن و فاکس و ساتالایت و ئینتەرنێت، و بڵاوبوونەوەی کولتووری ماکدۆناڵد و دیزنی لاند و کۆکاکۆلا بەسەریەکەوە «کولتوورێکی جیهانی یەکگرتوویان» دروستکردوە کە لە جەوهەردا کولتووری ئەمریکا یان ڕۆژئاوایە و لەڕێگای هاوکێشەیەکی کولتووری و سیاسی و ئابووری ناهاوسەنگەوە بەسەر هەموو جیهاندا سەپێنراوە. ئەمەش وادەکات جیهان وەک سیستمێکی یەکگرتوو دەرکەوێ و بەشە جیاوازەکانی تادێت زیاتر لەیەکتر بچن و یەک کولتوور و یەک سیستمی ڕەمزی و یەک سیستمی بەها پێکیانەوە گرێبدات. ئەم تیوریستانە لە ناوچە و ڕەوگە لۆکاڵییەکاندا بەدوای شتە جیهانییەکاندا دەگەڕێن، لە نێجیریا و سەنگافورە و کوردستاندا بەدوای کۆکاکۆلا و لە پاریس و ئەنقەرە و عەمماندا بەدوای ماکدۆناڵد و لە سویسرا و لوبنان و هۆنگ کۆنگدا بەدوای دیزنی لاندا دەگەڕێن.

بەلای ئەم گروهەوە کولتووری گلۆباڵ، کولتووری ئیستیهلاکە و لەلایەن کۆمپانیا بان نەتەوەییە گەورەکانەوە بڵاودەکرێتەوە، یاخود کولتووری ئەمریکایە و لەڕێگای «ڕۆشنبیری نارەسەن!!!» و سی ئای ئەی و دەزگاکانی میدیاوە بڵاودەکرێتەوە، قسە لە «ئیمپریالیزمی کولتووری»، «ئیمپریالزیمی میدیا» و غەزو و هێرشی فەرهەنگی دەکرێت، باس لە بڵاوبوونەوەی ڕێژەگەرایی و عەدەمیەت و مردنی مانا و بەهاکان دەکرێت، حیکایەتی ئەوە دەگێڕدرێتەوە گوایە کولتوورەکانی دیکە لە بەردەم هەڕەشەی لەناوچووندان و ڕەسەنایەتی و شوناس و خۆماڵیبوون لە قڕاندان. لەم دیدەدا کۆمپانیا بان نەتەوەییەکان جیهان بەو شێوەیە دادەڕێژنەوە کە لەگەڵ قازانج و دەسکەوتەکانی خۆیاندا یەکانگیربێت، بۆ ئەم مەبەستەش یەکەمینجار بەشێوەیەکی پلانڕێژکراو کولتوور و کۆد و سیمبۆلەکانی خۆیان بە جیهاندا بڵاودەکەنەوە، تادواتر بتوانن بە ئاسانی خەیاڵ و عەقڵ و وێناکردنی ئینسان و کولتوور و کۆمەڵگاکانی دیکە ڕکێفبکەن، گەر ئەم ستراتیژە کۆلۆنیالییە لەم ئاستەدا جێبەجێنەبوو ئەوکات هێزی سەربازی ئامادەبکەن بۆ سەپاندنی ئەم مەسەلەیە. بە کۆکاکۆلاکردن یان بە ماگدۆناڵدکردن یان بە ئەمریکایکردنی کولتوورەکانی جیهان، ئەو ناوەیە بەم پرۆسەیە ئەدرێت و ڕێک وەک هێرش و پەلامار و غەزو و تاڵانکردنێکی کولتووریش وێنادەکرێت. لەم دیدەدا پرۆسەی بە ماکدۆناڵدکردنی جیهان، پرۆسەیەکی ترسناکە و لە فۆرمی بڵاوبوونەوەی کولتووری میللی ئەمریکیدا بەرجەستەیە، کە گوایە کولتووری «پۆپ میوزیک» و «سێکسی ئاشکرا» و «زبڵی» «تۆک شۆ» کانی ناو تەلەفیزیۆنە.

بنیامین باربار، زانایەکی سیاسی ئەمریکییە و یەکێک بووە لە ڕاوێژکارەکانی سەرکۆی پێشوی ئەمریکا کلینتۆن، لە بەرامبەر ئەم بە ماکدۆناڵدبوونەی جیهاندا قسە لە کۆمەڵێک وەڵامدانەوە و بەرگریی کولتووری دەکات کە لەژێر ناوی «جیهاد» دا کۆیاندەکاتەوە (Barber 1995). لای ئەم پیاوە ماکدۆناڵد و جیهاد دوو پێکهاتەی کولتوورین کە ناکرێت لەیەکتریان داببڕین، هێرشی ماکدۆناڵد بۆسەر جیهان پەرچەکرداری جیهاد دەخاتەوە، مادام ماکدۆناڵد کولتوورێکە هێرشدەبات، جیهاد دەبێتە پارچەکردار و بەرگریدەکات. بەم مانایە ماکدۆناڵد لۆژیک و سیمبۆڵی کولتوورێکی ئیستیهلاکییە کە بەدیوی ئەودیوودا فوو بە ئاگر و تەنوور و کووره خوێناوییەکانی جیهاددا دەکات. بەبۆچوونی ئەم

زانایە گوتاری جیهادیی، واتە گووتاری ئەو هێزە ئوسولیيانەی کە بۆ بەخشینی مانا بە جیهان بۆ دۆگمای ناو دەقە ئاینییە کۆنەکان دەگەڕێنەوە، وەڵامێکی کولتوورییە بەڕووی ئەو پرۆسە بەرفراوانەی وێکچوونی کولتوورییدا کە بڵاوبوونەوەی ماکدۆناڵد و پرۆسەی بە ئەمریکاییبوونی جیهان دەیخەنەوە. باربار ڕای وایە کە جیهانی ئەمڕۆ جیهانێکە لەنێوان ماکدۆناڵد و جیهاددا دابەشە، ماکدۆناڵد وەک ڕەمزی جیهانگیری و جیهادیش وەک پەرچەکردارێکی کولتوورگەرا و دۆگمایی و سنووردار و داخراو بەڕوویدا. ئەم زانایە پێکدادانی نێوان جیهاد و ماکدۆناڵد وەک پێکدادانی نێوان عەشیرەتگەرایی ئاینیی و بە گەردونیبوونی سەرمایەدارییەکی ئیستیهلاکی دەبینێت و هەردووکیشیان بەهەمان هەناسە ڕەخنە دەکات.

ئەم وێناکردنە کولتوورییە تایبەتەی جیهانگیری لای زۆر نووسەر و کەس و گروهی جیاوز دەبینرێتەوە. سامۆیل هینگتۆن تاڕادەیەکی زۆر هەمان دید بۆ جیهانگیری دووبارەدەکاتەوە (Huntington 1993) ئەم پیاوەش باس لە پێکدادانی شارستانییەتەکان و شەڕی کولتوورەکان دەکات. لای هینگتینتۆن جیهانی ئایندە دەبێتە شانۆی پێکدادانی شارستانییەتی ماکدۆناڵد و شارستانییەتی جیهاد، ئەم دوو کولتوور شەڕی مان و نەمان لەگەڵ یەکدادەکەن و ئەمیان خۆی وەک دژەدیووی ڕەهای ئەویدیان پێشنیاردەکات. لەڕاستیدا ئەم دیدە هەمان دیدی سەرۆکی پێشوی ناتۆشە کە دوای کەوتنی دیواری بەرلین ئاشکرایکرد. ئەویش وەک هینگتینتۆن پێیوایە کە دوای کەوتنی کۆمۆنیزم و دوای کۆتاییهاتنی ململانێی نێوان لیبرالیزم و کۆمۆنیزم ئیدی ململانێی نێوان ئیسلام و لیبرالیزم هاتۆتەکایەوە، لەدوای کۆتایی شەڕی ئایۆلۆژیاکانەوە شەڕی کولتوورەکان پەیدابووە. ئەگەرچی هینگتۆن و سەرکۆی پێشوی ناتۆ بۆچوونەکانیان لە ڕەوتی قسەکردنیاندا لەسەر جیهانگیریی دەرنابڕن، بەڵام لەدواجاردا بەهەمان ئەو ڕێگایەدا دەڕۆن کە باس لە هاوشێوەبوونی کولتوورکانی جیهان و پێکدادانیان دەکات.

لاوازی هەرە گەورەی ئەم ڕاڤەکردنە بۆ جیهانگیری لەوەدایە کە هەڵگری دیدێکی کورتبین و یەکلایەنە، تەنها باس لە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی جیهانگیری دەکات و بەئەندازەیەکی سەیر ئەم ڕەهەندە گەورەدەکات و وەک تاقە ڕەهەندێکی کولتووری جیهانگیریش دەیناسێنێت. ئەم دیدە کولتوورییە

شارستانیەتەکان کورتدەکاتەوە بۆ کۆمەڵێک سیمبولی سادە، ڕۆژئاوا بۆ ماکدۆناڵد و ئیسلام یان ڕۆژهەڵات بۆ جیهاد، بەم کارەشیان هەموو ئەو ئاڵۆزییانە دەکوژن کە لەنێو هەریەکێک لەم شارستانیەتانەدا ئامادەیە و ئەو ئاڵۆزییانەش پشتگوێدەخەن کە جیهانگیری لەڕووی کولتوورییەوە دروستیدەکات.

هەر لە چوارچێوەی ئەو تیورەدا کە باس لە لێکچوون و هاوشێوەبوونی هەرچی زیاتری کولتووری بەشە جیاوازەکانی جیهان دەکات، کەسانی دی هەن لەباتی باسکردنی هێرش و غەزوی کولتووری ئیستیهلاکی، جەغد لە مەسەلەی بە گەردونیبوونی مافەکانی مرۆڤ و بە گەردوونیبوونی بەها دیموکراسییەکان و ڕێزگرتنی جیاوازی دەکەن. ئەمانە لەهەمان دیدی هاوشێوەبوونی کولتوورییەوە دەدوێن، بەڵام لەباتی بڵاوبوونەوەی کولتووری کۆکاکۆلا و ماکدۆناڵد و کەیفسازی باس لە بڵاوبوونەوەی کولتووری مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسیەت و کرانەوە دەکەن. ئەمانە لەبات ماکدۆناڵد و جیهاد باس لە دروستبوونی لەسەرخۆی جیهانێک دەکەن کە وردە وردە بەهاکانی دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و کولتووری لێبوردن و بەهای هاریکاری و ڕۆحیەتی کاریپێکەوەیی و وێناکردنی جیهان وەک ماڵێک بۆ هەمووان، دەگرێتەخۆی. باس لەوەدەکەن کە جیهانگیری بیرۆکەکانی دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤ و بەهاکانی پاراستنی ژینگە و ڕێزی جیاوازی و ڕێزی مافی کەمە نەتەوەکان و لاوازکردنی بیرۆکەی سەروەری نەتەوەیی بە جیهاندا بڵاکوردۆتەوە. لەمەشەوە ئەنجامگیری دەکەن و دەڵێن جیهانگیری خەریکی دروستکردنی جیهانێکە کە لەڕووی کولتوورییەوە لێکنزیدەکەوێتەوە.

بێگومان هیچ بیرۆکەیەک و هیچ چەمکێکی جیهانیی و بان نەتەوەیی بیرۆکە و چەمکی بێلایەن نین و بەتەنها لە فۆرمی چەمک و بیرۆکەشدا نامێننەوە. نە چەمکی ماکدۆناڵد و نە چەمکی جیهاد و نە چەمکی دیموکراسیەت و نە چەمکی ڕێزگرتنی جیاوازی چەمکی بێلایەن نین، هەریەکێکیان هەڵگری کۆمەڵێک دەلالەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری و ڕەمزییە، هەر یەکێکیشیان هەڵگری جۆرێک لە دەسەڵاتە کە پابەستی ئەوەیە تا چەند بەناو خەڵکدا بڵاودەبنەوە و تا چەند دەبن بە زمانی قسەکردنی ئینسان لەسەر خۆی و لەسەر جیهان و دیاردەکانی و تاچەندیش دەبنە گوتاری بەرگریکردنی خەڵک لە ئیرادە

و خواست و مافەکانیان. ڕاستییەکی ئاشکرایە کە دەسەڵاتی بیرۆکە و چەمکەکان زۆر جیاوازە لە دەسەڵاتی سەربازی و دەسەڵاتی ئابووری کۆمپانیا گەورەکان. هەندێک نووسەر دەسەڵاتێک کە لە چەمک و بیرۆکە و بەهاکانەوە پەیدادەبێت بە «دەسەڵاتی ناسک» (soft power) ناودەبەن، بەرامبەر بە دەسەڵاتی سەربازی و دەسەڵاتی ئابووری کە بە «دەسەڵاتی زبر» (hard power) ، ناودبرێن. یەکەمیان دەسەڵاتێکی هێمن و لەسەرخۆ و نەفەس درێژە، دووهەمیان دەسەڵاتێکی توند و پەلامەردەر و نەفەس کورتە. یەکەمیان ناپینرێت لەکاتێکدا دووهەمیان سەردێڕی هەواڵەکانە. ئەوەی لێرەدا شایانی گرنگپێدانە وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕاستییەیە کە دەسەڵاتە ناسکەکان، واتە دەسەڵاتی بیر و بۆچوون و چەمکەکان، یەکسان نین بە سفر. هەڵەیەکی گەورە دەکەین گرنگی ئەم دەسەڵاتە ناسکانە و ڕۆڵیان لە ڕەنگڕێژکردنی ئاسۆکانی چاوەڕوانی تاکەکەس و گروە و کۆمەڵگاکاندا فەرامۆشکەین. سەرچاوەی دەسەڵاتی ئەم بیرۆکانە لەوەدایە کە دەتوانن هەلومەرجێکی کولتووری و سیاسی و ڕەمزی بهێننەکایەوە کە بە چەمک و دەستەواژە و زمانی ئەو بیرۆکانە باس لە جیهان و کۆمەڵگا و کێشەکان بکات، کاریگەری گەورەیان هەبێت لەسەر ئەولەویاتی سیاسی و پێکهاتی کولتووری و زەمینەی ڕەمزی ئەو شوێنانەی تیایاندا بڵاودەبنەوە. ئاشکراشە ئەمڕۆ لە جیهاندا دەزگای جیاجیا هەن کە بەرگری لەم بیرۆکانە دەکەن و بڵاوبوونەوەی ئەو چەمکانە بە بەشێکی گرنگی کاری خۆیان دەزانن، لەوانەش ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ئەمنیستی ئینتێرناسیۆنال، (هیومان ڕایت وۆچ)، گرین پیس، پەرلەمانی جیهانی نووسەران، یەکێتی لاوانی نێودەوڵەتی و دەیان و سەدان دەزگای دیکە کە لە بەشە جیاوازەکانی جیهاندا ئامادەن. دەبێت ئەوەمان لە یادنەچێت کە هێزی هەندێک لەم ئۆرگانە ناحکومی و جیهانییانە لە هێزی زۆر دەوڵەت و حکومەتی لاواز گەورەترە و کاریگەریان لەسەر سیاسەتی جیهانی کاریگەرییەکە ناکرێت نەبینرێت.

بە کورتی ئەگەر تێزەی «هاوشێوەبوونی کولتووریی» ڕاستبێت و ئەو گریمانەیە هەڵەنەبێت کە دەڵێت کولتوورەکانی جیهان تا دێت لێکدەچن، ئەوکات ناکرێت ئەم لێکچوونە کولتوورییە کورتکەینەوە بۆ لێکچوونی ماکدۆناڵد و بە ئەمریکایبوونی جیهان لە مانا ئیستیهلاکییە نێگەتیڤەکەیدا، چونکە لەهەمانکاتدا بەهاکانی دیموکراسییەت و لێبووردن و ڕێزگرتنی جیاوازی و هتد..بڵاودەبنەوە و لەزۆر شوێنی جیهاندا لەپاڵ ماکدۆناڵد و وێنەکانی مادۆنا و

پۆپ میوزیکدا ئامادەن. بۆیە هەموو کورتکردنەوەیەکی لێکچوون و هاوشێوەبوونی کولتووریی لە جیهاندا بۆ بە ئەمریکاییبوونی جیهان جگە لەوەی هەڵەیەکی تیوری و مەعریفییە لەهەمانکاتدا گریمانێکی ئایدیۆلۆژیی ناڕاستە و مەبەستی سیاسی تایبەتی لەپشتە، نەک هەوڵدانێکی ڕاستەقینە بۆ تێگەیشتن لە جیهان.

ئەگەر ئەوەی لەسەرەوە باسمانکرد دیدی ئەو گروهە تیوریستە بێت کە پێیوایە پرۆسەکانی جیهانگیریی کولتوورەکانی جیهان بەرەو لێکچوون و هاوشێوەبوون دەبات، ئەوا گروهێک تیوریستی دیکە هەن کە ڕێک بە پێچەوانەی ئەم گروهەوە باس لەوە دەکەن کە جیهانگیری جیهان نەک بەرەو هاوشێوەبوون و وێکچوونی کولتووری نابات، بەڵکو بەردەوام بڕی جیاوازییە کولتوورییەکان گەورەتردەکات. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەشیان بەردەوام باس لە گەورەبوون و ئاوسان و بڵاوبوونەوەی هەمەلایەنی گوتاری شوناس و گوتاری ڕەسەنایەتی و گوتاری خۆماڵیبوون و گوتاری جیاوازی دەکەن و بەدەیان نموونە دەهێننەوە کە تیایاندا پێداگرتن لەسەر جیاوازییە کولتووری و بەهایی و ڕەمزی و شووناسییەکان کۆڵەکە کولتوورییە سەرەکییەکانن، نەک وێکچوون و هاوشێوەبوون. لەم دیدەدا جیهانگیری لەباتی ئەوەی جیهان لەڕووی کولتوورییەوە هاوشێوەبکات، جیاوازی دەکات، لەباتی ئەوەی یەک کولتوور بە جیهاندا بڵاوبکاتەوە چەندان کولتوور بڵاکوردەکاتەوە، لەباتی ئەوەی وێکچوون دروستکات پرۆسەیەکی گەورەی لێکنەچوون دەخاتەگەڕ.

لەم دیدەدا جیهانگیری پرۆژەی تاقە هێزێکی جیهانی نییە بەتەنها کە هەڵگری یەک کولتوور و یەک دین و یەک ناسنامە بێت و بیەوێت بە هەموو کونوقوژبنێکی گەردوندا بڵاویبکاتەوە، بەڵکو پرۆژەی کۆمەڵێک هێزی جیاوازە بە کۆمەڵێک کولتوور و بەها و شووناس و ستراتیژی جیاوازەوە. ئەم گروهە لە تیوریستان نکوڵی لەوە ناکەن کە جیهان بچووکبۆتەوە و سنوورەکان لاوازبوون و ناوچە جیاوازەکان لێکدی نزیکبوونەتەوە، بەڵام ئەمان دەرنجامێکی تەواو جیاواز لەم پرۆسەی بچووکبوونەوە و نزیکبوونەوەی بەشەکانی جیهان هەڵدەهێنجن. بچووکبوونەوەی جیهان لای ئەم تیوریستانە وێکچوون دروستناکات بەڵکو هەستکردن بە جیاوازبوون گەورەتر دەکات، چونکە ئەم بچووکبوونەوەیە هەلی بەراوردکاری گروپێک یان کولتوورێک یان شووناسێک لەگەڵ گروپ و کولتوور و

شـوناسـێکی دیکەدا گـەورەتر دەکـات. جـیـهـانگـیـری لەم دیدەدا دۆخـێک دروستدەکات کە تێیدا ئینسـان زیاتر هەست بە جیاوازییەکانی خۆی بکات، لەوە تێـبگات لەچیـدا لەوانی دی ناچێت و لەکـوێدا شـووناسـێکی هەیە جیـاواز لە شـووناسـەکـانـی دیکە. بەم مـانـایە جـیـهـانگـیـری چوارچێـوەیەکی گـەورەیە بۆ بەراوردکاری، ئەم بەراوردەش هەم ئەو لایەنانە ئاشکارادەکات کە ئێمە تیایاندا لەگەڵ ئەوانیدیدا هاوبەشـین، وەکچۆن ئەو لایەنانەش بەرجەستـەدەکات کە ئێمـە لەوانـی دی جیـادەکاتەوە. بە مـانایەکی دیکە بچووکبوونەوە و لێکنزیکبـوونەوە و توانای بەراوردکاریی هەموومـان ناکاتە کۆیلەی کولتووری کۆکاکۆلا و ماکدۆناڵد و ئێم تی ڤی، وەک هـەندێک تیـوریـست بەهـەڵە بـانگێـشـەی بۆدەکـەن، بەڵکو دەمـانکاتە کۆمـەڵێک بوونـەوەری ووشـیـار و ئاگا بە هـەموو ئەو جـیـاوازییـانەی کەدەشێت لەوانیدیمان جیابکاتەوە. بێگومـان ئەم توانای بەراوردکردنە دەشێت دوو دەرەنجـامی تەواو جـیـاواز و بەیەک ناکـۆکی لێـبکەوێتـەوە. دەشـێت هەم دۆخـێکی کـولتـووریی دەوڵـەمـەند و کـراوە دروسـتـبکات، بەوەی کە کـولتـوور و شـووناس و پێناسـەکـان لە ڕێژەیبـوونی کـولتـووریی خـۆیان و ڕێژەییبـوونی بەهاکـانیـان تێـبگەن و لەمـڕێگەیەشـەوە لە ڕەگـە سـەرزەمـینی و مـێـژوویی و ڕەمزییەکانی خۆیان و کولتوورەکـانی دیکەش بگەن. بەم کارەش هەم لە سنوور و نووقسانییەکانی خۆت تێبگەیت و هەم لە سنوور و کورتهێنانەکانی ئەویدیش و دوادەرەنجامی لۆژیکی ئەم تێگەیشتنەش ببێتـە مـایەی کرانەوەی کـوتووری و بەهێـزبوونی خـەیاڵ و عـەقـڵانیـەتی لێـبووردن و ڕێژەگەرا لە بۆچوون و حوکم و هەڵسـەنگاندندا. بەڵام دەشـێت دەرەنجـامی دۆگـمـایی و تـوندڕەوە و ئوسـوڵی و ناسـیۆنالیـستی پەڕگـیـریش درووستـبکات. واتلێبکات خـۆت بە گـرنگتـرین و پیرۆزترین و بێـهەڵەترین کولتـوور و شـووناس و بەها بزانیت و دەرەوەی خـۆشت بە جاهیلیەت و تاریکستـان و عـەدەمیـەتێکی ڕەها. لە شـوێنێکی وەک ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا و لای هەندێک گروهی کۆمەڵایەتی تایبەت هەلومەرجێک دروستبووە کە ئەم بەراوردکارییە بە ڕەفزکـردنێکی ڕەها و سەرتاسەری ئەویدی کۆتاییدێت. لەڕاسـتـیـدا یەکـێک لە هۆکـارەکـانی لەدایکبـوونی توندڕەوی ئەم پرۆسـەی بەراوردکارییەیە کە لە نزیکبوونەوە و نەمانی مـەسافەوە لەدایکبووە. بەم مـانایە ئوسـولیـەتی ئیـسلامی، لە ئاسـتـێک لە ئاسـتـەکـانیدا، بەرهـەمی ئەم پرۆسـەی بەراوردکاری و لێکدینزیکبـوونەوە و پێداگرتنە پەڕگـیرەیە لەسەر جیـاوازی. لەم ڕەوتەدا ئوسـولیـەت بریتـیـیـە لە بەڕەهاکـردنێکی دۆگـمـاییـانەی شـووناس و

تایبەتمەندێتی و خۆماڵیبوون وکولتوور و ئاین و کۆمەڵگا، تا ڕادەی سڕینەوەی ئەویدی و فڕێدانی بۆ دەرەوەی هەر توانایاکەی وێکچوون و هاوشێوەبوون و لێکتێگەیشتن. بەکورتی نزیکبوونەوە لەم دیدە تیوریەدا مەرجنییە لێکچوون دروستبکات بەڵکو دەشێت هەستکردنێکی بەهێز و هەمەلایەن بە لێکنەچوون دروستبکات.

خاڵێکی دیکەی گرنگ لە ڕەخنەگرتن لە تێزەی هاوشێوەبوون و لێکچوونی کولتووریدا، بازدانی ئەم تێزەیە بەسەر ئەو ڕاستییە ئەنترۆپۆلۆژیەدا کە پێماندەڵێت ئینسان بوونەوەرێکی ڕاڤەکەرە، کەسێکی هێرمۆنتیکییە و هەرچییەک دەچێتە ناو جیهان و خەیاڵ و دەرونییەوە، سەرلەنوێ ڕاڤەدەکرێتەوە و لە چوارچێوەی پێدراوە کولتووری وسیاسی و کۆمەلایەتی و دەرونی و ڕەمزییەکانی خۆیدا مانا و دەلالەت و پێناسی دی وەردەگرێت. هەر کۆدێکی کولتووریی گەردوونیی کە لە بەشێکی زەوییەوە بۆ بەشێکی تری زەوی دەگواسترێنەوە، دەچێتە ناو ئەو ڕاڕەو و هەلومەرج و سیستمی ڕاڤەکردنە لۆکاڵییانەوە کە لە شوێنە جیاجیاکاندا ئامادەن و لەوێدا سەرلەنوێ پێناسدەکرێتەوە و ڕاڤەدەکرێت و مانای نوێ وەردەگرێت جیاواز لە مانا کۆنەکانی یان جیاواز لە ماناکانی لە شوێنەکانی دیکەدا. لێرەوە هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر بە ڕەهایی قسە لە لەیەکچوونی کولتووری و هاوشێوەبوون بکەین، ناتوانین چاو لەو ڕاستییە بنووقێنین کە ئینسان بوونەوەرێکی ڕاڤەکەرە و ناتوانین بازبدەین بەسەر ئەو هەموو پرۆسە ئاڵۆزانەی لێکدانەوە و ڕاڤەکردن و خوێندنەوەدا کە لە لۆکاڵەکاندا درووستدەبن. هیچ ئیکۆنێکی کولتووری نییە لە هەموو جیهاندا هەمان مانای هەبێت. هەموو یاسا و بەها و نۆرمە گشتییەکان، هەموو ئیکۆنە کولتوورییەکان و هەموو تێکستەکان لەژێر کاریگەری هەلومەرجە ناوچەییەکاندا سەرلەنوێ پێناسدەکرێنەوە و دەخوێندرێنەوە و ماناکانیان گۆڕانیان بەسەردادێت. دوور نەڕوێن و ماکدۆناڵد وەک شوێنێک بۆ «خواردنی خێرا» بە نموونە وەرگرین. ماکدۆناڵد لە ئەمستردام مانایەکی هەیە جیاواز لەو مانایەی لە تاران یان لە عەماندا هەیەتی، لە ئەمستردام شوێنی خواردنی خێرا و هەرزانە و بەگشتی منالان و گەنجان ڕووی تێدەکەن، کەچی لە عەمان و لە تاران شوێنی کۆبوونەوەی کەسانی سەر بە چینە دارا و بەتواناکانی ئەو کۆمەڵگایەن و کۆبونەوەیان لەو شوێنەشدا هێمایە بۆ توانای ئابووری و مەقامی

کۆمەڵایەتییان. بەمانایەکی دیکە ئەگەر ماکدۆناڵد لە ئەمستردام زیاتر دەربڕی کولتووری گەنج و مناڵ بێت، ئەوا لە تاراندا هۆکارێکە بۆ خۆجیاکردنەوەی کولتووری هێزە دەوڵەمەند و داراکان لە نەدارانی ئەو وڵاتە. لە فەرەنسا ماکدۆناڵد ڕەمزێکی ئەمریکییە و لەهەندێک شوێن و ئاستی تایبەتدا دژایەتی دەکرێت، لەکاتێکدا لە ئەمستردام شوێنێکی تایبەتی خواردنە لەپاڵ دەیان و سەدانی دیکەدا، لە عەمانیش ڕەمزی ژیانی مۆدێرن و دەوڵەمەندبوونە.

وەک گوتمان ئەم فرە مانایی و فرە ڕاڤەییە لەو ڕاستییە ئەبستمۆلۆژییەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئینسان بوونەوەرێکی ڕاڤەکەرە، گروھ و هێزە کۆمەڵایەتیەکانیش گروھ و هێزی ڕاڤەکەرن، هیچ گروپێک نییە چ لەناو خۆیدا و چ لە پەیوەندییدا لەگەڵ ئەوانیدیکەدا جیهان و کۆمەڵگا و تێکستەکان ڕاڤەنەکات، ئەم ڕاڤەکردنانەش دابڕاو نین لەو چوارچێوە فیکری و سیاسی و ئەخلاقییە کۆن و تازانەی ئامادەن و دروستدەبن. ئینسان بوونەوەرێکی هێرمۆنۆتیکییە و ئەم بوونەشی وایلێدەکات هەمیشە لەناو لێکچووندا جیاوازی و لەناو جیاوازیدا لێکچوون ببینێت، بۆیە ناکرێت لە ڕووی ئەبستمۆلۆژییەوە قسە لە لێکچوونی کولتووریی و هاوشێوەبوونی سەرتاسەری جیهان بکەین. بێگومان ڕەمزەکان بەجیهاندا بڵاودەبنەوە، تێکستەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەڕۆن بەڵام لە هەر سیاقێکدا مانایەکی تایبەت وەردەگرن و لەهەر شوێنێکدا بەشێوازێکی تایبەت لێکدەدرێنەوە.

خاڵێکی دیکەی کە دشێت دژ بە بۆچوونەکانی تێزەی هاوشێوەبوونی کولتووری بەرزبکرێتەوە ئەو ڕاستییەیە ئەوەی بەجیهانی دەبێت تەنها کولتووری ئەمریکی یان فەرەنسی یان ئەڵمانی نییە، بەڵکو کولتووری هیندی و ئەفغانی و ئێرانیشە. چەند بە ئەمریکایبوون بە جیهانی دەبێت ئەوەندەش ئوسولیەتی ئاینی بە جیهانی دەبێت، وەکچۆن بەندەکانی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ بە جیهانی دەبن و لەم سەری جیهانەوە بۆ ئەوسەری جیهان دەڕۆن، ئاواش بۆچوونە ئاینییەکانی گروپی ئەلقاعیدە و وێنەکانی ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیریش بەجیهانی دەبن. لە ڕاستیدا ئاین لە جیهانی ئەمڕۆدا بەهەمانئەندازەی ماکدۆناڵد و دیزنیلاند و کۆکاکۆلا بەجیهانیبووە، چ لە فۆرمی کۆچی بیرۆکە ئاینییەکاندا بە جیهاندا، یان لە فۆرمی ئەو تۆڕە لە ئۆرگان و ڕێکخراو و گروپی دینیدا کە لەهەموو شوێنێکی جیهاندا ئامادەن، چ لەفۆرمی

کتێب و کاسێت و وێنە و ڕەمز و شێوازی خواردن و شێوازی ئاژەڵ سەربڕین و هتد.. ئەم بڵاوبوونەوەیەش هەمەلایەنە هەم وڵاتێکی دەوڵەمەند و بەتوانای وەک ئەمریکا دەگرێتەوە هەم وڵاتێکی هێجگار هەژار و دواکەتووی وەک ئەفغانستانیش. ئەمەش وادەکات نەکرێت قسە لە مەسەلەی هاوشێوەبوونی کولتووری و مەسەلەی بە ئەمریکاییبوون بکەین، مەگەر ئامادەبین فێڵ لە خۆمان و لە زانست و لە خوێنەرەکانمان بکەین.

خاڵێکی دیکە کە گومانمان دەربارەی تێزەی وێکچوونی کولتووری لەلا دروستدەکات بەرهەمهێنانی کۆمەڵێک تەکنیکی کۆنترۆڵ و چاودێری و سانسۆری نوێیە کە بەشێوەیەکی ترسناک تواناکانی دەوڵەت و گروهە کولتوورییە داخراوەکان لە سانسۆردا قەبەدەکات، بەشێوەیەک ئەو شێوە جیهانەمان بیردەخاتەوە کە جۆرج ئۆرویل نیشانمان ئەدات. بە مانایەکی دیکە چەند تەکنیکی پەیوەندی ئازاد و کراوە لەگەشەکردن و داهێناندایە، بەهەمانئەندازەش تەکنۆلۆژیای کۆنترۆڵکردنی ئەم پەیوەندییانە و سانسۆرکردنیان ئامادەن. لە چین دەوڵەت هێڵەکانی ئینتەرنێت و ساتالایت و تەلەفۆن و تۆڕە کۆمپیوتەرییەکان کۆنترۆڵدەکات، ئەوەی لەگەڵ دیدی نوخبەی باڵادەستی ئەو وڵاتەدا نەگونجێت وەک مەترسییەکی سیاسی و کولتووری سانسۆردەکرێت، سەدام حوسەینیش بەر لە کڕینی تۆڕەکانی ئینتەرنێت تەکنیکەکانی سانسۆرکردنی ئەو تۆڕانەی کڕی، تاڵەبان و هێزە ئیسلامییە توندڕەوەکانی کوردستانیش ئامرازە تەکنۆلۆژییە نوێکان یاساغدەکەن. هەموو ئەمانە وادەکات سنووری کاریگەری ئاڵۆگۆڕی ئازادی وێنە و فیکر و زانیاری بەو ڕادەیە کراوە نەبێت کە هەندێکجار باسی لێدەکرێت.

لەهەموو ئەمانەش گرنگتر هەڵەی سەرەکی تێزی هاوشێوەبوونی کولتووری لەوەدایە کە دیدێکی ناڕاست و نادروست و نەگۆڕی بۆ چەمکی کولتوور هەیە. لەم دیدەدا کولتوور گشتێکی کامڵ و داخرا و بێپەیوەندی و خۆژێنە، پێکهاتێکە جیاواز لە پێکهاتەکانی دیکە و سیستمێکە لەناو خۆیدا کاردەکات و بێپەیوەندیە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا . ئەمە لەکاتێکدا سادەترین زانیاری ئەنترۆپۆلۆژیای کولتوور پێماندەڵێت کولتوور سیستمێکی داخراو نییە و هەرگیز پەیوەندی کولتوورێکیش بە کولتوورێکی دیکەوە یان کاریگەری کولتورێک لەسەر کولتوورێکی دیکە، پەیوەندییەکی یەکلایەنە و کاریگەرییەکی یەکجەمسەری

نەبووە و نییە،.کولتوور شەقامێکی یەکسەری نییە هەمووان ناچارکات بەهەمان ئاراستەدا بڕۆین و نەتوانین لێی لابدەین و ڕێگای خۆمان دروستبکەین. ئامێری کۆپیکردن نییە هەموو ئینسانەکان وەک یەک کۆپیبکات. کولتوور بوونێکی کراوەی پڕناکۆکی و فرەڕەنگ و فرە ڕەمز و فرە جیاوازییە، پێکهاتێکە دەگۆڕێ و تازەدەبێتەوە و دەسکاری دەکرێت، تاکەکەس و گروهە جیاوازەکان تێگەیشتنی جیاوازیان بۆ کۆد و بەها و ڕەمزەکانی هەیە. هەموو ئەمانەش دەشێت ئەمڕۆ مانایەکیان هەبێت و سبەینێ مانایەکی دی و لە ڕوبووردووشدا مانایەکی تریان هەبووبێت. کاریگەری کولتووریش کاریگەرییەکی چەند لایەنە و فرەڕەهەندە، تێدا هەموو ئەوانەی بەشداری گۆڕینەوەی مانا و پێناس و کۆدە کولتوورییەکان دەکەن، گۆڕانیان بەسەردادێت. لە ڕاستیدا یەکێک لە کێشە گەورەکانی جیهانگیریی کولتووریی ئەوە نییە جیهان بە ئەمریکایی دەبێت و کولتووری ڕۆژئاوا بە جیهاندا بڵاودەبێتەوە، بەڵکو زیندوبوونەوەی کولتووری سەدەکانی ناوەڕاست و زیندوبوونەوەی شوناسی ئاینی و شوناسی ئەتنی داخراوە کە لە فۆرمی بزوتنەوەی سیاسی چەکدار و پەلاماری توندوتیژدا خوێنێکی زۆریان لە بەر دەرگاکانی سەدەی بیستویەکەمدا ڕژاندوە. وەکچۆن ئوسولیەتی ئیسلامی لای ئێمە، لە ئاستێکی تایبەتدا، کاردانەوەیەکی کولتووری و سیاسی نەخۆشە بەڕووی جیهانگیریدا، ئاواش لەناو ڕۆژئاوا خۆشیدا زیندوبوونەوەی ڕاسیزم و فاشیزم و نازیزم یەکێک لە پەرچەکردارە پەڕگیرەکانن بە ڕووی جیهانگیریدا و بەزۆر ماناش پەرچەکردارێکی کولتوورین.

سەرەڕای ئەم ڕاستییانە جیهانگیری لە دوو شارێگای سەرەکییەوە بە ئوسولیەت و دۆگماتیزمی کولتووری ناکۆکە. وەک ووتمان، جیهانگیری لە سەرێکەوە و لە ئاستێک لە ئاستەکاندا هەلومەرجی وێکچوونێکی گەردوونی دروستدەکات، لە سەرێکی دیکەوە هەستێکی گەورە بە جیاوازی و ڕێژەییبوون بەرهەمدەهێنێت. لۆژیکی ئوسولیەتی کولتووری و ئوسولیەتی دینی، کە لەسەر بەرگرییەکی پەڕگیر لە تایبەتمەندێتی دروست بووە، ئەم دۆخی وێکچوونە قبووڵناکات و تا سنووری بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژ و پەنابردنە بەر تیرۆر دەڕوات. ئوسولیەت لەنێوان «تایبەتمەندێتی» خۆی و «وێکچوونی» کولتووریی جیهاندا، کە بەشێکە لە پرۆسە ئاڵۆزەکانی جیهانگیری، ناکۆکییەکی گەورە و بێچارەسەر دروستدەکات کە بوونی یەکێکیان لەسەر مەرگی ئەویدیان

کاردەکات. واتە ئەگەر جیهانگیری یەکسانبێت بە وێکچوونی کوتووری، ئەوا ئوسولیەت بەم وێکچوونە ناکۆکە.

لەسەرێکی دیکەوە جیهانگیری پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەرهەمهێنانی جیاوازی و ڕێژەییبوونە. جیهانگیری ئەو ڕاستییە بۆ تاکەکەس و گروھ و کۆمەڵگاکان ئاشکرادەکات کە جیهان گەورەترە لە سنووره داخراوەکانی ئاین و کولتوور و شوناسی هەر هێزێک بەتەنها. جیهانگیری نیشانمانئەدات لە دەرەوەی هەقیقەتەکانی ئێمەدا هەقیقەتی دیکە و لە دەرەوەی سیستمی ئەخلاقی ئێمەدا سیستمی ئەخلاقی دیکە و لە دەرەوەی کتێبە پیرۆزەکانی ئێمەدا کتێبی پیرۆزی دیکەش هەن. ئەم ڕاستییانەش هەڵگری داوەتکردنێکی فیکری و کولتووری و ئەخلاقی ناڕاستەوخۆن بۆ ڕێژەییبوون لە تێڕوانین و مانا و وێناکردنماندا بۆ هەقیقەت و کولتوور و شوناس. ئوسولیەت ئەم ڕێژەگەرایيەیە قبووڵ ناکات و وەک هەڕەشەیەکی کوشندە بۆسەر یاسا و بەها و نۆرمە ڕەهاکانی خۆی دەیبینێت، ئەمەش وایلێدەکات خۆی بە تاقە سەرچاوەیەکی ڕاستی و پیرۆزی و ڕۆحانییەت بزانێت.

هەڵەی سەرەکی لەوەدایە جیهانگیری وەک پرۆژەی تایبەتی دەوڵەتێک یان چەند دەوڵەتێک ببینین، پێمانوابێت ئەوانەی لە پشتی پرۆسە ئاڵۆزەکانیيەوە وەستاون کۆمەڵێک کۆمپانیا و سیاسەتمەدار و حکومەتی پیلانگێڕن، دەستەیەک خەڵکی شەڕانگێز و هێزی خراپەکارن کە جیهان وەک دەخیلەیەک مامەڵەدەکەن، باندێکن دەخوازن کولتوور و کۆمەڵگا و ئاین و ئابووری و دەوڵەت و بزوتنەوە سیاسییەکانی ناوەوە و دەرەوەی ڕۆژئاوا تێکبدەن. جیهانگیری پرۆسەیەکی ئاڵۆز و پڕ ناکۆکی و فرە ڕەهەندە، لە ئێستادا سەرلەنوێ جوگرافیای سیاسی و پێدراوە ئابووری و پێکهاتە کولتورییەکانی جیهان ڕێکدەخاتەوە. بێگومان لەم پرۆسەیەدا هێزی لاواز و هێزی بەهێز هەیە، هەیە ئامادەیە بۆ بەشداربوونێکی چالاک تیايدا و تا ئەو شوێنەش دەڕوات واز لە پارەی نەتەوەیی خۆی بهێنێت، وەک ئەوروپییەکان، هێزی دیکەش هەن نەک ناتوانن و نایانەوێت تێیدا بەشداربن، بەڵکو کۆمەڵێک کتێبێکی پیرۆز و چەند دەقێکی ئاینی کۆن و چەند دیدێکی دۆگامیی تازە بەڕووی جیهاندا بەرزدەکەنەوە و لە هەموو شوێنێکدا فەتوایەک و دۆگمایێک و هەڕەشەیەک لە ئینسان و بوون و ژیان دەچێنن. ئەمانە بەناوی پاراستنی ڕەسەنايەتی کولتووری و پاراستنی شەرەف و بەرگری لە ڕێز

و بەها و پیرۆزییەوە هەموو شتێک ڕەتدەکەنەوە کە لەگەڵ پێناسە سادەکانی ئەواندا بۆ جیهان یەکنەگرێتەوە، بەمەش گەشە بە دیدێکی ترسناک دەدەن کە لە مێژووی کۆن و هاوچەرخدا جگە لە فاشیزم و هاوشێوەکانی هیچی دی لێ سەوزنەبووە.

بێگومان ناکرێت ببیت بە بەشێک لە جیهانی هاوچەرخ و هەندێک شت نەدۆڕێنیت، دەسکاری چەند ڕەهەندێکی شووناسی خۆت و شوناسی گروهـ و شوناسی کۆمەڵگاکەت نەکەیت، لە ترس لە جیهانەوە نەپەڕیتەوە بۆ بوون بە بەشێک لە جیهان، لە بوونەوەرێکەوە ڕق لەویدی بیجوڵێنێت نەبیت بە بوونەوەرێک ئامادەبیت لەگەڵ ئەویدیدا لە جیهانێکی ئارمدا بژیت و لەودیو سنوورەکانی ڕقەوە تەماشای ئەوانە بکەیت کە لەخۆت جیاوازن. جیهانگیری فشاری تایبەت دەخاتە سەر کۆمەڵگا و گروهـ و تاکەکەسە جیاوازەکان، هەموو ئەو مەترسییانە زیندوو دەکاتەوە کە بەدرێژایی مێژوو هاوڕێی ئینسان بوون، مەبەستم مەترسی لەدەستدانی ماڵ و ئارامی و وێنە و پێناسە باو و بالادەستەکان. بەلام لە هەمانکاتدا کۆمەڵێک ئەگەری گەورەش بۆ تازەبوونەوە و خوێندنەوە و بەخۆداچوونەوەی ڕەخنەیی پێشنیاردەکات، هەلی تازەکردنەوەی ماڵ و تازەکردنەوەی کولتوور و تازەکردنەوەی بینایی و شووناس دەبەخشێت. پرسیاری سەرەکی ئەوەنییە چۆن خۆمان لە جیهانگیری لابدەین، چۆن خۆمان لە دین و ناسیۆنالیزم و تایەفەگەرایدا بشارینەوە. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە چ وەلامێکی تەندروست بە فشارەکانی جیهانگیری بدەینەوە؟ ئایا بۆ دین بگەڕێینەوە، لاپەڕەی کتێبە پیرۆزەکان هەڵدەینەوە و بەدوای نەسیحەتی سۆفییەکانی ناو مێژوودا وێڵبین، قسە لە پێکدادانی شارستانیەت و کولتوورەکان بکەین، بەشێوەیەکی غەیبی ئەمیان بکەینە ئەلتەرناتیڤی ئەویدیان، پروپاگەندە بۆ جەنگاوەریی و شەرەف و ئازایەتی بکەین، بەرگری لەبەهاکانی پاتریارکیەت بکەین و پێمانوابێت جیهان دین دروستیدەکات. یاخود خۆمان ئامادەکەین بۆ چوونە ناو ئەم جیهانە تازە و ئاڵۆز و پڕ ڕیسکەوە کە دەمانخاتە ناو پرۆسەی جوڵە و گەڕان و سەفەرێکی بەردەوامەوە بەدوای مانا و هەقیقەتە گۆڕاوەکاندا، ناچارماندەکات بەردەوام لە خۆمان و ماناکانمان و ویستەکانمان ڕامێنین و سەرلەنوێ ڕاڤەیانبکەینەوە، لە تەحەداکانی بگەین و ئەگەرە باشەکانی گەورەترکەین و لەو شوێنانەشدا کە مەترسیدارە قایمبین بەرامبەری و هەوڵبدەین مەترسییەکانی تێپەڕێنین.

پرسیار ئەوەیە ئایا ئامادەین بە سیستمی خوێندن و کولتوور و بەرهەمهێنانی مانادا بچینەوە، سیاسەتی داخران و قۆزاخەکاری، سیاسەتێک بە عەقڵی خێڵ و گەرەک و چەند دەقێکی ئاینی بەڕێوەبچێت، رۆشنبیرییەک رق بیبات بەڕێوە و لە گرێی سایکۆلۆژی تاکەکەسی و کۆییەوە دەستپێبکات، بگۆڕین بە سیاسەتێکی کراوە بەرووی ژیان و ئینسان و جیهاندا، دەسەڵاتێکی خەمخۆر دروستکەین، سەروەت و سامانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەشکەینەوە، پایەکانی فرەدەنگی و دیموکراسیەت بەهێزبکەین، یاسا بۆ ململانێی کۆمەڵایەتی و ئابووری دابنێین، میدیا ئازادبکەین، رێزی ئینسان و بیروبۆچوونەکانی بگرین، بەئاین بڵێین ژیان نەخوات، سنوورێکی یاسایی بۆ دەسەڵاتی فەتواچی و دۆگمای کۆنەپارێزەکان دابنێین. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە ئایا کۆمەڵگای ئێمە و سیاسییەکان و رۆشنبیرانی ئامادەن بەم ئاستانەدا کاربکەن، یان بەپێچی نەڵەمێک جیهانگیری بە ئەمریکاییبوون یەکسانبکەین و بە ئەمریکاییبوونیش وەک جەهەنەم و خراپەکارییەکی رەها وێنابکەین، رۆژئاوا بەڕاست و ناڕاست تاوانباربکەین و بۆ ساتێکیش نەوێرین مێژوو و کولتوور و پیرۆزییەکانی خۆمان رەخنەبکەین و بانگەشە بۆ توندڕەوی و سادەگۆیی و پیرۆزییەکی دۆگمایی بکەین و حەوزە و حوجرە دینییەکان بکەینە ئەلتەرناتیڤی زانکۆ مۆدێرنەکان.

خراپترین رەخنە لە جیهانگیری ئەو رەخنانەن لە هەڵوێستی قوربانییەوە دەنووسرێن، لەم جۆرە رەخنانەدا جیهان وەک جەنگەڵێک وێنادەکرێ و خودیش وەک کەروێشکێکی بێگوناهی ناو ئەو جەنگەڵە. دەشێت وێناکردنی خود وەک قوربانی جیهانگیری و وەک قوربانی رۆژئاوا و وەک قوربانی سیاسەت و هێرش و غەزای کولتووری ئەمریکی و غەیرە ئەمریکی، هەندێک گرێی سایکۆلۆژی ئارامبکاتەوە و سوکنایەکی رۆحی کەمخایەنی بێبناغە ببەخشێت، بەڵام ناتوانێت کێشە راستەقینەکانی ناو واقیع ببینێت و بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانێت بیر لە چارەسەرەکانیان بکاتەوە. ئەگەر بەهەڵە جیهانگیری وەک بە ئەمریکایکردنی جیهان ببینرێت، ئەوکات چارەسەرە ئەم هەڵەیە، تا ئێستا بریتییە لە گەڕانەوە بۆ ئاین و بۆ کولتوور و بۆ رەسەنایەتییەکی گریمانکراوی کۆنەپارێز و بێمانا. دژایەتیکردنی بەئەمریکایبوونی جیهان تا ئێستا لەفۆرمی قسەگوتن بە ئەمریکا و مەدح و سەنای رابووردوویەکی دینی بەملاوە نەهاتووە، لانیکەم لای ئێمە. هەندێکجار قسەوتن بە ئەمریکا پەرەی سەندوە بۆ قسەوتن بە

مـۆدێرنه و ڕۆشـنگەری و لیـبـرالیـزم و دیموکـراسـیـەت و چەندان دەسکەوتی گـەورەی دیکەی مـێـژووی هاوچەرخی مـرۆڤـایەتی، هەمـوو ئەمـانەش لەپاڵ گوتارێکی دینیدا کە بە فاشیزم نزیکە تا بەهەر شتێکی دیکە.

لەم دیدەدا هەڵاتن لە ماکدۆناڵد مانای چوونە ژوورەوەیە بۆ خـێـمەی خوێناوی جـیـهـاد و هەڵاتن لە ئەمـریکا نیـشـتـەجـێـبوونە لە سـەرزەمـینی بێـفـیکری و نادیموکـراسییـانەی فەتوادا. بێگومـان ڕەخنەکـردنی ئەمریکا وەک گـەورەترین هێـزی سیاسی سـەر ئەم ئەسـتـێرەیە کـارێکی گـرنگە، ڕەخـنەکـردنـی هەندێک ڕەهەندی کـولتووری کـۆمـەڵگای ئەمـریکی پێویستن، ڕەخـنەکـردنی سـیـاسـەتی دەرەوەی ئەم زلهێزە هێجگار پێویستە، بەڵام ئەم کارانە جیاوازن لە نەخۆشی دژایەتیکردنی ئەمـریکا، (ئەنتی ئەمریکانیزم)، کە ڕەگەکانی لەناو سایکۆلۆژیای هێـزە چەپەکـانـی سـاڵانی شـەست و هەفـتـا و سـایکۆلۆژیای هێـزە ئوسـولی و توندڕەوەکـانی ئەمـڕۆ و سـایکۆلۆژیای کـۆمـەڵێک ڕۆشنبـیری دۆگـمـایی و دینی پەڕگیردایە. من لێرەدا مـەودای قسـەکردنم لەسـەر دیاردەی ئەنتی ئەمریکانیزم نییە، بەڵام دەبێت ڕەخنەکردنی هەندێک لە ڕەهـەندە ئیمپریالییەکانی سیاسەتی ئابوری و سـەربازی دەرەکی ئەمـریکی لە جیهاندا جیابکەینەوە لە ڕەخنە لەوەی پێیدەگوترێت سـیـسـتـمی کولـتووری و سـیـسـتـمی سیاسی ئەمریکی بەگشتی. دەبێت ئەنتی ئەمریکانیزم و ڕەخنەی مێژوویی و زانستی ئەمریکا تێکەڵنەکرێن. تێکەڵکردنی ئەم دوولایەنە تێکەڵکردنێکی ئایدیۆلۆژییە و نابینایـیەکی مێژوویی گەورە لە پشـتـییـەوەیە و هێـماش بۆ هـەژارییەکەی فیکری و مـیـتۆدی دەکات لە تێگەیشتن لە ئاڵۆزییەکانی کۆمەڵگا و کولتووری ئەمریکی.

ڕەنگە گـرنگتـریـن خـاڵێک ناچاربین لە ڕەوتی کـۆمـەڵگای کـوردی و لە ڕەوتی کۆمەڵگا دراوسێکانماندا لەسـەری بوەسـتین بریتیـبێت لە چۆنیەتی ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییـەی لەنێوان ئاین و جیـهانگیریدا دروسـتـدەبێت. بە مـانایەکی دیکە پرسـیـاری سـەرەکی لە ئاسـتی بەجـیـهـانیـبوونی کولتووریدا ئەوەیە چۆن ئاین و مـۆدێرنە لەگـەڵ یـەکدا و لەپاڵ یەکدا ئامـادەبن، چی بەیـەک بدەن و چی لەیەکدی بسـەننەوە، کـام هـاوکێشـەی ئەخـلاقی و سیاسی و یاسایی ئەم دووانە بەیەکەوە گـرێبـدات؟ زەحـمـەتـە لێـرەدا وەڵامـێکی تـەواو بەم پرسـیـارانە بدەینەوە، بەڵام دەتوانین بڵـێین هەمـوو پێـشنیـارکـردنێکی ئاین وەک ئەلتـەرناتیـڤی مـۆدێرنە و هـەمـوو بەگـژاچوونەوەیەکی ئاین بۆ بنەمـا سـەرەکییـەکـانی مـۆدێرنە، جگە لە

تاریکی و جەنگ و جەهل هیچی دی لێ سەوز نابێت. بەڵام موتوربەکردنی ئاین بە مۆدێرنە، یان وردتر بدوێین گواستنەوەی دەسەکەوتە یاسایی و سیاسی و فیکری و کولتوورییەکانی مۆدێرنە بۆ ناو ئاین و تازەکردنەوەی ئاین لە ناوەوەڕا لەپاڵ ئەم دەسکەوتانەدا، دەروازەیەکی ڕاستەقینەی چوونە ژورەوەی هەر کۆمەڵگایەکە بۆ جیهانی نوێ و دەروازەیەکی گرنگی هاتنە ژورەوەی شارستانییانەی ئاینە بۆ ناو جیهان. لەو شوێنانەدا کە ئاین شەرعیەتی مۆدێرنە دەخاتە ژێر پرسیارەوە دەبێت چاوەڕوانی مۆدێلی تاڵەبانانەی ئاین بکەین، بەڵام لەو شوێنانەدا کە ئاین بەهاکانی مۆدێرنە وەردەگرێت دەشێت هاتنەکایەی شێوازێکی نوێی مەحەبەتی ئاینی ببینین کە قووڵاییەکی تایبەت بە ژیان و ئینسان و جیهان بدات. تا ئەم ساتەی ئێستاشمان ڕەخنە هەرە قووڵەکان لە مۆدێرنە لەناو چوارچێوە و پێدراو و گریمانەکانی مۆدێرنە خۆیەوە هاتوون، ڕەخنە لە مۆدێرنە بە نیازی خۆلادان لە مۆدێرنە و کردنی دین بە ئەلتەرناتیف بۆ مۆدێرنە، ڕەخنەیە بە عەقڵیەت و خەیاڵ و ئەبستمۆلۆژیای بەر لە مۆدێرنە. ئەمەش ئەو فۆرمە ناشیرینەی کۆنزەرڤاتیڤیزمە کە لەدوا دەرەنجامدا شەڕێکی فاشییانە لەگەڵ ژیان و جیهاندا بەرپادەکات.

هیچ هێزێک نییە لە جیهاندا ئەوەندیە فاشیزم عاشقی سادەگۆیی بێت، فاشیزم لەسەر سادەکردنەوەیەکی ترسناکی ماناکانی کۆمەڵگا و سیاسەت و جیهان و شووناس و فیکر و کولتور و شتەکانی دی دەژی. ئەم ووتارە هەوڵدانێکی بچووک بوو بۆ بەگژاچوونەوەی ئەو سادەگۆییەی کە فاشیزمی نوێ لە بەرگە دینییەکەیدا هەڵگریەتی لەڕێگای گەڕاندنەوەی بڕێک لە ئاڵۆزی بۆ جیهان، بەتایبەتی بۆ ئەو چوارچێوە ئاڵۆزەی ئەمڕۆکە بەناوی جیهانگیرییەوە ئامادەیە و بە مانایەک لە ماناکان هەمووومان لەناویدا ئامادەین. لەمەش بترازێت هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە ئاڵۆزییەکانی جیهان ببینێت، کورتکردنەوەی جیهان و کولتوور و شارستانیەتەکان بۆ سیمبولی سادە بەرلەوەی تاوانێکی کولتووری بێت تاوانێکی ئەخلاقییە، ئەوانەشی جیهان کورتدەکەنەوە بۆ دوو جەمسەری ناحەز و دژ بەیەک و یەکێکیان دەکەنە ئەلتەرناتیڤی ئەویدیان، یەکێکیان بە موتڵەقی بە خراپەکار و ئەویدیان بە موتڵەقی بەباش لە قەڵەم ئەدەن، گەمەیەکی ترسناک دەکەن کە بۆناو ڕۆژگارە تاریکەکانی مێژووییەکی خوێنینمان دەباتەوە.

## سەرچاوەکان

1-Robertson, Ronald, Glocalization: Time-Space and Homogeneity-Hetrogeneity.in:Global Modernities. ed Mike Featherstone, Scott Lash and Ronald Robertson. Sage London 1995.

2- Featherstone &La,h. Globalization, Modernity and the spatialization of social theory: an introduction. in:Global Modernities. ed Mike Featherstone, Scott Lash and Ronald Robertson. Sage London 1995

3- Barber, Benjamin, Jihad vs. McWorld, Times Books, 1995.

4- Huntington, Samuel P., The clash of Civilizations? from Foreign Affairs, Vol.72,No.3, 1993.

5- Lechner, FrankJ. & Boli John, The Globalization Reader, BlackwellPublishers USA 200.

# جیهان لەدوای ۱۱ سێپتێمبەرەوە؟؟؟

## ۱. سەرەتا

هێشتا زووە قسە لە دەرەنجامە جیاوازەکانی ڕووداوی ۱۱ سێپتێمبەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەین، زووە بزانین ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازییانە چین ئەم ڕووداوە لە ئاستی دوورخایەندا لەبەشە جیاجیاکانی جیهاندا دەیانهێنێتەکایەوە. ئەوەی لەم ساتەدا لێی دڵنیایین ئەو ڕاستییەیە کە ۱۱ سێپتێمبەر دواهەمین دەرگاکانی سەدەی بیستەمی داخستوو و بەشێوەیەکی تراژیدیانە و چاوەڕێنەکراو فڕێیداینە ناو سەدەی بیست و یەکەمەوە. زۆربەمان پێشبینی ئەم سەرەتا تراژیدیەمان بۆ سەدەی بسیت و یەکەم نەدەکرد، چاوەڕوانی ئەوە نەبووین لە دەروازەی جەنگێکی تایبەت و بێوێنەوە بچینە ناو سەدەیەکەوە کە چاوەڕوانی زۆرمان لێی هەیە.

ڕووداوەکانی ۱۱ سێپتێمبەر پەردەیان لەسەر جیهانێک هەڵدایەوە کە لە ناوەوەڕا لێوانلێوە لە ناکۆکی کوشندە و ڕقی خوێناوی و بێباکی دەرەوەی ویژدانێکی ئەخلاقییانە و لێکدیتێنەگیشتن و بەدگومانییەکی قووڵ و پڕ مەترسی و توندڕەویەکی لێوانلێو لە خوێن و تاریکی. جیهانێک ڕۆژ دوای ڕۆژ هێزی پڕ مەترسی و نابەرپرسیار و دژ بە جوانی و دژ بە ژیان بەرهەمدێنێت و ئەم هێزانەش هەموومان، لەم پەڕی زەویەوە بۆ ئەو پەڕی زەوی، بەرە و خەرەند و لێواری کارەساتی گەورە گەورە پاڵپێوەدەنێن. ۱۱ سێپتێمبەر پەنجەرەیەکی کردەوە کە دەڕوانێتە سەر زۆربەی ناشیرینییەکانی جیهانی ئەمڕۆ، لە ناشیرینییەکانی ئاینەوە بۆ ناشیرینییەکانی تەکنیک و لە ناشیرینیەکانی ئابوورییەوە بۆ ناشیرینیەکانی کولتوور و لە ناشیرینیەکانی هەژارییەوە بۆ ناشیرینییەکانی دەوڵەمەندی. لەدوای ۱۱ سێپتێمبەرەوە ناکرێت بە هەمان لۆژیکی بەر لە ۱۱ سێپتێمبەر لەسەر جیهان و کێشەکانی ئەم جیهانە بدوێین. ڕووداوێکی لەو بابەتە کۆمەڵێک نهێنیمان لەسەر جیهانێک بۆ ئاشکرادەکەن کە لێوانلێوە لە مەترسی.

یەکێک لەو مەسەلە گرنگانەی ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر ئاشکرایان کرد ئەو ڕاستییەیە کە ئێمە لە جیهانێکی بچووکدا دەژین. لە جیهانێکدا تێیدا هەمووان دراوسێ و هاوسایە و هاونشینی یەکترین و ئەوەندە لە یەکدی نزیکین هەرکەسێکمان بخوازێت دەتوانێت ژیانی ئەویدیکەمان ناشیرین و وێرانکا و زیانی کوشندە بە ئێستا و ئایندەی بگەیەنێت. ١١ سێپتێمبەر نیشانی داین شتێک نەماوە ناوی لێکدابڕان و دووری و داخرانبێت، گۆی زەوی وەک گشتێک بۆتە ماڵێکی گەورە کە دەشێت هەم وێرانیکەین و هەم بیکەینە شوێنی پێکەوەژیانێکی پڕ متمانە، دەشێت پرۆژەی جەهەنەمێکی لێدروستکەین و دەشێت بیکەینە باخێکی ئاسودە. ١١ سێپتێمبەر نیشانیداین چەند ئاسانە جیهان وێرانبکەین و ئینسانی سەر بە ئاین و نەتەوە و کولتوورە جیاوازەکان لەیەک باڵەخانەدا پێکەوە لەناوبەین. لە دوو قوللە وێکچوەکەی نیویۆرکدا نزیکەی شەش هەزار کەس کە سەر بە ٣٧ نەتەوەی جیاوازن لە ماوەی کەمتر لە کاتژمێرێکدا کوژران. ئەوانەی کوژران سەر بە ئاین و گروه و نەتەوەی جیاجیا بوون، لە نیشتیمان و وڵات و جوگرافیای جیاوازەوە هاتبوون. ١١ سێپتێمبەر نیشانیداین کە چیدی نەتەوە و کولتوور و ئاین و گروهی دوور لەیەک نەماون، نیشانیداین هەموومان نیشتەجێی یەک ماڵ و یەک خانوو و یەک شوێنین، ئەم ماڵەش ماڵێکی شووشەیی تەواو قابیلی تێکشکان و ڕمان و وردوخاشبوونە.«

فەیلەسوفی ئەڵمانی و باوکی ڕۆشنگەری (ئیمانۆیل کانت) زیاد لە دووسەد ساڵ لەمەوبەر مرۆڤایەتی لەو ڕاستییە ئاگادار کردەوە کە جیهان بەرەو بچووکبوونەوەیەکی بێوێنە دەڕوات، بەرەو ڕۆژگارێک تێیدا بێقانونیکردن و نایەکسانی و نا عەدالەتی لە بەشێکیدا کاریگەری ڕاستەوخۆ و کوشندەی بۆسەر بەشەکانی دیکەی دەبێت. پێشێلکردنی مافە ئینسانییەکان لە سوچێکیدا دەرەنجامی خراپی بۆ پاراستنی هەمان ئەو مافانە لە سوچێکی دیکەیدا دەبێت، سەربڕینی کولتووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کەرتێکیدا ناشیرنی سیاسی و کولتووریی و کۆمەڵایەتی لە کەرتەکانی دیکەدا دەخاتەوە. ١١ سێپتێمبەر سەلماندی ئەوەی لە ئەفگانستندا ڕوودەدات شتێک نییە تایبەت بە ئەفگانەکان و بە هیچ مانایەک تەنها لە سنووری ئەو وڵاتەشدا نامێنێتەوە. ئەتککردنی ژیان و پێشێلکردنی بەها ئینسانییەکان و گاڵتەکردن بە ئازادی لە کابولدا لێناگەڕێت نیویۆرک بە ئیسراحەت بنوێ، ئەوەی لە کشمیر ڕوودەدات درێژکراوەی لە

واشنتۆن دەبێ و ڕووداوەکانی سۆماڵ ناکرێت لە کەمپەکانی ئوسامە بن لادن لە ئەفگانستان دابڕین، یاسا ئابوورییە وەحشییەکانی وال ستریت بەهیچجۆرێک لە خۆپیشاندانە تووڕەکانی ئەندەنوسیا و پاکستان دابڕاونین. ١١ سێپتێمبەر نیشانیداین کە هێڵێکی نادیار کابول و نیۆیۆرک بەیەکەوە گرێدەدات، ناشیرینیەکانی بەشێکی جیهان ڕاستەوخۆ بە بەشەکانی دیکەی جیهانەوە دەبەستێتەوە. ١١ سێپتێمبەر سەلماندی یان ئەوەتە هەموومان لە ئاسایش و مافپەروەری و ژیانێکی پڕ کەرامەتدا دەژین یان هیچ کەسمان.

لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە جیهان لە هەمووکات بچووکترە.

## ٢- ١١ سێپتێمبەر و ڕستێک پرسیار

ژمارەی ئەو پرسیارانەی لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە کراون و بەبەردەوامیش دەکرێن هێجگار زیاترن لە ژمارەی ئەو وەڵامانەی کە ئامادەن. لە ساتەوەختی دارمانی هەردوو قولە بەرزەکەی مانهاتنەوە پرسیار دەربارەی زۆر شت و زۆر مەسەلە دەکرێت. پرسیار دەربارەی ڕەهەندە جیاجیاکانی جیهانی ئەمڕۆ، دەربارەی سەرچاوەکانی تێرۆر و تێرۆریزم، دەربارەی ئەو کێشە و گرفت و تەنگەژە ئابووری و سیاسی و کولتووری و ئاینی و شارستانییانەی جیهانیی ئەمڕۆیان کردۆتە شوێنی هێرش و پەلاماری لەوجۆرە، پرسیار دەربارەی ئاسایش و هەژاری و نەداری کۆیی بەشێکی گەورەی دانیشتوانی زەوی، پرسیار دەربارەی شووناسی ئاینی و شووناسی کولتووری و پەیوەندی نێوان ئاین و خوێن و دیموکراسیەت و مەترسی.

١١ سێپتێمبەر ماشێنێکی گەورەی پرسیارکردنی خستەگەڕ. لەم ووتارەدا من هەوڵئەدەم، زۆر بە کورتی، خوێنەری کورد لە سێ شێوازی تایبەتی پرسیارکردن ئاگادارکەمەوە کە پێموایە لە چەند هەفتەی ڕابووردودا لەزۆر شوێنی دنیادا و لەلایەن زۆر لایەن و هێزی سیاسی و ئاینی و کولتووری جیاجیاوە کراون و تا ئێستاش دووبارە و چەندبارە دەکرێنەوە. هەم پرسیارەکان و هەم ئەو وەڵامانەش کە پێیاندراونەتەوە ڕاستەوخۆ دەمانخەنە بەردەمی ئەو ئاڵۆزییە گەورەیەی کە جیهانی دوای ١١ سێپتێمبەری تێکەوتووە:

**١. کێن بکەرەکان و چین مۆتیڤەکانی ١١ سێپتێمبەر؟**

یەکەمین ڕست لەو پرسیارانەی لەم چەند هەفتەیەی دواییدا کراون پرسیارن دەربارەی شوناسی ئەو هێزانەی لە پشتی ئەم ڕووداوەوەن: کێن ئەوانەی کارە تیرۆریستییەکانی یازدەی سێپتێمبەریان پیادەکرد و ئامادەبوون گیانی خۆیان کۆتای پێبێنن و لەگەڵ خۆشیاندا کۆتایی بە ژیانی هەزاران کەسی دیکەی سەر بە ئاین و کولتوور و نەتەوەی جیاواز بهێنن بەبێئەوەی لەدوای خۆیانەوە بەیاننامەیەک، نووسینێک، دروشمێک بەجێبهێڵن بۆئەوانەی دەکەونە ناو دەرەنجامەکانی ئەم کارەساتەوە؟ ئەو عەقڵیەت و توانا ڕێکخراوی و تەکنیکییە کێییە کە کارێکی وا ورد و فرەلایەن و ئاڵۆز بەوپەڕی دیقەت و وریایی و وردەکارییەوە ئەنجامئەدات؟ کێن ئەوانەی خاوەنی ئەو خەیاڵە ئەهریمەنییەن کە کارێکی وا نەخشە دەکێشن و پیادەی دەکەن؟ مۆتیڤ و پاڵنەرەکانی ئەو کەس و لایانانە چین و کامانەن؟ ئایا دەخوازن لەڕێی ئەم کارەوە چی بڵێن و چ پەیامێک بە جیهان ڕاگەیەنن؟ بە کورتی و بە کوردی ئەوانەی ئەم کارەیان ئەنجامدا کێن و بۆ چ مەبەستێک ئەنجامیاندا؟

ئەگەرچی لە ئێستادا هەموو هێماکان ڕوویان لە هێزە توندڕەوە ئیسلامییەکانە و گروپەکەی بن لادن و ڕژێمی تاڵەبان ڕاستەوخۆ وەک بکەری ئەم کارەساتە پێشنیاردەکرێن، ئەگەرچی ئەمریکاییەکان بەشێکی زۆری ئەفگانستانیان بۆمباران کردوە و بە ملیۆنان کەسی هەلاتوو لەنێوان سنورەکانی ئێران و پاکستاندا لە هەلومەرجێکی نائینسانی کوشندەدا دەژین، ئەگەرچی میدیای نێود دەوڵەتی وێنە و ناو و شووناسی کۆمەڵێک کەسی خستۆتە بەردەم ڕای گشتی جیهانی، بەڵام هەموو ئەمانە ئەو ڕاستییە ناشارنەوە کە یەکێک لە کاراکتەرە هەرە سەرەکییەکانی ڕووداوی ١١ سێپتێمبەر نە ناسینی بکەرەکان و نادیاری مەبەستەکانیانە. ئەو زانیارییانەی ئێمە لەسەر بکەرەکان هەمانە زۆربەیان زانیارییەکی ئیستیخباراتین و تا ئێستاش لە سنووری گومان و دوودڵییەوە دانەبەزیون بۆ زەمینی بەڵگە و سەلماندن. بەم مانایە ١١ سێپتێمبەر، سەرەڕای گەورەیی و مەشهەدیەتی وێنەکانی، ڕوداوێکە بێ ئەکتەر، ڕووداوێکە هیچ کەسێک بەرپرسیاریەتییەکەی هەڵنەگرتوە و هیچ لایەن و هێزێک خۆی نەکردوە بە خاوەنی. ئەم نەبوونی خاوەنە وەک ئەوە وایە داوامان لێبکەن دیاردەکە وەک دیاردەیەکی سروشتی

ببینین. ڕووداوەکە خۆی وا نیشانئەدات وەک ئەوەی بەشێکی ئاسایی و سروشتی پێکهاتی ئەو جیهانەبێت کە تێیدا دەژین و ڕێک دەرەنجامی کارکردنی میکانیزمە ئابوری و سیاسی و کولتوورییەکانی ئەو جیهانە بێت.

ڕەنگە ڕووداوەکەی ١١ سێپتێمبەر بیەوێت بڵێت، گرنگ نییە بکەرەکان کێن، چ مەبەستێکیان هەبووە و کام دەق و مانیڤێستی ئاینی و ئایدیۆلۆژی لەپشتی خەیاڵ وعەقڵ و ئیدراکیانەوە ئامادەبووە، گرنگ ئەوەیە ئێمە لە جیهانێکدا دەژین قابیل و شایستەی کردارێکی لەو بابەتەیە. ١١ سێپتێمبەر دەخوازێت وەک پێدراوێکی سروشتی و ئاسایی ناو جیهانی ئەمڕۆکە خۆی بەسەر ووشیاری و خەیاڵ و ئیدراکماندا بسەپێنێت. ئەمەش مانای ئەوەی ١١ سێپتێمبەر خۆی وا نیشانئەدات وەک ئەوەی دەرنجامێکی لۆژیکی جیهانێکی بێ لۆژیک بێت، نەبوونی بکەری ڕاستەوخۆ و بەجێنەهێشتنی دروشم و گوتارێک لەدوای خۆیانەوە دەخوازێت ئەو گومانەمان لەلادروستبکات کە ڕووداوی لەم بابەتە پێدراوێکی ئاسایی و سروشتی و قەدەری ناو ڕووداوەکانی جیهانی ئەمڕۆکەن.

ئاشکرایە جیهانی ئەمڕۆ جیهانێکە گەر دیوێکی بریتیبێت لەو خۆشنودگەراییەی کە بەشێک لە کۆمەڵگا دەوڵەمەندەکانی تێدا دەژی، ئەوا دیوەکەی ئەودیوی جەهەنەمێکە کە دەشێت لەهەموو ساتێکدا دەرگاکانی بەڕووی هەمووواندا بکرێتەوە. ڕەنگە ١١ سێپتێمبەر بەم مانایە کرانەوەی دەرگاکانی جەهەنەم لەسەر جیهان.

ئەگەرێکی دیکەی ئەم بێناوی و بێئەکتەرییەی ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر ئەوەیە ئەوانەی بەم کارە هەڵساون ئەوەندە خۆیان و پەیامەکەیان پێ ئاسایی و لۆژیکی و گومان هەڵنەگرە کە بەپێویستیان نەزانیبێت لەدوای خۆیانەوە حیکایەتێک بەجێبهێڵن. حیکایەتێک لانیکەم دواهەمین ڕاسپاردە و وەسیەت و وێناکردنەکانی ئەم گروهەی تێدابێت و مەبەستەکانیانی ڕوونکردبێتەوە. کەسێکی وەک (تۆم نارین) لەو باوەڕەدایە کە بکەرەکانی ئەم ڕووداوە بەم بێدەنگی و بێ ناونیشانییەیان ویستوویانە ڕەهەندێکی ئاینی گشتگیر و نەناسراو بە کارەکەیان بدەن و ڕێک وەک کارێکی خوداکرد نیشانیبدەن، کارێک کە خودا خۆی لێی بەرپرسیاربێت، نەک ئینسان، ڕقێکی خودایی خولقاندبێتی نەک دیدێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی. بەهەرحاڵ لە هەموو بارێکدا تێکەڵبوونی مانا و دەلالەتەکانی ئیمانێکی کوێرانە بە ئەفسانەی شەهادەت بە تەکنۆلۆژیای

نوێ ئەو موعەما گەورەیەی دروستکردوە کە تا ئێستا بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە. ئەو هێزانەی تا ئێستاتا هێمای ئەوەیان بۆدەکرێت کە گوایە بکەری ئەو ڕووداوەبن، لەپاڵ ئوسوڵییەتی ئیسلامیدا، کۆمەڵێک هێزی ترن کە دژ بە پرۆسەی بەجیهانبوون و دەرەنجامە خراپەکانی جیهانگیریی دەجەنگن، هەروەها هێما بۆ چەندان گروهی سیاسی و ئایدیۆلۆژی ڕاستڕەوی ناو خودی کۆمەڵگای ئەمریکی خۆشی دەکرێت.

سەبارەت بە پاڵنەر و مۆتیڤی بکەرە نەناسراوەکانی ئەم ڕووداوەش دیسانەوە ئێمە حیکایەتێکی ورد و ئاشکرامان لەبەردەمدا نییە. چییە وای لەم گروهە نەناسراوە کردوە کارێکی لەو بابەتە ئەنجامبدات؟ یانزەی سێپتێمبەر بۆ ڕوودەدات؟ ئایا بۆ لێکدانەوەی ئەم ڕووداوە دەبێت تەماشای چی و کوێ و کام بەشی جیهان بکەین؟ بۆ تێگەیشتنی مۆتیڤی بکەرەکان دەبێت سەرنجی کام ڕووداو بدەین و لە کام ئاماژەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری بڕوانین؟ ئایا لەو گۆڕانە گەورە گەورانە ڕامێنین کە لە کۆتایی هەشتاکانەوە بەسەر سیستمی سیاسی نێودەوڵەتیدا هاتووە؟ واتە بۆ لێکدانەوەی مۆتیڤەکانی ئەم ڕووداوە دەبێت تەماشای نەمانی جیهانی دوو جەمسەری و پەیدابوونی جیهانێکی یەک جەمسەربکەین؟ ئایا دەکرا لەسەردەمی جیهانێکی دوو جەمسەریدا کارێکی لەم بابەتە ڕوویدات؟ ئایا لە جیهانێکدا کە هاوسەنگییەکی تایبەتی دوو جەمسەرە بەڕێوەیدەبرد، کارێکی لەم بابەتە، کە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە لە هەر فۆرمێک لە فۆرمەکانی هاوسەنگی نێودەوڵەتی، قابیلی ڕوودان بوو؟ ئایا گەر سۆڤیەت و بلۆکی ڕۆژهەلاتی جاران لەناو نەچووبان، دەکرا بەم ئاسانییە کارێکی وا گەورە کە دەرەنجامی ترسناکی بۆسەر سیاسەتی نێودەوڵەتی دەبێت، ڕوویدات؟

زۆرن ئەو بۆچوون و خوێندنەوە و لێکدانەوانەی لە خاڵی گۆڕانی جیهانەوە لە جیهانێکی دوو جەمسەرەوە بۆ جیهانێکی یەک جەمسەر دەستپێدەکەن و هەوڵئەدەن لە پشتی ١١ سێپتێمبەرەوە ئەو گۆڕانانە ببینن کە لە دوای کەوتنی دیواری بەرلینەوە بەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتیدا هاتووە. ئەوانەی باوەڕیان بەم دیدەیە ١١ سێپتێمبەر وەک دەرەنجامی کورتبوونەوەی جیهان بۆ جیهانێکی یەک جەمسەر و دەرەنجامی سەپاندنی هەیمەنەی بێ چەندوچونی ئەمریکا دەبینن. لەم دیدەدا سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا و کۆی ئەو کێشە و گرفتانەی ئەم سیاسەتە لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا دروستیکردوە، یاخود بە نیوە و ناچلی

بەجێیهێشتوون و وەک زلهێزێک ئامادە نییە چارەسەریان بکات، وەک مۆتیڤی سەرەکی ڕوودانی ئەم کارەساتە دەبینن. بە مانایەکی دیکە، لەم دیدەدا، هێرش بۆ سەر مانهاتن و پینتاگۆن هێرشە بۆسەر جیهانێکی تاک جەمسەر کە تێیدا سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا و هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر بە کێشە گەورە و چارەنووس سازەکانی زەوی بوونەتە تاقە سیاسەت و هەڵوێستێک کە مانا و قورساییان هەبێت و بشێت لەڕووی پراکتیکیشەوە جێبەجێبکرێن. هێرش بۆ سەر مانهاتن هێرشە بۆسەر ئەم توانایە کە ئەمریکا نایەوێت بەباشی بەکاییهێنێت و وەکچۆن هێرشیشە بۆسەر جیهانێک، کە لەم دیدەدا، وردە وردە بە ئەمریکایی دەبێت.

هەندێک وەڵامی دیکە ئەو دیدەی سەرەوە بە دیدێکی کورتبین دەزانن و پێیانوایە لە دیدێکی دژە ئەمریکاییەوە هاتووە کە ناکرێت بەرگری لێبکرێت، بۆیە هەوڵەئەدەن لەسەرزەمینی کۆمەڵێک گۆڕانکاری گەورەتر و بەرفراوانتردا بەدوای مۆتیڤەکانی ١١ سێپتێمبەردا بگەڕێن. ئەمانە لە تاوانبارکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە دەگوازنەوە بۆ تاوانبارکردنی ئەو پەیوەندییە نا ئینسانی و نا یەکسان و پڕناکۆکیانەی ئەمڕۆکە بەشی سەرەوەی زەوی، بەشە دەوڵەمەندەکەی، بە بەشی خوارەوەی زەوییەوە، بە بەشە هەژارەکەی، دەبەستێتەوە. ڕووداوی ١١ سێپتێمبەر لەم بۆچوونەدا دەربڕی ڕق و تووڕەیی و تۆڵەی بەشە هەرە هەژارەکەی جیهانە بەرامبەر بە بەشە هەرە دەوڵەمەندەکەی، تۆڵەی جیهانێکە هیچی نییە بیخوات بەرامبەر بە جیهانێک کە پشیلە و مشکەکانی باشتر دەژین لە منداڵانی بەشەکەی دیکەی. بەم مانایە کەوتنی دوو قوللە بەزەکەی مانهاتن هێمای ئەو پەڕی نارەزایی و ئەوپەڕی تورەبوونی بەشە هەژارەکەی جیهانە بەرابەر بە بەشە دەوڵەمەندەکەی. ئەم جیاوازییەش ئەوەندە گەورەیە و جیهانیش ئەوەندە بێخەم و بێباکە بەرامبەری کە تەنها ڕووداوێکی وەک یازادەی سێپتێمبەر دەتوانێت سەرنجی هەمووان بۆ ئەو کارەساتە کوشندانە ڕابکێشێت کە بەشێکی گەورەی ئینسانەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە بەدەستییەوە دەناڵێنن. لە ڕەوتێکی لەم بابەتەدا هاوڕێیەکی سۆماڵیم پێیووتم: «ڕۆژئاوا جگە لە زمانی تیرۆر هیچ جۆرە زمانێکی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا نەهێشتۆتەوە». بێگومان دەشێت ئەم ڕایە کەمەکێک لە ڕاستی تێدابێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە زمانی تیرۆر زمانێک نییە ببێتە هۆی تەعبیرکردن لە

کێشە ڕەواکانی جیهان. لۆژیکی تۆڵە و تێرۆر و کوشتنی کەسانی سەر بە ٣٧ نەتەوەی جیاواز ناتوانێت تەعبیر لە کێشە ڕاستەقینەکانی جیهانی ئەمڕۆمان بکات. ڕاستە دەشێت یەکێک لە هۆکارەکانی تێرۆر هەستکردنبێت بە غەدر و ناعەدالەتی، یان خەیاڵ و عەقڵیەتی هەستکردن بە قوربانیبوون بیخولقێنێت، بەڵام خودی تێرۆر خۆی وەک کارێکی تێکدەر توانای ئەوەی نییە بەرەو هیچ شوێن و جێ و دەسکەوتێکمان ببات.

گروهێکی دیکە بۆ تێگەیشتن لە مۆتیڤەکانی ١١ سێپتێمبەر تەماشای جیاوازی نێوان کولتوور و ئاین و شارستانیەتەکان دەکات. ئەمانە پێیان وایە ڕووداوەکانی مانهاتن تۆڵەی کولتوور و شارستانیەتێکە لە کولتوور و شارستانیەتێکی دیکە، ١١ سێپتێمبەر دەرەنجامی هێرشی کولتوورێکی خوێناوی و مەرگدۆستە بۆ سەر کولتوورێکی ڕۆشنگەر و ئینساندۆست، تۆڵەی تیۆلۆژیایە لە تەکنۆلۆژیە.

لەم تێڕوانینەدا ئەو کولتوورەی خوازیاری تۆڵە سەندنەوەیە کولتووری ئیسلامە و ئەو کولتوورەش کە هێرشی دەکرێتە سەر کولتووری ڕۆژئاوایە. لەم هێرشەدا ئیسلام یەکسانە بە بەربەریەت و کولتووری ڕۆژئاواش بە هەموو شتە جوانەکانی سەر زەوی. ئەوانەی باوەڕیان بەم لێکدانەوەیەیە پێیان وایە لە پشتی کەوتنی قوولەکانی مانهاتنەوە تۆڵەی جیهادی ئاینی لە جیهانێکی عەلمانی و هێرشی قورئان بۆسەر پرنسیپەکانی دیموکراسیەت و هەڕەشەی فەتواکان لە مافی مرۆڤ و پەلاماری دۆگمای ئاینی بۆسەر جیهانی ئازاد ئامادیە. هەندێکی دیکە سڵ لەوە ناکەنەوە ئەم ڕووداوە وەک شەڕی نێوان ماتریالیزمی ڕۆژئاوایی و ڕۆحانیەتی ڕۆژهەڵاتی ناونووسبکەن. ١١ سێپتێمبەر لەم لێکدانەوەیەدا ڕۆژی هێرشبردنی بەربەریەتە بۆ سەر شارستانیەت و ساتەوەختی هێرشی توندڕەویە بۆسەر دیموکراسیەت و ترۆپکی هێرشی هێزە تاریکەکانی ئیسلامە بۆسەر مانا و بەها و دەسکەوتەکانی ڕۆشنگەری.

ئەو تێزەی لەپشتی ئەم لێکدانەوە کولتوورییەوە ئامادەیە تێزەی پرۆفیسۆری ئەمریکی (سامۆیل هینگتینتۆنە) سەبارەت بە «پێکدادانی شارستانیەتەکان». بەباوەڕی ئەم نوسەرە جەنگەکانی ئایندە جەنگی نێوان ئایدیۆلۆژیا سیاسییەکان نابێت لەگەڵ یەکدا، بەڵکو جەنگی نێوان شارساتانیەت و

کولتوورەکان دەبێت لەگەڵ یەکدا. گرنگترین جەنگێکیش لە سیناریۆکەی هینگتینتۆندا جەنگی نێوان ئیسلام و شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەبێت. لە ئەورپای ئەمرۆدا ئەم تێزە لای زۆر ڕۆژنامەنووس و ستوون نووس؟و ڕۆشنبیری نومرە سێ و نومرە چوار تێزی باڵادەستە. نەلەبەرئەوەی ئەم تێزە تێزەێکی ڕاستەقینە و زانستییە و توانای لێکدانەوەی دیاردەکانی جیهانی ئەمرۆی هەیە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە لەبەرئەوەی ئەم تێزە تێزێکی هێجگار سادەیە و پێویستی بەبیرکردنەوە و لێکدانەوە تۆژینەوەی ڕووکارە جیاواز و ئاڵۆزەکانی جیهانی ئەمرۆ نییە. ئەم تێزە جیهان بەشێوەیەکی سادە بەسەر کۆمەڵێک شارستانیەتدا دابەشدەکات و لەنێوان ئەو شارستانیانەشدا جەنگێکی وەهمی پێشنیاردەکات. گرنگترین سیفەتی ئەم تێزە ئەو کوێرییە مەعریفییەیە کە ڕێدەگرێت لە بینینی ئەو دەیەها و سەدەها جیاوازییە ناوەکیانەی لە هەناوی یەک شارستانیەت و یەک کولتووردا ئامادەیە، نیشاندانی ئیسلام وەک گشتێکی گەورەی بێجیاواز و کردنی بە مۆتیڤی هەڵسوکەتی زیاد لە ملیارێک موسڵمان لە دەیان و سەدان کۆمەڵگا و دەوڵەت و نیشتیمانی جیاجیادا یەکێک لە سادەکارییە ترسناکەکانی ئەم تێزە. لەڕاستیدا کردنی کولتوور بە مەکینەیەکی گەورەی فۆتۆکۆپیکردنی ئینسان و کۆمەڵگا ئەو دیدە ناڕاست و دۆگمایی و نەگۆڕەیە کە ئەم تێزە بۆ کولتوور و شارستانیەتی هەیە. من لێرەدا مەودای ئەوەم نییە کۆی ئەو ڕەخنانە دووبارەبکەمەوە کە لەم تێزە سادەگۆیە گیراون و بنەما سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژییەکانی شیکراوەتەوە، بەڵام دەمەوێت ئەو ڕاستییە دووبارە بکەمەوە کە هەم لەناو زۆر لەوانەدا کە خۆیان بە عەلمانی دەزانن و هەم لەناو زۆر لەوانەشدا کە تا سەر ئێسقان ئوسوڵین، ئەم تێزە تێزێکی ڕەواجدارە. لەم چەند هەفتەیەی دواییدا کەمنەبوون ژمارەی ئەو ڕۆژنامە نوس و ستوون نووس و ئەکتیڤیستە سیاسیانەی، هەم لە بەرەی ئوسولیەت و هەم لەبەرەی عەلمانیەت، هەم لە ڕۆژئاوا و هەم لە ڕۆژهەڵات، بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر، نائومێدانە لاپەڕەکانی قورئانیان هەڵنەدابێتەوە و چەند دێڕ و ئایەت و سورەتێکیان نەکردبێت بە بەرپرسیاری ڕووداوەکان. هەم کەمپی ئوسامە بن لادن و هەم کەمپی جۆرج بوش، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیەوە، پڕوپاگەندەیەکی زۆریان بۆ ئەم تێزە کرد و لە پەیوەنیشیاندا بە یەکدیەوە هەر یەکێکیان وێنەیەکی فریشتەیی بۆ خۆی و وێنەیەکی ئەهریمەنی بۆ لایەنەکەی دیکە دروستکرد.

بێگومان کەسانێکی زۆر هەن لە ناڕاستی و نادروستی ئەم تێزە سادەگۆ و نازانستییە ئاگادارن و باوەڕی خۆیان بەم وەڵامە کولتوورییە پەڕگیرە نەداوە و ڕازینەبوون پینتاگۆن و وال ستریت وەک نوێنەری ڕۆشنگەری ببینن و ئەوەشیان قبووڵ نەبووە ئوسامە بن لادنیش وەک نوێنەری شارستانیەتی ئیسلامی وێناکەن. ئەوانەی جۆرج بوش بە نوێنەری شارستانیەتی ڕۆژئاوا و بن لادن بە نوێنەری شارستانیەتی ئیسلامی دادەنێن بەهەمان ئەندازە هەڵەن. هەم جۆرج بووش و هەم بن لادن نوێنەری دوو هێزی کوێر و نابینا و توندڕەوی جیهانێکی لنگەوقوچن، یەکەمیان جیهان وەک ئۆرزیباگێکی گەورە مامەڵە دەکات و دوهەمیشیان وەک مزگەوت و خانەقایەکی تاریک. لەم ئۆرزیباگە گەورەیەدا ئەوەی گرنگە، بەها و مافەکانی ئینسان و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و سیاسی نییە، بەڵکو نرخ و دەسکەوت و قازانجی ئابوورییە، لەو مزگەوتەشدا ئەوەی گرنگە خوداپەرستیی و ڕۆحانیەتی ڕاستەقینە و ڕێزگرتنی ئینسان و ژیان و کۆمەڵگا نیە، بەڵکو سەپاندنی کۆمەڵێک دۆگما و وێنە و خورافەتە کە ئیرادە و بۆچوون و وێناکردنەکانی گروهێک بە ئیرادە و بۆچوون و وێناکردنەکانی خودا یەکسان دەکات.

بێگومان ئەوانەی لەم شەڕە کولتوورییە گریمانکراوەدا بەیەکدادەدەن دیدی کانت و دیدی ئیبن ڕوشد نییە، هیومانیزمی ئیراسمۆس و هیومانیزمی ئیبن ئەل عەرەبی نییە، بەریەکەوتنی جیهانبینی والت ویتمان و جیهانبینی حافیزی شیرازی نییە، نا ئەوانەی بەریەک دەکەون سیاسەتە تاریک و ناڕێک و پڕ پێچ و پەناکانی ئەمریکا و چەندان هێزی سیاسی دیکەی ڕۆژئاواییە بەرامبەر هەندێک لەو هێزە تاریک و توندڕەو و دۆگماییانە کە خودی ئەم سیاسەتە ڕۆڵی گرنگیان لە دروستکردنیاندا هەبووە. ئوسامە بن لادن چەند بەرهەمی کێشە چارەسەرنەکراوەکانی جیهانی عەرەب و نا عەدالەتی کۆمەڵایەتی و فەسادی ئیداری و زەبروزەنگ و سیاسەتی دیکتاتۆریانە و کەلەپووری توندڕەوی ئاینییە، بە هەمانئەندازەش مناڵی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایە. ئوسولیەتی ئیسلامی بەزۆر مانا بەرهەمی ڕۆژگاری جەنگی سارد و بەرهەمی داکۆکی و کۆمەکی ئەمریکایە لەو هێزانەی لە مزگەوتەکاندا دەرسیان دادەدرا دژ بە چەپ و عەلمانیەت و سۆسیالیزم و دیموکراسیەت بجەنگن.

ئەوەی ئوسـامـە بن لادنـی دروستکردوە، ئـەم دێڕ یان ئەو دێڕی قـورئان و ئەم قسـە یـان ئەو قسەی پێغەمبەر و فلآن یان فیسار فەتوای ئاینی نییە، ئەوەی ئەم پیاوەی دروسـتکردوە هاوکێشە سیاسـی و ئایدیۆلۆژی و سەربازییەکانی جەنگی سارد و کێشەی نێوان ئەمریکا و سۆڤێتی جاران و ئەو تێکەڵبوونە ناشیرینەی نێـوان دۆلاری نەوت و وەهـابیـەتە. ئەوانەی ئوسـامـە بن لادن بە مناڵی چەند ڕستـەیەکی نـاو دەقـێکی ئاینی دەزانن، نەک بە مـناڵی سـەردەمـانێکی تاریک و بێمـژدە و پڕ کێشـەی جیـهانی ئەمڕۆمـان دەیانەوێت هـەم خۆیان هـەم ئێمـەش بەهەڵەدا ببەن.

ئەو جیـهانە سیاسـی و کۆمـەڵایەتی و سـایکۆلۆژییەی دوای جـەنگی خـەلیج و ڕاوەدوونـانی سـەدام لـە کـوێت هاتەکـایەوە لەزۆر ڕووەوە بـوو بە بێـشکەی توندڕەویی. هەشت ساڵ شـەڕی ئێران و عێراق، شەڕی ناوخۆ لە سودان، بوونی ئیسرائیل لە خواروی لوبناندا، وەڵامدانەوەی خوێناوییانەی دەوڵەتی تورکی بە کێشەی کورد، چارەسەرنەکردنی کێشەی عێراق و کورتبوونەوەی ئەم کێشەیە بۆ وڵاتێکی وێران و دیکتاتۆرێکی بێڕەحم، کوشتنی زۆر خـەونی گـۆڕان و نەمـانی مـژدەی کـۆمـەڵایەتی و سـیـاسی لە بـەشـێکی گـەورەی دەرەوەی ڕۆژئاوادا و لە هەمـوو ئەمـانەش گـرنگتر چارەسـەرنەکردنی کێشـەی فـەلەستین، کە ڕۆژبەڕۆژ ژمـارەی تابووتەکانی هـەردوو بەرەی مـلـمـلانێکە گەورەتر دەکات، دەڵێم کۆی ئەم شـتـانە هێـز و وزە و توانایەکی ئەفسـانەیی و بەردەوامیـان بە توندڕەوی ئاینـی و تێـرۆر و خـودکـوژی و جـیـهـانکوژی و ئەویدی کـوژی داوە و ئەدەن. لەم ڕووەوە سیاسـەتی دەرەوەی زۆر لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان سیاسـەتێکی تابڵێی دوو فـاق و کورتبین و بێمـانەیە و ڕۆڵێکی ئاشکرا و بەرچاو لە قووڵبوونەوەی کێشـەکان و گەیاندنیان بە ئاستی تەقینەوەی تێرۆریستانە، دەبینن.

**٢. ڕوخانی قوللەکان و دواڕۆژی کۆچبەران لە ڕۆژئاوا؟**

دواهەمین کۆمەڵە پرسیارێک کە لەچەند هەفتەی ڕابووردودا هـاتوونەتە پێشەوە پرسـیارن دەربارەی دەرەنجـامی ڕووداوەکـانی ١١ سـێپـتێمبەر لە پەیوەندیاندا بە ژیان و ئاسایشی ئەو گروهە کۆچبەرانەی لەوڵاتە ئیسلامییەکانەوە بۆ ئەمریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا کۆچیان کردوە. تا چەند ئەم ڕووداوانە کاریگەری خراپیان بۆ سەر ژیانی ئەو دەیان ملیۆن کرێکار و خوێندکار و پەناهەندە و کۆچبەرانە هەیە

کە هەلومەرجی سەختی وڵاتەکانی خۆیان ناچاریکردون سەفەربکەن و لە ڕۆژئاوادا جێگیربن؟ تاچەند ١١ سێپتێمبەر هەلومەرجی کۆچبەران، کە لە سەرەتاوە هەلومەرجێکی سەختە، سەختتر و خراپتر و مەترسیدارتر دەکات؟ ئایا لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە کۆچبەرانی نا ئەورووپی دەکەونە ناو چ جیهانێکەوە؟ تا چەند ئەم گروهانە وەک کەمینەیەک سەلامەتن لە جیهانێکدا کە تێیدا چەندان هێز هەن کە تەپڵی جەنگ و تۆڵە و ڕاسیزمێکی بەخەبەرهاتوو لێدەدەن؟

لەڕاستیدا، لەزۆر وڵاتی ئەورووپیدا ئەو کۆمەڵە پرسیارە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەو سیستەمە سیاسی و ئەخلاقی و کولتوورییە دەکرێتەوە کە بە سیستەمی «کۆمەڵگای فرە کولتووری» ناودەبرێت. (زۆر بە گشتی کۆمەڵگای فرە کولتوری بەو کۆمەڵگایە دەگوترێت کە تێیدا کۆچبەرەکان مافی پاراستنی کولتووری تایبەتی خۆیان هەیە لە چوارچێوەی پاراستنی یاسا دیموکراسیەکاندا، واتە ئەو کۆمەڵگایەیە کە داوای تواندنەوەی کۆچبەرەکان ناکات و نایەوێت واز لە شووناسی ئەتنی و ئاینی و کولتووری خۆیان بهێنن ). هێرش بۆسەر سیستەمی فرە کولتووری، وەک هابرماز دەڵێت، هێرشە بۆسەر سیستەمی دیموکراسی خۆی. بۆیە بەرگریکردن لە شوێن و جێ و سەلامەتی کۆچبەران بەزۆر مانا بەرگریکردنە لە سیستەمی دیموکراسی و لەو دەسکەوتانەی ئەم سیستەمە دروستیکردون. کۆچبەران لاوازترین هەڵقەی ناو سیستەمی ئەم کۆمەڵگایانەن و هێرشبردن بۆسەر دیموکراسیەت لە هێرشبردن بۆسەر کۆچبەرانەوە دەستپێدەکات. ئەوانەی کە تێگەیشتنێکی کولتوورییان بۆ ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر هەیە و ئەم ڕووداوانە وەک شەڕی نێوان کولتوورەکان لێکدەدەنەوە، لەڕیزی پێشەوەی ئەوانەدان کە هێرش دەکەنە سەر کۆمەڵگای فرە کولتووری و سەر ئەو دەسکەوتانەی ئەم کۆمەڵگایە لە ٢٠ تا ٣٠ تا ساڵی ڕابووردودا بەدەستی هێناوە. ئەمڕۆکە لە بەشێکی گەورەی ئەورووپا و ئەمریکادا موناقەشاتی هەمەلایەن لەسەر ماناکانی کۆچ و ئامێزانی کۆمەڵایەتی و تواندنەوە و شوێن و جێی ئاین لەدەستنیشانکردنی شوناسدا و چییەتی و چۆنیەتی ڕێکخستنەوەی شوناسی نەتەوەیی..لەئارادایە.

لەسەرێکی دیکەوە لەناو خودی ئەو ژمارە زۆرە کۆچبەریشدا، کەبەشێکی زۆریان موسڵمانن، چەندان پرسیار و بۆچوونی نوێ هاتونەتە پێشەوە کە

پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەرەوە هەیە. ئایا تا چەند ئەم ڕووداوە وا لەو گروهە موسڵمانە کۆچبەرانە دەکات بە ماناکانی ئاین و ئیسلام و توندڕەویدا بچنەوە؟ تاچەند ئەم ڕوداوە دەبێتە هۆکاری ئەوەی ئیسلام وەک ئاین بکەوێتە بەردەم خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی و زانستی قووڵەوە؟ چۆن و بە چ شێوەیەک ئیسلام لەو وزە ناوەکییە ئازاد بکرێت کە هۆکاری بەرهەمهێنانی توندڕەوییە؟ ئایا بوونی ئەو ژمارە گەورەیەی موسلمانان لە ئەوروپادا نابێتە هۆی هاتنەکایەی شێوازێکی نوێ لە ئیسلام کە بشێت بە «ئیسلامی ئەوروپی» ناوبنرێت، ئیسلامێک ڕۆژانە سەروکاری لەگەڵ ماناکانی عەلمانیەت و دیموکراسیەت و فرە کولتووری و فرە ئاینی و جیاوازیدا، هەیە؟

ئەمڕۆکە بەم ئاراستەیە گفتوگۆیەکی هەمەلایەن و هەندێکجار هێمن و زۆرجاریش بارگاوی بە توندوتیژییەکی ڕەمزی گەورە، لە ئارادایە. هێرشی بەردەوام و ناڕەوا بۆ سەر ئیسلام و پێغەمبەر و قورئانەکەی، بەشێکی بەرچاوی ئەو نووسینانەن ئەمڕۆکە لەزۆربەی میدیاکانی ئەوروپادا دەنوسرێن، وەکچۆن بەدیوی ئەودیشودا بەرگری و داکۆکیەکی بێمانا و ئوسولیانە لە ئیسلام و لە قورئان و لە تێکستە دینییەکانی دیش لە ئارادایە. یەکەمیان هەموو خراپەکارییەکانی جیهان دەخاتە ملی چەند دێڕێک لە دێڕەکانی قورئان و دووهەمیان ئیسلام لەهەموو توندڕەوی و مۆتیڤێک بۆ جەنگ و پێکدادانی خوێناوی بێبەری دەکات. لەنێوان ئەم دوو تەوەرە سەرەکیەشدا چەندان دەنگی دیکە هەن کە هێمنتر و وردتر و زانستیتر لە شوێن و جێ و تواناکانی ئاین لە وەڵامدانەوەی کێشەکانی جیهانی ئەمڕۆدا دەڕوانن. بەڵام تا ئەم ساتە دەنگە توندڕەوەکان لە هەردوو بەرەکەدا زاڵترن.

بەبۆچوونی من چۆنیەتی گەشەی ڕووداو و پەرچەکردار و گفتوگۆکان تا ئەم ساتەی ئێستامان لە قازانجی کۆچبەرە موسڵمانەکاندا نییە، لەسەرێکەوە کۆمەڵێک ئیمام و مەلا و پیاوی ئاینی توندڕەو و دۆگمایی و چەندان گەنجی سادەگۆ ڕۆژانە بە قسە و بۆچوونی بێمانا وێنەکانی ئیسلام خراپ و خراپتر دەکەن، لەسەرێکی دیکەوە کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووس و ستون نووسی ئەوروپی، بە کەمترین زانیارییەوە دەربارەی ئیسلام، وێنەی هەمو کۆچبەرێک و هەموو دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی ئیسلام ناشیرین دەکەن. تا ئەم ساتە چەندان سێنتەر و مزگەوت و قوتابخانەی کۆچبەران سوتێنراون و چەندان کەس هێرشی

تاکەکەسیان کراوەتەسەر. ڕاسیزمی نووستوی ناو کۆمەڵگا ئەوروپییەکان کەم تا زۆر لە خەو هەڵسێندراوە و هەم ڕاستەوخۆ و هەم ناڕاستەوخۆ لە پەیوەندییەکی ڕق ئامێزدا بەرامبەر بە کۆچبەران، ڕاگیراوە. بەڵام مایەی خۆشحاڵیشە لەهەمانکاتدا چەندان دەنگی دیکە ئامادەن کە بەرگری لە کۆچبەران و کولتووری کۆچبەران و ئەو جیهانە بچکۆلەو لاوازە دەکەن کە کۆچبەران لەو کۆمەڵگایانەدا بۆ خۆیان و ماڵ ومناڵ و دەوروبەریان دروستکردوە. ئەمڕۆ زیاد لەهەموو کات کۆمەڵگای فرە کولتووری لەژێر هێرش و ڕق و پەلاماردایە. هێزە ڕاسترەوەکان بەردەوام هێرش دەبنە سەر بیرۆکەی کۆمەڵگای فرە کولتووری و داوای تواندنەوەی دەستبەجێ و بێقەیدوشەرتی کۆچبەران دەکەن. ١١ سێپتێمبەر لەسەرێکەوە هێزە ڕاسترەوە دژ بە کۆچبەرەکانی بەهێزکردوە، لەسەرێکی دیکەوە پانتایی تایبەتی بە خودی کۆچبەران و بەچەندان دەنگی دیکە بەخشیوە کە بەرگری لە مافەکانیان دەکەن.

لەکاتێکدا چەند ڕۆژێک دوای ١١ سێپتێمبەر یەکێک لە ڕۆژنامە فەرەنسییەکان بۆ پیشاندانی هاریکاری و هاودەردی ئەوروپییەکان لەگەڵ ئەمریکییەکاندا دەنووسێت «ئێمە هەموومان ئەمریکین» یاخود وەک سیاسییەکی هۆڵەندی ووتی «ئێمە هەموومان نیویۆرکین»، لە هەمانکاتدا چەندان دەنگی دیکە بەرزدەبێتەوە و دەڵێن«ئێمە هەموومان ئەفگانین» یاخود «من بەهیچ جۆرێک ئەمریکی نیم» یان" «نەخێر من ئەمریکی نیم، من هاووڵاتییەکی جیهانیم».

بە کورتی هێشتا زۆر زووە بزانین داخۆ دەرەنجامەکانی ١١ سێپتێمبەر بۆسەر کۆمەڵگای فرە کولتووری و کۆچبەران چیدەبێت و چۆن دەبێت، بەڵام گومانی تێدا نییە کە جیهانی کۆچبەرانی بەر لە ١١ سێپتێمبەر تەواو جیاواز دەبێت لە جیهانی دوای ١١ سێپتێمبەر. لەم ڕووەوە بەشێکی کۆمەڵگای کوردی کە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا کۆچبەرە دەکەوێتە ناو ئەو جیهانە نادیارەی سبەینێوە.

**٣. ئاسایش و ئایندەی دیموکراسیەت دوای ١١ سێپتێمبەر؟**

زنجیرەی سێهەمی ئەو پرسیارانەی ١١ سێپتێمبەر هێنانیە کایەوە پرسیارن دەربارەی مەسەلەی ئاسایشی نێودەوڵەتی و ئاسایشی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان خۆیان. پرسیاری لەبابەتی ئێمە تا چەند لە هەلومەرجێکی ئاسایشدا دەژین؟

پرسیارێکە لەسەرزاری هەمووکەسێکە، لە ژنێکی پیری ناو خانەی پیرانەوە بۆ زاری وەزیری ناوخۆی زۆربەی وڵاتە رۆژئاواییەکان. مەسەلەی ئاسایش لەمڕۆدا بەشێوەیەک ئامادەیە هەندێکجار ئینسان ئەو هەستەی لا دروستدەبێت کە لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە گرنگی مەسەلەی ئاسایش خەریکە شوێنی گرنگی کێشە ئابوورییەکان و گرنگی گەشەکردنی ئابووری دەگرێتەوە. لە هەشتاکانەوە مەسەلەی ئاسایش و مەترسی ناوەکی سیستمی دیموکراسیەت و کۆمەڵگا تەکنۆلۆژییە پێشکەوتووەکان بەشێکی گرنگی فیکری رەخنەیین لە ئەوروپادا. لە خۆڕا نییە یەکێک لە کتێبە هەرە گرنگەکانی ساڵانی هەشتا کە لەلایەن سۆسیۆلۆژی ئەڵمانی (ئولریش بێک) ەوە نوسراوە ناوی «کۆمەڵگای مەترسی» یە. بێگومان ئەو مەترسییانەی ئولریش بێک لە کتێبەکەیدا باسیان دەکات، جیاوازن لە مەترسییەکانی ١١ سێپتێمبەر بەڵام ١١ سێپتێمبەر دێت بۆئەوەی ڕەهەندێکی نوێ بە تێزەی مەترسی و کۆمەڵگای مەترسی ببەخشێت. (من لە دەرفەتێکی نزیکدا بەشێکی گرنگی بۆچوونەکانی ئەم سۆسیۆلۆژە گرنگە بە خوێنەری کورد دەناسێنم). ڕەنگە باشترین شتێک لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە تەعبیری لەم گرنگییە بێسنورەی مەسەلەی مەترسی و ئاسایش کردبێت سەردێڕی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی (ستاندرد) ی بەلجیکی بێت. لە سپێدەی دوای کارەساتەکەی مانهاتندا ئەو ڕۆژنامەیە لە ژێر ناونیشانی، «ئیدی هەرگیز سەلامەت نابین» دا، تەعبیر لە هاتنەکایەی جیهانێکی نوێ دەکات کە تێیدا هەستکردن بە ئاسایش و سەلامەتی تا ڕادەیەکی زۆر بزردەبێت. کۆتاییهاتنی هەستکردن بە ئاسایش لەمڕۆدا یەکێکە لە دەرەنجامە گرنگەکانی ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر. زۆرن ئەو دەنگانەی باس لە کۆتاییهاتنی هەلومەرجی «ئاسایی» ژیان دەکەن، باس لەوە دەکەن دەبێت فێربین لە جیهانێکدا بژین پڕ لە مەترسی، جیهانێک تێیدا ترس بۆتە بەشێکی ئۆرگانی و قووڵی پێکهاتە ناوەکییەکەی. لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە بۆ هەموو ئەوروپییەک ئاشکرایە کە ئەم کۆمەڵگا مۆدێرنانە کۆمەڵگایەکن قابیلی تێکشکان و وێرانکردن. ١١ سێپتێمبەر ئەو ڕاستییەی سەلماند کە کۆمەڵگای دیموکراسی، کۆمەڵگایەک کراوە بۆ جیاوازی و فرە دەنگی و ئازادی باوەڕ و عەقیدە و بەیان، کۆمەڵگایەکە دەشێت هێرشی گەورە و کوشندەی بکرێتە سەر. ١١ سێپتێمبەر جارێکی دیکە ئەو ڕاستییەی سەلماندەوە کە بۆ پاراستنی کۆمەڵگای دیموکراسی و بۆ بەرقەراربوونی پایەکانی دیموکراسییەت هەمیشە کۆمەڵێک هاووڵاتی پێویستن کە هەستێکی

ڕۆشنگەرانەیان بەرامبەر بە مەسەلەی بەرپرسیاریەت لەلابێت، هەست بەوە بکەن کە لە جیهانێکدا دەژین نابێت و ناکرێت بۆ تاقە دەنگێک لە دەنگەکان پاوانبکرێت.

ئەو پرسیارانەی لە دوای ١١ سێپتێمبەرەوە، لە ئەورووپاو ئەمریکادا، لای زۆر ڕۆشنبیر و سیاسی بەرپرسیار دەکرێن، بریتیین لە بیرکردنەوە لە چۆنیەتی پاراستن و بەرگریکردن لە بەهاو نۆرمە دیموکراسیەکان لەبەرامبەر کەسانێکدا کە دۆست و پارێزەری ئەم بەهایانە نین. چۆن ئاسیشی سیتمی دیموکراسی بپارێزیت بەبێ دەستدرێژیکردنە سەر مافە جیاوازەکانی هاوڵاتیان و بەبێ دەستدرێژیکردنە سەر مافی گروهە ئەتنی و ئاینی و کولتوورییە جیاجیاکان؟ چۆن پاراستنی دیموکراسی و ئاسایش و ئازادییە تاکەکەسییەکان بەیەکەوە کۆبکرێنەوە؟

بەرامبەر بەم پرسیارە فیکری و سیاسییە گرنگانە هەندێک دەنگی دیکە هەن کە داوای کەمکردنەوەی ئازادییەکان و زیادکردنی خاڵ و نوقتە و میکانیزمەکانی پشکنین و کۆنترۆڵکردن و دیسپلینکردن دەکەن. هەن پێیانوایە تاقە ڕێگای پاراستن و بەرجەستەکردنی ئاسایش لە کەمکردنەوەی کۆمەڵێک ماف و سککرد...وەی کۆمەڵێک دەسکەوتی دیموکراسی و شەخسیدایە و بۆ ئەم مەبەستەش ... ت سنووری دەسەڵاتەکانی دەوڵەت تا ئەوشوێنە زیادبکرێت کە بتوانێت کەسانی گومانلێکراو بێ هیچ کێشەو زەحمەتییەک بگرێت و بێ قەیدوشەرت گفتوگۆ و تەلەفۆن و قسەوباسەکانیان بپشکنرێن و نامە شەخسییەکانیشیان بکرێنەوە.

لە ئێستادا ململانێیەکی سیاسی و فیکری و ئایدیۆلۆژی گەورە سەبارەت بەم مەسەلانە لە ئارادان. لەم ڕووەشەوە ١١ سێپتێمبەر دەرگای لەسەر جیهانێکی نوێ کردۆتەوە کە دیارنییە کام هێز و لایەن و گروهـ دواهەمین قسەی تێدادەکات. داخۆ دەنگە ئینساندۆست و دیموکراسییەکان باڵادەستدەبن یاخود ئەو دەنگانەی کە ڕوویان لە هەرچی زیاترکردن و بەهێزکردنی کارەکتەری پۆلیسیانەی کۆمەڵگا و دەوڵەتە. داخۆ کۆمەڵگای فرە کولتووری سەردەکەوێت، یاخود کۆمەڵگایەک کورتببێتەوە بۆ یەک کولتوور، ئایا جیهانێک دێتە کایەوە کە تێیدا کەس نەوێرێت باسی ئاین و عەقیدە و بیروبۆچوونەکانی خۆی بکات، یان

جیهانێک ئەم مافانە قووڵتر و پارێزراوتر و بەرفراونتر بکات. ئەمڕۆ دەرگا لەسەر هەموو سیناریۆکان کراوەیە، ئەگەرەکان هەموویان ئامادەن، ڕۆژانە ڕاو بۆچوون و دیدە جیاوازەکان دەردەکەون و بەیەکدادەدەن و خۆیان ڕێکدەخەن. تا ئێستا ڕای گشتی ئەوروپی لەبەرامبەر ئەم هەموو کێشە نوێیانەدا وەڵامی پێنییە و لە چاوەڕوانی و دوودڵییەکی مێژوویدا نووقمە، بەم مانایە ١١ سێپتێمبەر هەم ڕۆژئاوا و هەم بەشێکی گەورەی جیهانی فڕێدایە ناو سەردەمێکی نادیار و نوێوە.

**٣- دوو سیناریۆ و دوو خەونی جیاواز**

من لە سەرەوە ئاماژەم بەو ترسە زۆرە کرد کە لەدوای ڕووداوەکانی مانهاتنەوە دروستبووە، هەروەها ئاماژەم بەو گومان و دید و وەڵامە جیاوازانەش کرد کە لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە هاتوونەتە کایەوە. لێرەدا دەخوازم زۆر بە کورتی دوو سیناریۆی جیاواز بۆ وەڵامدانەوەی تەحەداکانی ١١ سێپتێمبەر لەیەکدی جیاکەمەوە.

یەکەمیان ئەو سیناریۆیەیە کە چاوەڕوانی خراپترین وەڵام و تێکچوونی زیاتری جیهان و دارمانی پەیوەندی نێوان بەشە جیاوازەکانی زەوی و بەهێزبوونی میلیتاریزم و کۆتایی گوتاری مافەکانی مرۆڤ و باڵادەستبوونی ڕۆحی کولتوورگەرایی و توندبووەوەی عەقڵیەتی دەوڵەتگەرایی دەکات.

ئەویدیکەیان سیناریۆیەکە ئومێدی بەوەیە کە ١١ سێپتێمبەر سەرەتایەکی تازە بخولقێنێت کە تێیدا کێشە گرنگەکانی جیهان بە شێوەیەکی بەرپرسیار و ڕاستەقینە و دیموکراسییانە چارەسەرکرێن. سیناریۆی یەکەمیان سیناریۆیەکی ڕەشبینە و ڕەشبینییەکەشی شانیداداوەتە سەر کۆمەڵێک ڕاستی و ڕووداو و خیبرەی مێژوویی. سیناریۆی دوهەمیان سیناریۆیەکی گەشبینە و گەشبینیشی بەهەمانشێوە لەسەر بنەمای چەندان ڕوداو سەرەتاگە و خیبرەی مێژوویی ئەنجامئەدات. لە یەکەمیاندا زۆرتر تەماشای سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان و پەیوەندیان بە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ڕۆژئاواوە دەکرێت و ئەو ڕاستییانە دووبارەدەکرێنەوە کە بەشێکی زۆری ئەم سیاسەتانە لەسەر بنەمای قازانجە ئابوورییە بەرتەسکەکان بیناکراوە. کەچی لە دووهەمیاندا تەماشای ئەو

ساتەوەختە گەشانە دەکرێت کە لەدوای کارەساتەکانەوە تیایاندا شتی گرنگ و ئیجابی و ئینسانذۆست ڕوویانداوە. بۆ نموونە وەکچۆن جەنگی جیهانی دووهەم بووە هۆی هاتنەکایەی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ و ڕێککەوتنامەی جنێف بۆ مافی پەناهەندەیی و پلانی مارشاڵ بۆ سەرلەنوێ بیناکردنەوەی وێرانەکانی جەنگ، بەهەمانشێوە دەشێت ١١ سێپتێمبەر ببێتە سەرەتای هاتنەکایەی جیهان و سیستمێکی سیاسی نێودەوڵەتی نوێ کە تێیدا زەمینە ئابووری و سیاسی و کولتووریی و ئەخلاقییەکانی هاتنەکایەی تیرۆریزم بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بنەبڕبکرێت و جیهان وەک گشتێک بەرپرسیاریەتی خۆی بەرامبەر بە هەموو بەشەکانی نیشاندات.

بەبۆچوونی من ئەوەی لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە لەبەردەم مرۆڤایەتیدا ماوەتەوە بە جیهانیکردنی بەها دیموکراسی و یەکسانخواز و مافپەروەرکانە، ئەوەی ماوەتەوە بە گلۆبالبوونی کولتورێکی سیاسی دیموکراسییە کە وەڵامێکی ڕاستەقینە بە کولتووری سیاسی توندڕەوی بداتەوە، بڵاوبوونەوەی ڕۆحیەتێکی نوێی هاریکاری و دیالۆگی نێودەوڵەتی و نێو کولتوورییە. من لەو باوەڕەدام لەگەڵ کەوتنی دوو قولەکەی نیویۆرکدا شێوازێکی تایبەتی پرۆسەی جیهانگیری یان بە جیهانبوونیش دەکەوێت، مەبەستم لەمەش ئەو فۆرمەی جیهانگیرییە کە دەستەکانی بازاڕێکی وەحشیانە بەرەڵادەکات و لەهەر بەشێکی جیهاندا گەرای چەندان جەنگ و کارەسات و ململانێی کوشندە دادەنێت. ڕوخانی سێنتەری بازرگانی نێودەوڵەتی لە مانهاتن ڕوخانی یەکێک لە حیکایەتەکانی جیهانگیریشە. بەڵام ڕوخانی یەکێک لە حیکایەتەکانی جیهانگیری ڕوخانی هەموو جیهانگیری نییە، ئیفلیجبوونی یەکێک لە وێناکردنەکانی جیهان ئیفلیجبوونی هەموو وێناکردنەکانی دیکەی جیهان نییە. لەدوای ١١ سێپتێمبەرەوە ئەوەی بووەتە ڕاستییەکی ڕەها ئەوەیە کە جیهان پێویستی بە دەسکاریکردنێکی ڕادیکاڵانە هەیە، پێویستی بە دیالۆگ و پێداگرتنێکی گەردونی هەیە لەسەر بەهاکانی یەکسانی و مافپەروەری و جیاوازی.

دەشێت هەنگاوی یەکەمی وەڵامدانەوەی تیرۆر و تیرۆریزم بە جەنگ دەستپێبکات، دەشێت لەسەر ئەوە ڕێکبین کە جەنگمان بۆ ماوە و قۆناغێکی کورت قبووڵبێت، وێرانکردن و تێکدانی کۆمەڵێک سێنتەری مەشق و پێگەیاندنی ئایدیۆلۆژی و پەروەردەی سیاسی تیرۆریستان پێویستبن، بەڵام جەنگ

چارەسەری کێشەی تێرۆر و توندڕەوی ناکات. جەنگ ڕەگەکانی مەحەبەت و ئاشتی و یەکدیقبووڵکرنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری بەهێز ناکات، نەهێشتنی توندڕەوی و لەناوبردنی تێرۆر پێوستیان بە بنیادنانی جیهانێکی پڕ مژدە و عەدالەت و یەکسانی هەیە، جیهانێک کەرامەت و ڕێز ویستی ئینسانی تێدا پارێزرابێت.

تێبینی:

ئەم وتارە چەند هەفتەیەک دوای ڕووداوەکەی ١١ سێپتێمبەر نووسراوە.

# کۆمەڵگا و شوناس و ڕۆژگاری ئینتەرنێت

## ١- مارکس و چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکان

کارل مارکس جارێکیان گوتویەتی ئاشی بام بدەرێ، ڕۆژگاری سەدە دێرینەکان و فیودالیزمت ئەدەمێ؛ ئامێری هەڵمینم بدەرێ، سەردەمی پیشەسازی و سەرمایەداریت ئەدەمێ. لەسەر هەمان نەزم نووسەرێکی فەرەنسی دەڵێت: کۆمپیوتەرم بدەرێ، ڕۆژگاری جیهانگیریت ئەدەمێ.

ئاشکرایە لە پشتی هەریەکێک لەم بۆچوونانەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و توند لە نێوان شێوە جیاوازەکانی تەکنیک و چوارچێوە گشتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە، گەر ئاستی تەکنیک لاوازبێت و ئاشی با ڕەمزی ئاستی گەشەکردنی تەکنیک بێت، ئەوکات ئینسان بۆ بەدەستهێنانی وزە پابەستی سروشتە و ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەش کە لە پاڵ ئەم ئاستە لاوازەی تەکنیکدا لەئارادایە سیستمی فیودالیزمە. بەڵام کە ئاستی تەکنیکی بەرەوپێشدەچێت و ئامێری بەهەڵم کارکردوو دروستدەبێت، چواچێوەی کۆمەلایەتی سیستمەکان دەبێتە سەرمایەداری. کە ئینتەرنێتیش دێتەکایەوە کۆمەڵگا دەچێتە قۆناغێکەوە کە جیهانگیریی چوارچێوە گشتییەکەی دەستنیشاندەکات. لەم بۆچوونەدا ئەوەی تا ڕادەیەکی زۆر دەستنیشانی ئەوە دەکات کۆمەڵگا چۆن بێت و بە چ زمانێک لەخۆی بدوێت و لەکام قۆناغی گەشەکردندابێت، فۆرمە جیاوازەکانی تەکنیکە.

بێگومان جۆرێک لە شاعیرییەت لە پشتی ئەم بۆچوونانەوە ئامادەیە بەڵام ئەم شاعیریەتە ناتوانێت سێ کێشە سەرەکیمان بۆ چارەسەرکات کە ئەم بۆچوونە بۆ پەیونەدی نێوان تەکنیک و فۆرمە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان درووستیدەکات:

یەکەم: ناکرێت فیودالیزم بۆ ئاشی ئاو و سەرمایەداری بۆ ئامێری هەڵمین و جیهانگیریش بۆ ئامادەگی کۆمپیوتەرکورتبکرێنەوە.

دووهەم: لەپشتی ئەم بۆچوونانەوە لۆژیکێک کاردەکات کە گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتییەکان بە دەرەنجامی گۆڕانە تەکنیکیەکان بە گشتی و بە ئەنجامی

گۆڕانە ئابوورییەکان بە تایبەتی دەزانێت. بەمەش هەموو ئاڵۆزییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان سادەدەکرێتەوە بۆ حەتمییەتێکی ئابووری.

سێهەم: لە قووڵایی ئەم بۆچوونانەدا دیدێک بۆ مێژوو ئامادەیە کە بیرۆکەی «پێشکەوتن» ی بەردەوام دەیبات بەڕێوە کە تیایدا مێژوو لە شێوەی هێڵێکدا وێنادەکرێت کە بەردەوام لە پلەیەکی نزمەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر و لە دواکەوتنەوە بۆ پێشکەوتن و لە بەربەریەتەوە بۆ شارستانیەت دەچێت. ئەمەش دیدێکە لە سەدەی بیستەمدا ڕەخنەی زۆر و هەمەلایەنی لێگیراوە.

## ٢- سێ میتافۆر و سێ ڕاستی سۆسیۆلۆژی

گەر چاو لەم کەموکورییانە بپۆشین و دەستەواژەکانی «ئاشی ئاو» و «ئامێری هەڵمین» و «کۆمپیوتەر» وەک سێ میتافۆر، واتە ئیستیعارە، تەماشابکەین و هەریەکێکیان وەک ڕەمزی قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەکردنی تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و مەعریفی ببینین، ئەوکات دەشێت لە پشتی ئەم میتافۆرانەوە کۆمەڵێک ڕاستی کۆمەڵایەتی و مەعریفی و کولتووری بدۆزینەوە کە دەشێت لەم سێ ڕاستییە سۆسیۆلۆژی و مەعریفەدا کورتیانبکەینەوە:

یەکەم: پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییە کە لە هەر ڕۆژگارێکدا داهێنانێک لە داهێنانە ئینسانییەکان کاریگەری گەورەی لەسەر شێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و لەسەر فانتازیای کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی ئینسان بە خۆی و بە جیهانەوە دەبێت. هەریەکێک لەم داهێنانە وێنەیەکی دیاریکراو بۆ سروشت و بۆ کۆمەڵگا پێشنیاردەکات و هەریەکێشیان بەشێوەیەکی تایبەت پێناس دەکات.

دووهەم: نیشاندانی ئەو ڕاستییەیە کە هەریەکێک لەو داهێنانە هەڵگری وێناکردنێکی تایبەتن بۆ ئینسان خۆی، هەریەکێکیان وێنەیەک دروستدەکات بۆ توانا و هێز و چالاکییەکانی و وەکچۆن هەڵگری وێناکردنێکی تایبەتیشن بۆ شوێن و جێی ئینسان لەناو کۆمەڵگا و سروشت و گەردووندا.

سێهەم: جەغدکردنە لەسەر ئەو ڕاستییەی کە هەر یەکێک لەو داهێنانە شێوازێکی تایبەتی عەقڵانییەت و شێوازێکی تایبەتی فانتازیا و شێوازێکی تایبەتی مەعریفە بەرهەمدەهێنن.

با ئەم مەسەلانە زیاتر ڕوونبکەینەوە. پەیامی ڕاستەقینەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە ئەویە کە شوناسی سەرەکی هەر سەردەمێک لە سەردەمەکان وابەستەی داهێنانێک لە داهێنانە تەکنیکییەکانی ئینسانە. ئەو داهێنانانە تا ڕادەیەکی زۆر ڕووکار و شوناسی ئەو سەردەمانە دیاریدەکەن کە تیایاندا دێنەکایەوە و هەریەکێکیشیان ئینسان ڕووبەڕووی دنیایەکی تەواو جیاواز دەکەنەوە. ئەم داهێنانانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەسکاری سیستمی پەیوەندییەکانی ئینسان و دەسکاری شوێن و جێی ئەو و دەسکاری توانا و خەیاڵ و سنوورەکانی عەقڵانییەتی دەکەن و زۆرجاریش بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ دەیانگۆڕن. لەدوای هاتنەکایەی هەریەکێک لەم داهێنانانەوە ئینسان ناچاربووە بە کۆی پێناس و ماناکانی بوونی خۆی و بوونی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکاندا بچێتەوە و سەرلەنوێ شوناسی خۆی و شوناسی کۆمەڵگا و شوناسی ئەو دنیایەی تێیدا دەژی دەستنیشانکاتەوە.

ئاشی با تەکنیکی ئەو ڕۆژگارەیە کە ئینسان تێیدا بۆ بەدەستهێنانی بژێو و بۆ بەرهەمهێنانەوەی هەلومەرجی ژیانی خۆی، تاڕادەیەکی زۆر، پشتی بە خودی سروشت و بەو هێزانە بەستووە کە سروشت لەڕووی فیزیاییەوە خستوویەتییە بەردەستی. هێزی با و بوونی ئاو وەک دوو پێدراوی سروشتی زۆر گرنگبوون بۆ مانەوە و بەردەوامیی ژیانی تاک و گروهەکان و لەهەمانکاتیشدا تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەری گەورەیان لەسەر ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری و مەعریفی ئینسان هەبووە و لەناوەوەڕا سنووریکیان بۆ تواناکانی کۆمەڵگا و شێوازەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی داناوە. لەڕووی مەعریفییەوە لەپشتی هەڵکردنی باکانەوە فانتازیایەک ئامادەبوو کە وێناکردنی ئاینی کۆڵەکە سەرەکییەکانی بووە، ئەوەی لە سەرتاسەری گەردوندا خاوەنی با و ئاو زەوی و ئاسمان و هەموو شتەکانی دیکە بووە ئەو هێزە گەردونییە گەورەیەبووە کە ئاینەکان هەزارەها لاپەڕەیان دەربارە نووسیوە و بێبێزاربوون حیکایەتی توانا و ڕەحم و توڕەبوونەکانیان بۆ ئینسان گێڕاوەتەوە. لەپاڵ ئاشی ئاو و پاڕانەوەی ئینسان لە باکان بۆ بژێو، ئاین و سیحر و خورافەت مەعریفەی باڵادەستبوون و ئەوان ئامرازی بەر دەستی ئینسان بوون بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی دونیا. ئینسان لەم دیدەدا هەمیشە بوونەوەرێکی لاواز و پشتبەستوو بووە بەو هێزانە کە بەردەوام خۆیان وەک هێزی گەورەتر و مەزنتر لە توانا و هێزی ئینسان نیشانداوە.

لە بەردەم بوون یان نەبوونی ئاو و هەڵکردن یان هەڵنەکردنی باکاندا پەیوەندییەکانی ئینسان تا ڕادەیەکی زۆر بەرتەسکبوون و ئینسان بەندی ئەو ژینگە بەرتەسکە بووە کە تێیدا ژیاوە. زۆرجار ئەم ژینگەیە لە سنووری گووندێک یان چەند گوندێک تێپەڕی نەکردوە و لەدایکبوون و گەورەبوون و مەرگی ئینسان ئەم جوگرافییە بەرتەسکەی تێنەپەڕاندوە کە تێیدا بەر لەخۆی باو و باپیرانی بەهەمان شێوە تیایدا لەدایکبوون و ژیاون و مردون. لەم سەرزەمینە گوندییەدا ئینسان فۆرمێکی بە شوناسی خۆی بەخشیوە کە مەحکوم بووە بە سنووری بەرتەسکی ژیانی ئەو لەو جوگرافییە واقیعی و خەیاڵییەی شێوە ژیانی دەشتەکییانە پێیبەخشیوە. «فانتازیای گوند» فانتازیای بالادەستبووە و یەکە کۆمەلایەتییەکان یەکەی دابڕاو و بێپەیوەندی و بچووک بوون، ئینسانی ناو ئەم پێکهاتە بەرتەسکە تەنها ئەوانەی بە دۆست و هاوڕێ و برا زانیوە کە ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو بینیونی و لەیەکشوێندا پێکەوە لەگەڵیاندا ژیاوە. دەرەوەی ئەو دنیا کۆمەلایەتییە بەرتەسکە دنیای ململانێ و پێکدادان و کێبەرکێیەکی دوژمنکارانە بووە. ناکۆکی ئەم گوند لەگەڵ ئەویدی و کێشەی ئەم خێڵ لەگەڵ ئەو خێڵی دیکەدا و گرفتی ئەم ناوچە لەگەڵ ئەو ناوچەی دیەکدا فۆرمی سەرەکی ئەو پەیوەندیانەبوون کە لە ئارادابوون.

لەم ناوەندە بەرتەسکەدا شوناسی ئاینی و شوناسی خێڵ و شوناسی ناوچە شوناسی سەرەکی ئینسان بوون. ئەو چوارچێوەیە کۆمەلایەتییەش کە مانای بە ژیانی تاکەکەس و گروهەکان داوەو دەستنیشانی مۆراڵ و ئەخلاقییاتی تاکەکەسیی و کۆمەلایەتی کردوە، سنوورە واقیعی و ڕەمزییەکانی ئەو گروهە بچووکە بووە کە خۆی یەکێک لە ئەندامەکانی بووە، تاکوێ توانیبێتی بڕوا و ببیسێ و بجولێت، تا ئەوێ سنووری گەمەکانی عەقڵ و مەعریفە و فانتازیای کاریکردوە. ئینسانی ئەم قۆناغە بەتەواوی پشتی بە هێزی بازو و هێزی ماسولکەکانی خۆی بەستوە و ئەو مێژووەش بەرهەمی هێناوە دەرەنجامی کارکردنی ئەم هێزە فیزیاییەی ئینسان بووە لەسەر خۆی و کۆمەڵگا و سروشت. ئاین کە ئابووریی کۆمەڵگا بووە کۆڵەکەیەکی سەرەکی کۆڵەکە کولتووریی و ڕەمزییەکانی پێکەوەبوونی کۆمەلایەتی بووە. کۆمەڵگا لەسەر وێناکردنە هیرارکییەکانی ئاین ڕێکخراوە و مۆدێلی خێزان و مۆدێلی کۆمەڵگا یەک مۆدێل بوون.

لەڕووی سیاسییەوە ئاین بە ڕادەیەکی زۆر ژێرخانی شەرعیەتی سیاسی بووە و هیرارکیەتی ئاینی مۆدێلی هیرارکیەتی سیاسیش بووە. وەکچۆن پیاوانی ئاین هەڵگری پیرۆزییەکی دینی بوون، بەهەمانشێوە پادشا و ئەمیر و سەرکردەکانیش هەڵگری هەمان پیرۆزی بوون. ئینتیما بۆ دین و ئینتیما بۆ پادشا بە زەحمەت لەیەکدی جیاکراونەتەوە. شەرعییەتی سیاسی بە پلەی یەکەم لە مافێکی خوداییەوە سەرچاوەی گرتوە و پەرستنی ئاینی بنەماکانی پەرستنی سیاسی بەهێزکردوە. لەم پەرستگا ئاینی و سیاسییەدا هەندێک ئاغا و هەندێک ڕەعیەت، هەندێک حوکمکەر و هەندێک حوکمبەسەرداکراو، هەندێک خاوەن ماف و هەندێک بێماف، هەندێک پیرۆز و هەندێک خاکی، بوون. بەبەردەوامیش کولتوورێک بەرهەمهێنراوە کە بە ڕەعیەت بێدەنگی و بە ئاغا مافی قسەکردنی داوە. لەنێوان فەلاقەکردن و بێدەنگی، ترس و ڕازیبوون و کوشتن و تەسلیمبووندا پەیوەندیەکی ئۆرگانی هەبووە. ئاغا هەم باوک و هەم سەرکردە و هەم خاونی هەموو ئەو دەسەڵاتە شەرعی و ناشەرعییانەش بووە کە پایەکانی هەیمەنەی سیاسی و کولتووری و ڕەمزی بەرهەمهێناوەتەوە. وەکچۆن باوک مافی ئەوەی هەبووە هەم ژیان بە منداڵەکانی ببەخشێت و هەم لێشیان بسێنێتەوە، ئاواش ئاغا مافی هەمان بڕیاردانی دەربارەی ژیانی ڕەعیەتەکانی هەبووە. ئەوەشی ئەم ناهاوسەنگییە کۆمەڵایەتی و یاساییەی پاراستوە گوتارێکی ئەخلاقییە کە لەسەر تێگەیشتنێکی هەڵەی چەمکەکانی ڕێز، گەورە و بچووکی، بێدەنگی، پیرۆزی و دەیان چەمکی دیکەی لەم بابەتە دروستبووە.

لە قۆناغی ووزە و ئامێری هەڵمیندا زۆربەی زۆری ئەو مەسەلانە گۆڕانی ڕادیکاڵ و ڕیشەییان بەسەردا هات. هێزی هەڵمین هێزێکە ئینسان لە سروشتا ئەیدۆزێتەوە، دوای ناسین و تاقیکردنەوە و ئاشنابوون بە توانا و وزەی ئەم هێزە سرووشتییە ڕێگای تایبەت دەزۆزێتەوە تا ئەم هێزە بخاتە سەر توانا و هێزە ماسولکەییەکەی خۆی. لەدوای هێزی هەڵم و هێزی ئامێرەوە ئینسان چیدی وەک بوونەوەرێکی تەنها لەگەڵ سروشتا لە ململانێدا نییە، بەڵکو هێزەکانی ناو سروشت خۆشی دەکاتە هاوڕێی خۆی و تواناکانی ئەوان دەخاتە سەر توانای خۆی. لە زۆرانبازیدا لەگەڵ سروشتدا ئینسان بۆ یەکەمین جار لەوەدا سەردەکەوێت کە هێزەکانی ناو سروشت دەستەمۆکات و دژی سروشت خۆی بیانخاتەوە کار. بەمکارەشی ئینسان هێزە فەردیەکانی خۆی بە هێزی لەبن

نەهاتووی سروشت موتوربە ئەکات و دەبێتە خاوەنی توانایەکی گەورە و لەبن نەهاتوو.

ئەگەر لە قۆناغی ئاشی بادا سروشت جوگرافیایەکی تاریک و نەخوێندراوە و ترسێنەر بووبێت، لەم قۆناغەدا سروشت دەبێتە کتێبێک و ئینسان زمانی فێربوونی خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئەدۆزێتەوە. لە خۆڕا نییە (دیکارت) سروشت بە کتێبێک ناونووسدەکات و دەڵێت بە زمانی سێگۆشە و لاکێشە و چوارگۆشە ئەدوێت. لەم قۆناغەدا سروشت دەبێتە کانگای بەرهەمهێنانی هێز و توانا و وزەی نوێ و ئینسان لەباتی ترس لە سروشت هەوڵئەدات ببێتە ڕکێفکەر و ڕاهێنەر و ئاراستەکەری دیاردەکانی. بە گۆڕانی ماناکانی سروشت و دەستەمۆکردنی هێزە پەنهانەکانی ناوی و کردنیان بە بەشێک لە هێزی ئینسان خۆی، ئینسان دەبێتە خاوەنی کۆمەڵێک توانا و هێز و سەرچاوەی نوێ کە لەمێژوودا تازەیە. لەپاڵ ئەم توانا و هێزە نوێیانەدا ئینسان لەوە تێدەگات کە دەتوانێت سروشت بکاتە بابەتی کارکردنی زانستییانەی خۆی و بەم کارکردنەشی دنیایەکی تەواو جیاواز لە دنیاکانی بەر لەم توانایانە بنیادبنێت. یەکەمین شتێک ئەم هێزە نوێیەی سروشت بە ئینسانی دەبەخشێت بەرفراوانبوونی مەوداکانی جوڵە و سەفەر و ناسینە. لەگەڵ هێزی هەڵمیندا ناوەندی جوڵەی ئینسان بەرفراوانتر دەبێت و بەم بەرفراوانبوونەش پەیوەندییەکانی زیاتر و زیاتر بەڕووی دنیای دەرەوەی بەڕووی خۆی و بەڕووی گەردون و نهێنیەکانیاندا دەکرێتەوە. لەگەڵ هاتنە کایەی ئامێردا قۆناغی سەفەرە دوورەکانی ئینسان دەستپێدەکات، گەڕان بەدوای سەرزەمینە نەناسراوەکان و بڕینی دەریاکان و دۆزینەوەی قووڵاییەکانی بیابان و کەشفکردنی ئاسمان دەبنە بەشێک لە خولیا سەرەکییەکانی ئینسان. بەرامبەر «ئینسانی جێگیر» «ئینسانی گەڕۆک» لەدایکدەبێت، ئینسانێک کە چیدی زەوی کورتنەکاتەوە بۆ گوند و زادگا بەرتەسکەکانی زیندەگی خۆی، بەڵکو دەبێتە پانتاییەکی بەرفراوان و بێسنوور کە نەک تەنها لە ئاستی خەیاڵ و فانتازیادا دەکرێت وێناکرێن، بەڵکو لە ڕووی واقیعیشەوە ببینرێن.

دۆزینەوەی شوێن و شێوە ژیان و کولتوور و شێوە بیرکردنەوی نوێ، بینینی شێوازی دیکەی

لەدوای هاتنەکایەی ئامێرەوە چیدی گوند ناتوانێت بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتییانەی ئینسان و بنەمای فانتازیا و عەقڵ و مەعریفە دەستنیشانکات. ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی نوێ لەدایکدەبێت و بەم لەدایکبووەش سەرلەبەری بنەماکانی فانتازیای ئینسان و وێناکردنەکانی بۆ خۆی و کۆمەڵگا و دنیا و مەعریفە دەگۆڕێت. لەم ساتە مێژووییە گرنگەدا شار لە دایکدەبێت وەک جوگرافیای نوێی ژیانی تاک و گروهەکان. لە دایکبوونی شاری گەورە لەدایکبوونی دنیایەکی تەواو تازەیە، خودی بیرۆکەی کۆمەڵگا لەگەڵ هاتنە کایەی ئەم دنیا نوێیەدا لەدایکدەبێ و سۆسیۆلۆژیا کە زانستی ناسینی کۆمەڵگایە بەپلەی یەکەم زانستی ناسینی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی ناو شارە تازەکانە. لەم قۆناغەدا وردە وردە کۆمەڵە بچووکەکان گەشەدەکەن و دەبنە کۆمەڵگا، لەناوخودی کۆمەڵگاشدا هێزی جیاجیا دروستدەبێت کە کار و پیشە و ئەرک و فەرمانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی جیاجیا پیادەدەکەن. کۆمەڵگا تادێت ئاڵۆز و ئاڵۆزتر دەبێت و ئینسان فێردەبێت کار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دابەشبکات و هەرکەسە و لە بوارێکی تایبەتدا لێزانبێت، شوێنی ئیش و شوێنی زیندەگی لێکدی دادەبڕێن و سنووری کایەی ئابووری و کایەکانی دیکە لەیەکدی جیادەبنەوە. فۆرمە کۆنەکانی پەیوەندی و هاریکاری لاوازدەبن و لەشوێنی ئەوانەدا فۆرمی نوێی هاریکاری لەدایکدەبێت، دورکهایم باس لە گواستەنوە دەکات لە هاریکاری تەقلیدیی و میکانیکییەوە بۆ هاریکاری ئۆرگانی، ڤیبەر باس لە بەعەقلانکیردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری دەکات، مارکس باس لە گواستنەوە لە فیودالیزمەوە بۆ سەرمایەداری دەکات. هەرهەمووشیان لە دیدی جیاوازەوە باس لە دروستبوونی جیهانێکی نوێ دەکەن.

لەم قۆناغەدا هێدی هێدی ستراتیژەکانی زاڵبوونی ئینسان بەسەر سروشتدا دێنەکایەوە. چەند ئەم قۆناغە بەرەوپێشەوە بچێت ئەوەندە بالادەستی ئینسان بەسەر سروشتدا زیاددەکات. خوێندنەوەی کتێبی سروشت، ڕێگا بۆ هاتنەکایەی ڕۆژگاری زانست و عەقڵ و لێکدانەوەی میتۆدییانە خۆشدەکات. مەعریفەی بالادەست دەبێتە مەعریفەی زانستی و دنیا بۆ یەکەمینجار بەشێوەیەکی سیستماتیزەکراو لە ئاین و لێکدانەوە ئاینییەکان دەسێندرێتەوە. دووسەدە دوای دۆزینەوەی ئامێری هەڵمین، جاڕی مەرگی خودا لەلایەن فەیلەسوفەکانەوە لێدەدرێت؛ فەیلەسوفێک ئاین بە تلیاک و ئەویدی بە وەهم و سێهەمیش بە نەخۆشییەکی سایکۆلۆژی بەراورد دەکات.

لەم قۆناغەدا دەوڵەتی مۆدێرن دەچێتە شوێنی فیوداڵە باڵادەستەکان و پەیمانی کۆمەڵایەتی دەچێتە شوێنی پەیوەندی ئاغا و ڕەعیەت و چەمکی هاووڵاتی دەچێتە شوێنی چەمکی برای دینی و ڕەعیەت. هەموو ئەمانەش وادەکەن فەلسەفەیەکی سیاسی تازە لەدایکببێت کە وێناکردنێکی تازەی چەمکەکانی کۆمەڵگا، دەسەڵات، تاکەکەس، هاوڵاتی، ماف، ئەرک هتد.. پێشنیاربکات. شوناسی سەرەکی ئینسان دەبێتە شوناسی نەتەوەیی و فانتازیای نەتەوەیی شوێنی فانتازیاکانی بەر لە دروستبوونی نەتەوە دەگرێتەوە.

بەڵام هەر لەم قۆناغەدا بۆ یەکەمینجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تواناکانی ئینسان لە تێکدان و وێرانکردن و بەرپاکردنی جەنگ و کوشتاری بە کۆمەڵدا دەگاتە ڕادەیەکی کوشندە و وێرانکەر. تەکنیک کە هەموو تواناکان زیاد دەکات، لەگەڵیشیدا توانای کوشتن و وێرانکردنیش زیاد ئەکات. کۆڵۆنیالیزم و جەنگە جیهانییەکان و جینۆساید بەرهەمی ئەو هێز و توانا تەکنیکییە نوێیانەن کە ئینسان دوای دۆزینەوەی ئامێر بەدەستیاندەهێنێت. بۆ یەکەمینجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گۆی زەوی دەکەوێتە بەر مەترسی وێرانبوونێکی سەرتاسەریەوە. لە خۆڕا نییە لە ڕۆژگاری مارکسەوە بەردەوام قسە لەوە دەکرێت کە مرۆڤایەتی لە ئەگەری بەربەربەریەت ڕزگاری نەبووە. دروشمی یان سۆسیاڵیزم یان بەربەریەت لەزۆر ڕووەوە دەربڕی ئەم ناکۆکیە دوو لایەن و قووڵەی ڕۆژگاری تەکنیک و ئامێر و بیرۆکەی «پێشکەوتن» ی بێسنوورە.

کوشتنی بە کۆمەڵ، فاشیزم، نازیزم و کۆمۆنیزم هەموویان بەرهەمی ڕۆژگاری ئامێرن وەکچۆن دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و لیبرالیزم و مافی چارەی خۆ نووسین و بیرۆکەی ئازادی تاکەکەس و عەقڵانیەتیش بەرهەمی هەمان ڕۆژگارن. ئامێر هەم ڕووی ڕووناک و هەم ڕووی تاریکی هەیە، هەم بەهەشت و هەم جەهەنەمی خۆی هەیە.

### ٣- قۆناغی کۆمپیوتەر

قۆناغی کۆمپیوتەر تا ڕادەیەکی زۆر قۆناغی هەرچی زیاتر گەشەکردنی هێزی هەڵم و هێزی ماشێن و هێزی ئامێرە. بێگومان جیاوازییەکی گەورە لەنێوان قۆناغی ئامێر و قۆناغی کۆمپیوتەردا هەیە. لە قۆناغی کۆمپیوتەردا تەکنیک تەنها کارە ماسولکەییەکانی ئینسان ئاسان ناکات، یارمەتییەکانی تەکنیک بۆ

ئینسان بەتەنها یارمەتی فیزیایی نین. بە مانایەک لە ماناکان تەکنیک لە قۆناغی کۆمپیوتەردا لەباتی ئینسان و لەشوێنی عەقڵ و تواناکانی ئینسان لە بیرکردنەوەدا کاردەکات. تواناکانی کۆمپیوتەر بەپلەی یەکەم توانای بیرکردنەوەی عەقڵین و یارمەتییەکانی ئەم ئامێرە تازەیە بۆ ئینسان بەپێچەوانەی یارمەتی سلنگ، مەکینەی جووت یان تۆڕبین، یارمەتییەکی ماسولکەیی نیین، بەڵکو یارمەتی و کۆمەکی عەقڵیی و فانتازین. لە قۆناغی کۆمپیوتەردا ئەوەی ئینسان بە تەکنیکی دەبەخشێت میکانیزمەکانی بیرکردنەوە و لێکدانەوە و دۆزینەوەی پەیوەندین نەک هێزی ماسولکە و بازو. ئینسان لێرەدا کارە عەقڵییەکانی خۆی بەو ئامێرانە دەبەخشێت کە بە ئاسانی دەتوانن ئەم توانایانە بەرجەستەکەن و لەزۆر ڕووەوە وردتر و خێراتر و بەرفراوانتر بەکاریبهێنن. کۆمپیوتەر پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان ئینسان و ئامێردا دروستدەکات جیاواز لە پەیوەندی نێوان ئینسان و ئامێرەکانی دیکە. لەبەردەم کۆمپیوتەردا ئینسان لەبەردەم بوونێکدایە کە بیردەکاتەوە و حیساباتی و رد و زەحمەت دەکات، نەک لەبەردەم ئامێرێکدا کە تەنها هەڵگری توانایەکی فیزیایی ڕووت بێت.

لەڕووی توانای پەیوەندیکردنەوە قۆناغی کۆمپیوتەر قۆناغی سڕینەوەی سنوورەکان و تێکەڵبوونی جوگرافیا و زەمەنە جیاوازەکانە بەیەکدی. لەدوای کۆمپیوتەرەوە ناتوانین قسە لە سنوورێکی نەتەوەیی و ناوچەیی بکەین تواناکانی تەکنیکی نوێ نەتوانێت بیانبەزێنێت. ئینتەرنێت سنووری نیشتیمانە جیاوازەکان ناناسێت و لەکوێدا هێڵی پەیوەندی ئەلەکترۆنی هەبێت ئەو لەوێدا ئامادیە. لەم قۆناغەدا دنیا جارێکی دیکە دەبێتەوە بە گوند، بەڵام گوندێک شوێنی هەموو مرۆڤایەتی تێدابێتەوە، گوندێک کە شەقامێکی لە نیویۆرک و گەڕەکێکی لە ئەمستردام و کۆڵانێکی لە سلێمانییە. لەم قۆناغەدا تواناکانی ئینسان لە پەیوەندیکردندا دەبێتە توانایەکی خەیاڵی. جیهان دەبێتە کۆمەڵێک زانیاری و داتای کۆمپیوتەری و دەڕژێتە ناو ژووری نووستنەکانمانەوە، (بێگومان ژوری نووستنی ئەوانەی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و توانای پەیوەندیکردنی ئەلەکترۆنیان هەیە).

لەم قۆناغەدا ئەوەی دەکوژرێت دوورەپەرێزییە، لەدوای کۆمپیوتەر و تەکنیکە نوێکانی پەیوەندیکردنەوە ناتوانین چیدی دەرگای ژوورەکانمان داخەین و

دیوارێک لەنێوان خۆمان و دنیای دەرەوەماندا هەڵچنین. لە گوندێکی گەردوونیدا هەمووان دیتراون و هەمووان توانای ئاگاداربوونیان لە یەکدی هەیە و هەمووان بەشدارن لە پەیوەندیکردندا (بێگومان ئەمە بەو مانایە نییە کە هەمووان هەمان شانسی دەرکەوتن و دیتن و پەیوەندیکردنیان هەیە، هەموو ئەم میکانیزمانە پابەستی توانا و دەسەلات و شوێن و جێی هێزە جیاوازەکانن لەناو نەخشەی نوێی جیهاندا و لەڕاستیشدا جیهانی نایەکسانییەکان لەپاڵ ئەم داهێنانە نوێیانەدا سەرلەنوێ بەرهەمهێنراونەتەوە و لەزۆر ڕووەوە نایەکسانییەکان گەورەتر بوون). ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا ڕوودەدات لە نیویۆرک پێیدەزانرێت و ئەوەی لە بەرلین ڕوودەدات لە هەولێر پێیدەزانرێت. زەحمەتە لە سەردەمانی ئینتەرنێتدا نهێنییەکان بشاردرێنەوە.

کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت ڕەمزی لەدایکبوونی ئەو چوارچێوە مێژووییەن کە بە جیهانگیری ناودەبرێت. بەبێ لەدایکبوونی ئەم توانا گەورەیەی پەیوەندیکردنی ئەلەکترۆنی چوارچێوەیەک بەناوی جیهانگیرییەوە دروستنەدەبوو. دروستبوونی ئەم چوارچێوەیەش هۆکاری هاتنەکایەی کۆمەڵێک گۆڕانکاری گەورە گەورەن کە ڕۆژانە هەمووان ڕووبەڕوویان دەبینەوە. لەم چوارچێوەیەدا ماناکانی کۆمەڵگا، نەتەوە، شوناس، مەترسی وخودی سروشت خۆشی گۆڕانی گەورە گەورەیان بەسەردادێت. کۆمەڵگا چیدی یەکەیەکی کۆمەڵایەتی داخراو نییە لە سنوورێکی جوگرافی دیاریکراودا، چیدی مانای دیاردە کۆمەلایەتییەکان بەتەنها سنوورە جوگرافییەکان و سەرزەمینە نەتەوەییەکان دەستنیشانیان ناکەن. ئەمڕۆ دیاردە لۆکاڵییەکان لە پەیوەندییەکی ئاڵۆز و فرەلایەندا لەگەڵ دیاردە گلۆباڵییەکاندا. ناتوانین بە ئاسانی چەمکەکانی «دەرەوە» و «ناوەوە» ی لەیەکدی جیاکەینەوە، زەحمەتە بتوانین دەستنیشانی ئەوە بکەین کوێ دەرەوەیە و کوێ ناوەوە، کام فاکتەر دەرەکییە و کام فاکتەر ناوەکی، چی گلۆباڵەو چی لۆکاڵ. گلۆباڵ و لۆکاڵ، سیاقی ناوەکیی و سیاقی دەرەکیی، ناوچەیی و جیهانی بەشێوەیەکی چڕ بەناویەکدا چوون و لێکجیاکردنەوەیان لەزۆرکاتدا مەحاڵە. بەمانایاک لە ماناکان جیهانگیری بریتییە لە هاتنە کایەی ئەم پێکهاتە ئاڵۆزەی پەیوەندی نێوان شوێن و زەمەن و مانا جیاجیاکان. نەمانی مەسافە لەنێوان دەرەوە و ناوەوەدا، ئامێزانی لۆکاڵ بە گلۆباڵ، تێکەڵبوونی زەمەنی ناوەوە بە زەمەنی دەرەوە ئەو جیهانە نوێ و ئاڵۆزەیە کە کۆپیوتەر و توانای پەیوەندیی ئەلکترۆنی لە سی ساڵی ڕابووردودا دروستیکردوە.

لەم قۆناغەدا هەندێک ڕەهەندی کۆمەڵایەتی ژیانی ئینسان ورده ورده لەوە نزیکدەبێتەوە ببێتە داهێنراوێکی کۆمپیوتەری، بەدەیان و سەدان و هەزاران گروهی گریمانکراوی کۆمپیوتەری دروستبوون، ئەم گروهانە لەزۆر ڕووەوە هەمان کاریگەرییان لەسەر ژیان و بیرکردنەوە و فانتازیاکانی ئینسان هەیە وەک ئەو گروهانەی تر کە لە واقیعدا ئامادەن. ئەمڕۆ بەدەیان کتێبی نوێ لەسەر ئەنترۆپۆلۆژیا و سۆسیۆلۆژیای ئەو گروپانە نووسراون کە تەنها لەناو کۆمپیوتەردا هەن و لە واقیعدا بوونیان نییە. بۆ نموونە سەدان و هەزاران گروهی ڕاگۆڕینەوە و گفتوگۆ و شەڕە جنێو درووستبوون کە یەکێکیان لە نیکاراگوایە و ئەویدیان لە ڕوسیا و سێهەمیان لە میسر و چوارەمیان لە ئەڵمانیا. ئەمانە لەناو کۆمپیوتەردا و لەڕێگای ئینتەرنێتەوە دەتوانن «پێکەوە» بدوێن و «پێکەوە» ڕابگۆڕنەوە و «پێکەوە» ئامادەبن، بەڵام کە کۆمپیوتەرەکەت کوژاندەوە بوونیان نامێنێت. واتە ئەمانە کۆمەڵێک فۆرمی نوێی گروپن کە تەنها لەناو کۆمپیوتەردا و لەڕێگای پەیوەندی ئەلەکترۆنییەوە دروستدەبن، دەنا لە واقیعی ڕۆژانەدا وەک گروپ بوونیان نییە.

### ٤ـ کۆمەڵگای کوردی و ئینتەرنێت

بێگومان لە هەلومەرجی کۆمەڵگای ئێمەدا ئەم مەسەلانە بەم خەستییە ئامادەنین و لەم ڕووەوە ئەم شتانە قسە لە ئاییندەی ئێمە دەکەن نەک لە ئێستامان. بەڵام ئەم ڕاستییانە ئەوە ناگەیەنن کە ئێمە لەدەرەوەی ڕۆژگاری ئینتەرنێتدا دەژین. با تەماشای کۆمەڵگای کوردی سەرەتای ساڵانی دوو هەزار بکەین، بەباوەڕی من چیدی ناتوانین کۆمەڵگای کوردی کورتبکرێتەوە بۆ دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە جوگرافییەی دەکەوێتە نێوان شارە کوردییەکانی ناو تورکیا و ئێران و عێراق و سوریاوە، کۆمەڵگای کوردی ئەمڕۆکە بەشێکی لە هەولێر و بەشەکەی دیکەی لە سوید، لایەکی لە سلێمانی و لایەکی دیکەی لە بەرلین، تۆزێکی لە دیاربەکر و تۆزەکەی دیکەی لە برۆکسل، سەری لە مەهاباد و پێکانی لە فرانکفۆرتن. ئەوەشی ئەم بەشە جیاوازانە بەیەکدیەوە دەبەستێتەوە تەکنیکە تازەکانی پەیوەندیی کۆمپیوتەرییە. بۆیە گەر کەسێک ئەمڕۆکە بیەوێت پێناسەی کۆمەڵگای کوردی بکات چیدی ناتوانێت ئەم پێناسەیە تەناه بە دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە جوگرافییەوە ببەستێەوە کە نەوەکانی بەر لە ئێمەی

تێیدا ژیاون. واتە ناتوانێت دیاردەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە تەنها لە سیاقە لۆکاڵیەکانی ناوخۆدا بخوێنێتەوە و چاو لەو هەموو ڕایەڵە ئەلەکترۆنیانە بنووقێنێت کە ئەم کۆمەڵگایە بەدەرەوەی خۆیەوە گرێدەدات.

ئەوەی بیەوێت لە کۆمەڵگای کوردی سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم ڕابمێنێت دەبێت تەماشای بەشێکی گەورەی گۆی زەوی بکات و لەو پەیوەندییانە ڕامێنێت کە ئەم کۆمەڵگایە لەڕێگای تۆڕی پەیوەندییە ئەلکترۆنییەکانەوە و لە چوارچێوەی جیهانگیریدا لە گەڵە دەرەوەی خۆیدا دروستدەکات. بێگومان ئەم دۆخە بەهیچ مانایەک دۆخێکی تایبەت نییە بە میللەتی ئێمە لەناو نەخشەکانی دنیای هاوچەرخدا، بەڵکو دۆخێکی گشتییە و زۆربەی میللەتانی تری سەر ئەم ئەستێرەیە لەناویدا ئامادەن، جا چ میللەتە بچووکەکان بێت یان گەورەکان، بەهێزەکان یان بێهێزەکان.

هەر ئەم ڕاستییە سادەیەش وا لە هەندێک سۆسیۆلۆژ دەکات پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە گرەوی سەرەکی سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخ لەوەدایە چۆن بتوانێت قسە لەسەر دیاردە کۆمەلایەتییەکانی دنیای هاوچەرخ بکات بەبێ ئەوەی چەمکی «کۆمەڵگا» بەکاربهێنێت. بەباوەڕی ئەم سۆسیۆلۆژانە چەمکی کۆمەڵگا چەمکێکە سەر بە سۆسیۆلۆژیای سەدەی نۆزدەهەم و قۆناغی بنیادنانی دەوڵەتی نەتەوەیە، لەڕۆژگاری جیهانگیریدا ئەم چەمکە ناتوانێت وەک چوارچێوەی ڕوودانی ڕووداوە کۆمەلایەتییەکان تەماشابکرێت.

لەژێر کاریگەری ئەم گۆڕانکارییانەدا چەمکی نیشتیمانیش گۆڕانی گەورە گەورەی بەسەردا هاتووە، نیشتیمان چیدی بەتەنها جوگرافیاییەکی واقیعی نییە، واتە شوێنێک نییە تۆ دیبێتت و تێیدا ژیابیت و پێی ئاشنابیت، بەڵکو جوگرافیاییەکی خەیاڵیشە، شوێنێکە دەشێت نەیناسیت و نەدیبێت و تیا نەژیابیت. نەخشەکانی نیشتیمان چیدی بەتەنها لەناو واقیعێکی جوگرافیی لۆکاڵیدا نییە بەڵکو لە لەنێو ئامرازە تەکنیکییەکانی پەیوەندی نوێشدایە. لەمڕۆ بەدوا نیشتیمان وێنەیەکە بەشێکی بەرچاوی لەنێو شاشەی کۆمپیوتەر و نێو فاکس و نێو نامەکانی ئینتەرنێت و بەرنامەی تەلەفیزۆنە ساتالایتیەکاندا بەرهەمدەهێنرێت. نەوەیەک لە دروستبووندایە کە نیشتیمان لەناو وێنەکانی کۆمپیوتەر و تەلەفیزۆن و نامە شەخسییەکاندا دەناسێت.

ئەوەی لەم ڕەوتە تەکنیکی و کۆمەڵایەتییەدا لەپاڵ چەمکی نیشتیماندا گۆڕانی بەسەردادێت چەمکی شوناسە. هەمیشە شوناس چەمکێک بووە لە چوارچێوەی نیشتیمانێک و کولتوورێکی دیاریکراودا پێناسکراوە و ڕاستەوخۆ بە گروهێکەوە بەستراوەتەوە کە نیشتەجێبووە و تاڕادەیەک لە ڕووی جوگرافی و کولتووری و ئابوورییەوە داخراو بووە، یان لانیکەم سنوورەکانی خۆی لە سنوورەکانی دەرەوەی خۆی جیابووە. بەڵام لەدوای ئەو هەموو گۆڕانکاریانەوە کە باسمانکرد چیدی شوناس بەتەنها لەپاڵ پێدراوە لۆکاڵی و ناوچەییەکانی ناو نیشتیمان و کولتووری ناو نیشتیماندا بەرهەمناهێنرێت، بەتەنها ژینگەی ڕاستەوخۆی ئامادەگی ئینسان ژینگەی هەڵهێنجانی ماناکان و پێناسەکان و پەیوەندییەکان نییە، لەگەڵ ئینتەرنێتدا ئەو توانایانە هاتۆتە کایەوە کە هەموو جیهان ببێتە سەرزەمینی پەیوەندی ڕۆژانە و ببێتە سەرزەمینی بەرهەمهێنانی مانا و شوناس. لەم دنیا کۆمپیوتەرییەدا ئینسان نەک تەنها لەگەڵ گروهە واقیعییەکانی ناو واقیعدا ئەدوێ و ئەژی و مانا و پێناسەکان ئاڵۆگۆڕدەکات، بەڵکو لەگەڵ ئەو دەیەها و سەدەها گروهە گریمانکراوانەی دیکەشدا دەدوێت کە لە ناو «وێب ساید» و لاپەڕەکانی ئینتەرنێتدا ئامادەن. لە دۆخێکی وادا شوناسە سادە و یەکڕەهەندییەکان قەیراناوی دەبن و قۆناغی شوناسە ئاڵۆزەکان دێتە کایەوە. بیرۆکەی فرەدەنگی ،جیاوازیی، بەناویەکداچوون و تێکەڵبوونی گلۆباڵ بە لۆکاڵ وادەکات ئینسان هەمیشە لەبەردەم ڕستێک ئەگەر و توانای هەڵبژاردن و داڕشتنی شووناسی تازەدا بێت. ئەمەیە وادەکات نوێنەرانی شوناسی تاکڕەهەندی و نوێنەرانی شووناسی تەقلیدی ترسیان لێبنیشێت و قریشکەی غەزوی کولتووری و نامۆبوونی کولتووریی و لەداستدانی ئاینیان لێبەرزبێتەوە. بەم مانایە ئوسوڵییەت، چ لە چاپە ئاینییەکەیدا و چ لە چاپە عەلمانییەکەیدا، شتێکی دیکە نییە جگە لە ترس و تۆقینی شوناسی تەقلیدی و یەکڕەهەندی لە هەلومەرجی هاتنەکایەی شووناسی ئاڵۆز و کراوە و فرەڕەهەند.

# ئێدوارد سەعید
## پیاوی نێوان فەرهەنگەکان و شارستانیەتەکان

**١. خەڵاتی سینۆزا**

ڕۆژی چوارشەمە ڕێکەوتی ٢٤ـ١٠ـ١٩٩٩ لە هۆڵی کەنیسەی «نیو کێرک» لە شاری «لاهای» لە هۆڵەندا، نووسەری فەلەستینی ـ ئەمریکی، ئێدوارد سەعید، خەڵاتی سپینۆزای پێبەخشرا. ئەم خەڵاتە کە دەشێت وەک نۆبڵی هۆڵەندا ناوببرێت هەردوو ساڵ جارێک دەدرێت بەو کەسانەی لە بوارە جیاجیاکانی فیکری ئینسانیدا خاوەنی داهێنانی گەورەن و ڕۆڵیان هەبووە لە گۆڕینی دید و تێڕوانین و بۆچونە باو و باڵادەستەکاندا و لە ڕووی میتۆدی و مەعریفییەوە تازەگەربوون. ئێدوارد سەعید یەکەمین کەسە ئەم خەڵاتە وەردەگرێت.

پێشئەوەی بێمە سەر باسکردنی خەتەگشتیەکانی فیکری سەعید و ئەو هۆکارانەی وایانکردوە ئەم نووسەرە خەڵاتی سپینۆزای پێببەخشرێت، وای بەباش دەزانم چەند سەرنجێکی خێرا دەربارەی سپینۆزا بخەمەڕوو، چونکە بەخشینی ئەم خەڵاتە بە سەعید لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە کە وێکچوونێکی گەورە هەیە لەنێوان سپینۆزای فەیلەسوف کە جولەکەیەکی ئاوارەبووە و سەعیدی ڕەخنەگری کولتووری کە فەلەستینییەکی ڕاونراوە. لەڕاستیدا بەخشینی خەڵاتی سپینۆزا بە سەعید ئەو ڕاستییە گرنگە دووبارەدەکاتەوە کە بیرکەرەوە ڕەخنەییە گەورەکان برای یەکدین لە داهێنانی فیکریدا، گەرچی ناکۆکی گەورە لەنێوان میللەتەکانیشیاندا لەئارادابێت، ناکۆکیەک بە قەبارەی ناکۆکی نێوان فەلەستینیەکان و جولەکەکان.

«کێرکی نوێ» کە سەعید خەڵاتەکەی تێدا وەرگرت کەنیسەیەکە تەمەنی ٣٥٠ ساڵە و ماوەیەک ئارامگەی گۆڕەکەی سپینۆزا بووە بەرلەوەی گۆڕەکە هەڵبدرێتەوە و تەرمەکەی سپینۆزا دەربهێنرێت و بسوتێنرێت و خۆڵەمێشەکەی بەسەر بەشی دواوەی زەوی پشتی کەنیسەکەدا پەرشوبڵاو بکرێتەوە.

سپینۆزا گەرچی لە شاری ئەمستەردام لەدایک بووە و وەک یەکێک لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی هۆڵەندا ناسراوە بەڵام بە ڕەچەڵەک هۆڵەندی نەبووە. سپینۆزا کوڕی جولەکەیەکی پۆرتوگاڵییە کە لە سەدەی هەڤدەهەمدا لە دەست زەبروزەنگی دژ بە جولەکە لە پورتوگاڵەوە بۆ هۆڵەندا هەڵاتوە. باوکی سپینۆزا بازرگانێکی دەوڵەمەند بووە. بەهۆی توندڕەوی پیاوە ئاینییەکانی مەسیحییەتەوە جولەکەیەکی زۆر لەو سەردەمەدا لە ئیسپانیا و پورتوگاڵەوە بەرەو هۆڵەندا ڕایانکردوە، بەشێکی زۆری ئەم ڕاکردووانە بازرگان و خوێندەوار و ڕۆشنبیرە گرنگەکانی سەردەمی خۆیان بوون. لەو ڕۆژگارەدا سیستەمی کۆماریی هۆڵەندا لەڕووی سیاسی و کولتووری و ئاینییەوە یەکێک لە کراوەترین و لێبووردوترین سیستەمەکانی ئەوروپا بووە. بۆیە بەهەزاران پەناهەندەی جیاجیا لە فەرەنسا و پۆرتوگاڵ و ئیسپانیا و شوێنەکانی دیکەی ئەوروپاوە ڕوویان تێکردوە.

سپینۆزا لە هۆڵەندا لە منالی جولەکەیەکی هەڵاتوەوە دەبێت بە گەورەترین فەیلەسوفی ئەو وڵاتە و کاریگەرییەکی گەورە لەسەر ژیانی فیکری و سیاسی و کولتووری هەموو ئەوروپای سەدەکانی دواتر بەجێدەهێڵێت. لەسەر هەمان هێڵ ئێدوارد سەعیدیش لە کوڕی پیاوێکی فەلەستینی هەڵاتووەوە بۆ میسر دەبێتە یەکێک لە بیریارە گەورەکانی ئەمریکا و کاریگەرییەکی گەورە لە سەر زیاد لە بوارێکی فیکریدا لە سەرجەمی جیهاندا بەجێدەهێڵێت.

ئەوەی لەپەیوەندیدا بە خەڵاتی سپینۆزاوە گرنگە هێمای بۆ بکەین ململانێی سەرسەختی سپینۆزایە دژ بە دەسەڵاتدارانی ئاینی جولەکە و هەموو ئەو دەسەڵاتدارانەی دیکەش کە ویستوویانە ئاین و سیاسەت بەیەکدی تێکەڵ بکەن. سپینۆزا یەکێک لەو فەیلەسوفە گرنگانەی فیکری هاوچارخە کە داکۆکی لە تێکەڵنەکردنی سیاسەت و ئاینی کردوە، ئەو باوەڕی وابوو کە نابێت پیاوانی ئاین دەستوەردەنە کاروباری سیاسیەوە وەکچۆن پیاوانی سیاسەت نابێت ڕۆڵی سەرکردەی ئاینی ببینن. جگە لەم جیاکردنەوە گرنگەی نێوان دەسەڵاتی دینی و دەسەڵاتی سیاسی کە یەکێک لە کۆڵەکە هەرە سەرەکییەکانی تازەکردنەوەی سیاسییە، سپینۆزا بانگێشەی ئەوەشی دەکرد کە پێویستە کەنیسە و سیناگۆگ و دامەزراوە ئاینییەکان لەژێر دەسەڵایی دەوڵەتدا بن، نەک لەژێر دەسەڵاتی ئەو قەشە و حاخام و ئیمامانەدا کە بە ئارەزووی خۆیان دەقە ئاینییەکان

لێکدەدەنەوە و بەم لێکدانەوانەشیان کێشەی گەورە بۆ خەڵک و دەوڵەت و کۆمەڵگا دروستدەکەن. سپینۆزا باوەڕێکی تەواوی بە ئازادی ئاین هەبوو، یەکێک لە داکۆکیەرە سەرەکییەکانی لێبوردنی ئاینی بوو، ئەو باوەڕی وابوو کە پێویستە ئاینەکان بەرامبەر بەیەکدی لێبوردووبن و توانای ژیانی پێکەوەبوونیان هەبێت.

ئەم بۆچوونانەی سپینۆزا وایانکردوە لە فیکری فەلسەفیدا بەیەکێک لە کۆڵەکەکانی عەقلانیەت و عەلمانیەت بناسرێت، هەر ئەم بۆچوونانەشیەتی وایکردوە کە وەک یەکێک لە ڕەخنەگرە گەورەکانی سەدەی هەڤدەهەم بناسرێت.

لەسەر هەمان نەزمی سپینۆزا ئێدوارد سەعیدیش پیاوێکی عەلمانی و ڕەخنەگرێکی گەورەی توندڕەوی دینی و سیاسییە. ئێدوارد سەعید میتۆدێک لە بیرکدنەوە و بەرخورد و ڕاڤەکردن پێشکەشدەکات کە لە چۆنیەتی تێکەڵبوونی مەعریفە و دەسەڵات، لە چۆنیەتی پێدزکەکردنی نایەکسانییە سیاسییەکان بۆناو فیکر و وێنە و وێناکردنەکان، ئاگادارمان دەکاتەوە. لە پشتی ئەم دیدە ڕەخنەییەی سەعیدەوە هەوڵی هاتنەکایەی جۆرێکی نوێی تێفکرینی ئینسانگەرایی، هیمونایزم، لە ئارادایە کە مافی قسەکردن و گێڕانەوە و ویستی ئازاد بەهەرکەسێک بدات و ئەو نایەکسانیانە بنبڕبکات کە سیاسەت لە مەعریفەدا دروستیاندەکات.

سپینۆزا لە تەمەنی ٢٤ساڵیدا لەلایەن پیاوە ئاینییەکانی جولەکەوە لە شاری ئەمستەردام بە ڕەسمی لە دایەرەی جولەکەکان دەرکرێت، ئەوان لێناگەڕێن سپینۆزا سەر بە هیچ شوێنێکی پیرۆزی جولەکەکاندا بکات و بێبەشیشی دەکەن لەهەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی ئاینی و ئەتنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم گروپە. ئەم کارە بۆ ئەو ڕۆژگارە هەم زۆر زەحمەت و هەم جێی مەترسیش بووە، چونکە نەخشە و مەقامی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە بەپلەی یەکەم نەخشە و مەقامێکی ئاینی بووە و تاکەکەس پەناگەیەکی ئەوتۆی لەدەرەوەی ژیانی گروپە ئاینییەکاندا نەبووە پەنای بۆببات. هەر لەو ڕۆژگارەدا باوکی سپینۆزا دەمرێت، ئەمەش وادەکات سەرەڕای گیرۆدەبوونی بەدەست کێشە تایبەتەکانی ژیانی خۆیەوە ڕووچاری ئەو کێشە بازرگانیانەش ببێت کە باوکی بۆی بەجێدەهێڵێت. سپینۆزا لەماوەیەکی کورتدا ئیفلاس ئەکات و بازرگانییەکە پەکیدەکەوێت و بێدەرامەت دەمێنێتەوە. دواتریش بەشێوەیەک بارودۆخی ژیانی تێکدەچێت کە ناتوانێت کرێ

خانوی ماڵەکەی بدات، بۆیە ناچار دەبێت ماوەیەکی درێژ لە ژێر زەمینێکا لەبارودۆخێکی هێجگار سەختدا بژی.

کتێبە گرنگەکەی سپینۆزا، «نامەیەک سەبارەت بە لاهوت و سیاسەت»، یەکێکە لە مانیفێستە سیاسیە گرنگەکانی مۆدێرنە. لەو کتێبەدا سپینۆزا ڕەخنەیەکی توند لە حوکمی ئاینی دەگرێت و بەرگرییەکی سەرسەختیش لە تێکەڵنەکردنی ئاین بە سیاسەت دەکات، بەهۆی ئەمەوە کتێبەکە لەساڵی ١٦٤٦، سەرەڕای کراوەیی سیستەمی سیاسی و کولتووریی هۆڵەندی، یاساغدەکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێجار بە قاچاغی چاپدەکرێت و بەناو نووسەر و خوێندەوارانی ڕۆژگاری خۆیدا دەستاودەست دەگەڕێ تا شازدە ساڵ دوای مردنی سپینۆزا بۆ یەکەمینجار بە ئاشکرایی چاپدەکرێت.

لەم ئاستانەشدا وێکچوونێکی زۆر لەنێوان سپینۆز و سەعددا هەیە. سەعید وەک سپینۆزا ڕۆشنبیرێکی عەلمانی و ڕەخنەییە بە ڕادەیەک کتێبەکانی سەعیدش لەلایەن ئەو دەسەلاتە سیاسییەوە یاساغدەکرێت کە یاسر عەرەفات بەناوی فەلەستینییەکانەوە پیادەیدەکات.

بەکورتی زۆرن ئەو خاڵانەی کە سپینۆزا و ئێدوارد سەعید بەیەکەوە گرێدەدەن، هەردووکیان لەبەر کێشەی سیاسی و ئاینی هەڵاتوون و نیشتیمانی خۆیان جێهێشتوە. وەک چۆن سپینۆزا لەدەرەوەی ئەو کۆمەڵگایەدا بووە کە کۆچی بۆ کردوە و نەیتوانیوە لەناویدا ئارامبێت و سەرپێیانە دەمجببێت، ئاواش سەعید لەدەرەوەی ئەو کۆمەڵگایەدایە کە کۆچی بۆ کردوە و نایویەتی و تێیدا جێگیر بووە. هەم سپینۆزا و هەم سەعید دوو مەنفی فیکری و حەیاتی و کولتوورین، دوو پیاوی نێوان فەرهەنگ و سنوور و شووناسە جیاجیاکانن. هەردووکیان کۆسمۆپۆلیتێکی ڕەخنەیی و داهێنەر و ئینسانین. لێرەوە بەخشینی ئەم خەڵاتە بە ئێدوارد سەعید بەخشینییەتی بە دنیا فیکری و فەلسەفی و کولتووریە داهێنەرەکەی ئەم پیاوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە بەدەیان ڕایەڵی جیاجیاوە بە سپینۆزا و عەقڵانیەتی سپینۆزای سەدی هەڤدەهەمەوە گرێدراوە، ئەگەرچی میللەتەکانیان، وەک جولەکە و وەک فەلەستینی، ئەمڕۆکە یەکێک لە خوێناویترین کێشەکانی سەدەی بیستەم بۆ سەدەی بیست و یەکەم بێچارەسەر دەگوێزانەوە، ئەگەرچی هێزە دینی و

ناسیۆنالیستییە پەرگیرەکانی ئەم دوو میللەتە تادێت دنیا ناشیرینتر و خوێناویتر و نائینسانیتر دەکەن.

## ٢. هێڵە گشتییەکانی بیری سەعید

ئەو کێشە سەرەکییەی فیکری ئێدوارد سەعید لە ٢٥ ساڵی ڕابووردودا و لەزیاد لە چەند کتێبێکدا پێوەی خەریکە کێشەی ناسین و تێگەیشتن و شیکردنەوەی ئەو پەیوەندیانەیە کە «ڕۆژئاوا» بەدەرەوەی خۆیەوە گرێدەدات. لەکتێبی «ئۆریانتالیزم» یان «ڕۆژهەڵاتناسی»دا، سەعید ئەو پەیوەندییانە شیدەکاتەوە کە «ڕۆژئاوا» بە «ڕۆژهەڵاتەوە»، گرێدەدات، بەتایبەتی ئەو پەیوەندیانەی کە ڕۆژئاوا بە جیهانی ئیسلامەوە، دەبەستێتەوە. لە کتێبی «کولتوور و ئیمپریالیزم» دا، کە لە ساڵی ١٩٩٣ دا چاپکراوە، سەعید ڕووبەی پەیوەندییەکانی ڕۆژئاوا بەدەرەوەی خۆیەوە گەورەتردەکات و لەو پەیوەندییانە ئەدوێت کە ڕۆژئاوا بە بەشەکانی دیکەی جیهانەوە گرێدەدات لەوانە ئەفریقا، ئەمریکای لاتین، ئوستراليا، ئاسیای دوور و هیند و دەریای کاریبی، هتد... بۆ تێگەیشتن لەم پەیوەندییانە سەعید بەشێکی گرنگی ئەو تێکستە ئەدەبی و فەلسەفی و سیاسی و ئابووری و ڕۆژنامەگەرییە جیاوازانە دەخوێنێتەوە کە لە دوو سەدەی ڕابووردوودا نووسراون و ڕەهەندە جیاجیاکانی دەرکەوتنی ئەم پەیوەندییە بەرجەستەدەکەن و بەسەریەکەوە ئەو کایە فیکرییە گەورەیە دروستدەکەن کە پێیدەگوترێت ئۆریانتالیزم، الاستشراق.

کەواتە سەعید نووسەرێکە خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆژئاواوە خەریکدەکات و لەدوی دۆزینەوە و نیشاندان و ڕاڤەکردنی ئەو میکانزیمە کولتوورییانەیە کە ڕۆژئاوا بەدەرەوەی خۆیەوە گرێدەدات. سەعید لەم کارەیدا گرنگییەکی گەورە بەو ڕەوتە مێژووییە تایبەتە ئەدات کە ئەم تێکست و وێنە و نمایشە کولتوورییانەی تێدا بەرهەمهاتووە و لەو ڕەوتەدا بەرهەمە کولتوورییەکانی ڕۆژئاوا نیشتەجێدەکات. مەبەست لەو ڕەوتە مێژووییە تایبەتەش ڕەوتی ئیمپریالیزمە. بە مانایەکی دیکە سەعید باس لە چۆنیەتی ئامادەبوونی بەشەکانی دیکەی جیهان دەکات لەناو خەیاڵ و نمایشی بەرهەمە کولتوورییەکانی ڕۆژئاوادا، لە ڕەوتێکدا کە ئیمپریالیزم ئەو چوارچێوە مێژووییەیە کە پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژئاوا و دەرەوەی ڕۆژئاوا ڕێکدەخات.

بەبێ تێگەیشتن لەم خاڵە زەحمەتە لە کۆی ئەو تازەبوونەوە فیکری و میتۆدییانە بگەین کە کارەکانی سەعید هەڵگریانن، وەکچۆن بۆ تێگەیشتن لە کۆی ئەو خوێندنەوە و ڕاڤەکردنانەش گرنگە کە ئەم نووسەرە بۆ بەرهەمە کولتوورییەکانی ڕۆژئاوای دەکات. لەم دیدەوە ئەوەی گرنگە بیزانین ئەو ڕاستییەیە کە سەعید باسی ڕۆژهەڵات و ئیسلام و کولتوورەکانی تری جیهان ناکات، پێمان ناڵێت ئیسلام و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کولتووری عەرەبی و کاریبی و ئەفریقی چین، ئەو بەدوای «هەقیقەتی» ڕۆژهەڵاتدا ناگەڕێت، لەڕاستیدا فیکری سەعید دژ بەم جۆرە بیرکردنەوە سادەیەیە کە بە شارستانیەت و کۆمەڵگا و ئاینە جیاوازەکان یەک هەقیقەت دەبەخشێت. سەعید تەنها باس لە چۆنیەتی ئامادەبوونی ئەو شتانە دەکات لە خەیاڵ و نمایشەکانی ڕۆژئاوادا، بۆیە بۆ تێگەیشتن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هیند و ئیسلام کتێبەکانی سەعید هیچی ئەوتۆمان پێناڵێن، کتێبەکانی سەعید هەڵگری تیورەیەک و خوێندنەوەیەک نین بۆ ئەو کولتوور و نەتەوە و ناوچە جوگرافییە جیاوازانە، کتێبەکانی سەعید باسی ڕۆژئاوامان بۆ دەکەن، باسی چۆنیەتی بەرجەستەبوونی وێنە و کولتوور و کارەکتەری گریمانکراوی میللەتانی دەرەوەی ڕۆژئاوا لەناو فانتازایای مۆدێرنی ڕۆژئاوادا دەکەن. لەو کتێبانەدا سەعید پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان خەیاڵی ئیمپریالی و کۆڵۆنیاڵیانەی ڕۆژئاوا لەگەڵ خەیاڵی سیاسی و کولتووری و مەعریفی ڕۆژئاودا پێشنیاردەکات. لە کتێبەکانی سەعیددا فانتازیای سیاسی و کولتووریی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ڕۆژهەڵات فانتازییایەکی ئیمپریالییانەیە و ئەم فانتازیایەش لە سەرزەمینی هاوکێشەیەکی نایەکسانی پەیوەندی دەسەڵات و هێز و مانادا نیشتەجێییە، بەشی زۆری پێشداوەری و حوکم و دەرەنجامەکانی ئەم فانتازییایە و نمایشکردنەکانیشی وابەستەی ئەم نایەکسانییە بوونیادیانەن. ئاشکرایە بەم بۆچوونانەی سەعید ڕەخنەی زۆریان لێگیراوە و بەدەیان نووسەر و بیرکەرەوە و زانای کۆمەڵایەتی هەن ئەم دیدەی سەعید ڕەخنە دەکەن، بەڵام ئەوەی کە هێزی نووسینەکانی سەعید دەپارێزێت ئەو سەرەتا میتۆدییە کە تێکست و بیر و بۆچوون و جیهانبینی و خەیاڵ و نمایش و پێشداوەرییەکان دەباتەوە ناو جیهان و ناو مێژوو و ناو هاوکێشەکانی دەسەڵات و نیشانیئەدات ئەو شتانە چۆن لە هێما و دەلالەت و پێشداوەری و چاوەڕوانییەکانی ئەو ساتەوەختە مێژووییەی تێکستەکانی تێدا نووسراوە، نووقمن. لێرەوە نیشتەجێکردنی بەشێکی گەورەی

نووسین و داهێنانی نووسەرانی ڕۆژئاوا لە سیاقی ئەم دوو سەدەیەی دوایدا، کە سیاقی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم و دوای کۆلۆنیالیزمە و لەوێشەوە ئاشکراکردنی چۆنیەتی پەڕینەوەی وێنە و پێشداوەری و گریمانە باڵادەستەکانی ناو ئەو واقیعە بۆ ناو تێکستەکان، گرنگترین کارێکە سەعید ئەنجامیدابێت.

بێگومان سەعید مێژوونووس نییەو ئەوەی دەینووسێتەوە مێژووی تێگەیشتن یان «تێنەگەیشتنی» ڕۆژئاوا نییە لەدەرەوەی خۆی، ئەو نایەت پێمانبڵێت ڕۆژئاوا ئا لێرەدا هەڵەی کردوە بەرامبەر بە ڕۆژهەڵات و «ڕۆژهەڵاتی» «ڕاستەقینەش» ئا ئەمەیە کە من پێتانی دەڵێم، بەپێچەوانەوە سەعید ئەو پێکهاتی گوتارانەمان بۆ شیدەکاتەوە کە بەهۆیانەوە لە ڕەوتی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزمدا کۆمەڵێک زانیاری و مەعریفە لەسەر جیهانەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا بەرهەمهاتوە. سەعید دەیەوێت لەوە تێبگات ڕۆژئاوا چۆن ئەو پەیوەندییانەی بەدەرەوەی خۆیەوە گرێیدەدات، کردوە بە مەعریفە. یان ووردتر بدوێین چ پەیوەندیەک هەیە لەنێوان ئەو زانیاریانەی ڕۆژئاوا دەربارەی دەرەوەی خۆی بەرهەمیهێناوە، لەگەڵ ئەو دەسەلآت و هێز و زەبرەدا کە ئەم بەشەی دنیا لەم چەند سەدەیەی دواییدا هەڵگریبووە و تائێستاش و لە ڕەوتی جیهانگیری و تێکەڵبوونی بەشە جیاوازەکانی جیهاندا بەیەکتری، هەڵگریەتی.

بێگومان پرسیارکردن دەربارەی پەیوەندی نێوان دەسەلآتی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەو مەعریفەیەدا کە ئەم شارستانیەتە لەسەر کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆی بەرهەمیان دەهێنێت، پرسیارێک نییە ئێدوارد سەعید دایهێنابێت. بەر لە سەعید کەسانی دی هەبوون ئەم پرسیارەیان کردوە و هەوڵی وەلآمدانەوەشیان داوە. سەرەتای ئەم شێوە تایبەتە لە بیرکردنەوە و پرسیارکردن دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵە ڕەخنەییەکانی کۆمەڵێک ئەنترۆپۆلۆژ لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا. «میشێل لیریس» لە ساڵی ١٩٥٠ دا بۆ یەکەمینجار هەوڵی شیکردنەوەی ئەو پەیوەندییانە ئەدات کە زانیاری ئەنترۆپۆلۆژیا لە ڕۆژئاوادا بە پرۆژەی کۆلۆنیالیزمەوە دەبەستێتەوە. نووسینەکانی ئەم پیاوە دەرگای لێدوانێکی گەورە لەسەر پەیوەندی نێوان زانیاری، یان مەعریفە، و دەسەلآت والآدەکات کە دوای خۆی چەندەها کەسی دیکە لە بواری جیاجیادا پێوەی خەریکدەبن و بەرەو پێشەوەی ئەبەن.

لەدەرەوەی کایەی ئەنترۆپۆلۆژیاشدا، بەر لە سەعید، فەیلەسوفی فەرەنسی میشێل فۆکۆ، لە ئاستی فەلسەفی و مێژوویدا، هەمان پرسیار دەکات و بەدوای میکانیزمەکانی پەیوەندی نێوان مەعریفە و دەسەڵاتدا دەگەڕێت. فۆکۆ، کە کاریگەرییەکی زۆر گەورەی لەسەر فیکری سەعید هەیە، لەو پەیوەندییانە ئەدوێت کە بەشە جیاوازەکانی ناو ڕۆژئاوا خۆیان لەناو خۆیاندا دروستییانکردوە، بۆ نموونە فۆکۆ لە پەیوەندیە ئەدوێت کە نێوان عەقڵ و دێوانەییدا دروستدەبێت، یان لەنێوان ئەوەی پێیدەگوترێت ئاسایی و ئەوەی ناوی نائاسایی لێدەنرێت. فۆکۆ نیشانیئەدات کە مەعریفەی مۆدێرن لەسەر دێوانەیی مەعریفەیەکە لەپشتییەوە ستراتیژێکی تایبەتی دەسەڵات ئامادەیە، نەک ویستێکی بابەتی و بێلایەن بۆ بەرهەمهێنانی مەعریفە. سەعید ئەم بیرۆکەیە و ئەو دەزگا چەمکییەی ئەم بیرۆکەیەی بەرهەمهێناوە لە فۆکۆ وەردەگرێت و هەوڵئەدات ئەو پەیوەندییانەی پێبخوێنێتەوە کە ڕۆژئاوا لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دروستیدەکات. کەواتە بەر لە سەعید هەوڵی گەورە و گرنگ هەن بۆ خوێندنەوەی ئەو پەیوەندییانەی باسمانکردن، بەڵام ئەم هەوڵانە، لە ئاستی پەیوەندی ڕۆژئاوا بە دەرەوەی خۆیەوە، لە سەر دەستی سەعیددا، بەتایبەتی لە کتێبی ئۆریانتالیزمدا لەڕووی تیوری و میتۆدییەوە، بەتەواوی کامڵ دەبێت و بەدوای خۆشیدا نەوەیەک لە لێکۆڵەرەوە و زانای کۆمەڵایەتی دروستدەکات کە بەهەمان ئاراستە کاردەکەن و ڕووکارە جیاوازەکانی ئەو پەیوەندییە ئۆریانتالییانە دەخوێننەوە کە بەڕادەیەکی زۆر کولتوورەکان بەیەکەوە گرێدەدەن.

لە کتێبی «ئۆریانتالیزم»دا سەعید نیشانیئەدات چۆن و لەبەرچی زانیاری ئەوروپی دەربارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، زانیارییەکی بێگونەها نییە و وابەستەی ئیرادەی دەسەڵات و توانا و هێزی کۆلۆنیالییانەی ئەوروپایە. سەعید لەم کتێبەدا پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان زانیاری ئۆریانتالیستانە و پرۆژەی دەسەڵات بە گشتی و پرۆژەی کۆلۆنیالیزم بەتیابەتی، پێشنیار دەکات. بەباوەڕی سەعید ناکرێت زانیاری ئۆریانتالیستانەی ئەوروپا لەسەر بەشەکانی دیکەی دنیا لە ڕەوتی ئیمپریالیزم و لە پرۆژەی کۆلۆنیالیزم جیابکەینەوە. ئەگەر ئاسیا، یان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یان بەشەکانی دیکەی جیهان لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتناسیدا قسەشبکەن، ئەوا هەرگیز بەشێوەیەکی سەربەخۆ قسەناکەن بەڵکو لەڕێگای خەیاڵی ئەوروپییەوە قسەدەکەن و لە وێناکردنەکانی ئەم خەیاڵەوە باس لە خۆیان دەکەن، یان ڕاستتر بدوێین، باسیاندەکرێت.

بێگومان چەمکی ئۆریانتالیزم، یان ڕۆژهەڵاتناسی، لای ئێدوارد سەعید مانایەکی تایبەتی هەیە و جیاوازە لەو مانایانەی ئەم چەمکە لە ئاخاوتنی ڕۆژانەدا دەیگرێتەخۆی. ڕۆژهەڵاتناسی لە زمانی ڕۆژانەدا بریتییە لەو بەرهەمە نووووسراوانەی کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر ڕۆژهەڵات نووسیویانە کە دەشێت هەندێکیان باش بن و هەندێکیشیان خراپ، هەندێک لە نووسەرەکان جاسوس و نێردراوی ئیمپریالیستەکان بووبن و هەندێکی دیکەیان دڵسۆز و ڕاستگۆ و پیاوچاک و ئەو میللەتانەیان خۆشویستبێت کە لەسەریان نووسیون. ئەم تێگەیشتنە بۆ ڕۆژهەڵاتناسی تێگەیشتنێکی سادە و ساکار و ڕۆژانەییە و پەیوەندی نییە بەو مانایانەوە کە ڕۆژهەڵاتناسی وەک چەمکێکی گرنگی ناو زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەیگرێتەخۆی. ئێدوارد سەعیدیش هەرگیز بەو مانایە باسی لە ڕۆژهەڵاتناسی نەکردوە. لای سەعید ڕۆژهەڵاتناسی چەمکێکی کولتووری و سیاسی گرنگە کە دەشێت بەم شێوەیە باسیبکەین: ڕۆژهەڵاتناسی بریتییە لەو گوتارە ڕۆژئاواییەی کە تیایدا ڕۆژئاوا وەک زاتێکی قسەکەر و ڕۆژهەڵات وەک بابەتێکی بێدەنگی قسەلەسەرکراو ئامادەیە. واتە ڕۆژهەڵاتناسی بەر لە هەموو شتێک گوتارە و بەپێی سیستمی گوتار کاردەکات، دواتر گوتارێکە کە قسەکەرێکی ئەکتیڤ تیایدا باس لە بوونێکی نائەکتیڤ و بێدەنگ و قسەلەسەرکراو دەکات. بێگومان ئەم تێڕوانینەی سەعید پێچەوانەی بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسەکان خۆیانە لەسەر ئەو کارانەی ئەنجامیانداوە. ڕۆژهەڵاتناسەکان پێیان وایە ئەو زانیارییانەی بەرهەمهیان هێناوە زانیارییەکی ڕاستەقینە و بێگوناهـ و بابەتییە و تەعبیر لە هەقیقەتی ئەو کۆمەڵگایانە دەکەن کە لێیانکۆڵیوەتەوە و لەسەریان نووسیوە، بەڵام ئێدوارد سەعید نیشانیئەدات کە ئەم زانیارییانە زانیارییەکی تایبەتن و وابەستەی کۆمەڵێک هاوکێشەی هێز و دەسەڵات و میکانیزمی ناوەکی و دەرەکی تێکەڵبوونی مەعریفەیە بە ئیرادەی دەسەڵات.

سەعید لە کتێبی ئۆریانتایزمدا ئەم بۆچوونە بەدرێژی شیدەکاتەوە و باس لە سێ کێشەی سەرەکی دەکات کە مەعریفەی ئۆریانتالیزمی بەدەستییەوە گیردۆەیە:

١- زانیاری ڕۆژهەڵاتناسییانە هەڵگری کێشەیەکی مەعریفی گەورەیە چونکە ئەم زانیارییە لە چوارچێوەی نایەکسانییەکی قووڵی پەیوەندیەکانی هێز و دەسەڵاتدا، لە نێوان ئەوروپا و دەرەوەی ئەوروپادا، بەرهەمهاتووە. جەوهەری ئەم

نایەکسانییەش لەوەدایە کە لایەنێکیان، واتە ئەوروپا، باڵادەستە و ئەویدیکەیان، واتە دەرەوەی ئەوروپا کە دەکاتە ڕۆژهەڵات، لەوپەڕی بێدەسەڵاتیدایە. لەم پەیوەندییەدا ئەوروپا وەک بکەرێک قسەدەکات، گووتار و زانیاری و مێژوو بەرهەمدەهێنێت لەکاتێکدا دەرەوەی ئەوروپا بابەتێکی بێدەنگکراو و بێمێژوو و تەسلیمبووە. بەکورتی لەم پەیوەندییە نایەکسانەدا یەکێکیان نمایشدەکات، ئەویدیان نمایشدەکرێت، یەکێکیان دەنووسێت ئەویدیان لەسەری دەنووسرێت، یەکێکیان حوکمدەکات و ئەویدیان حوکمدەکرێت.

لێرەوە ڕەوگەی، سیاقی، بەرهەمهێنانی ئەم زانیاریانە ڕەوگەیەکی زۆر تایبەتی پەیوەندی نایەکسانی نێوان ڕۆژئاوا و دەرەوەی ڕۆژئاوایە و ئەوەی بەرهەمهاتووە زانیاری ڕووت و هەقیقەتی بێگوناه و بۆچوونی بابەتی نییە، بەڵکو زانیارییەکە لە هەموو گەمەکانی دەسەڵات و هەیمەنەوە ئالاوە کە دواهەمین دەرەنجامی کۆلۆنیالیزم بووە.

٢- ڕۆژهەڵاتناسی کێشەیەکە دەربارەی هێز و دەسەڵات: سەعید لەوباوەڕەدایە بەبێ پرۆژەی ئیمپریالیزم و بەبێ باڵادەستی بەرفراوانی ڕۆژئاوا، ڕۆژهەڵاتناسی بەو شێوەیە نەدەبوو کە لە سێ سەدەی ڕابووردودا لەئارادابووە. ئیمپریالیزم چەندە گرنگبووە بۆ ڕووتاندەوەی ئابووری گەلانی داگیرکراو، بەهەمانئەندازەش گرنگبووە بۆ بەرهەمهێنانی شووناسێکی تایبەت بۆ خودی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان خۆیان. واتە ئیمپریالیزم تەنها لەبەر خاتری ڕەهەندە ئابوورییەکەی گرنگ نەبووە، کە زۆرجار تالانکارییەکی ڕووتبووە، بەڵکو ڕەهەندە کولتوورییەکەشی زۆر گرنگ بووە کە بەهۆیەوە ڕۆژئاوا وێنەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروستکردوە. لەلێکدانەوەی ئەم خاڵەدا سەعید دەڵێت بەبێ ئیمپریالیزم ڕۆژئاوا نەیدەتوانی شووناسی خۆی وەک «شارستانیەتێکی پێشکەوتوو» وێنابکات، «پێشکەوتن» ی ڕۆژئاوا هەمیشە بە «پاشکەوتن» ی ئەو شوێنانە پێودراوە کە ڕۆژئاوا داگیریکردون. سەرەڕای ئەم ڕاستییە ڕۆژئاوا کاتێک دەرەوەی خۆی وەک سەرزەمینی غیابی عەقڵ و باڵادەستی ستەم و جوگرافیای پاشکەوتوویی وێنادەکات، ناڕاستەوخۆ دەیەوێت بڵێت کە خۆی سەرزەمینی عەقڵ و سەرزەمینی دادپەروەری و نیشتیمانی پێشکەوتنە. واتە ڕۆژئاوا لەڕێگای ناونانی ئەوانیدیەوە بە «خراپ»، یان لکاندنی سیفەتی نێگەتیڤ پێیانەوە، ویستویەتی خۆی وەک «باش» وێنابکات.

٢ـ ڕۆژهەڵاتناسی هەڵگری هەموو کێشەکانی بەرهەمهێنانی وێنەیە، لە وێناکردنی خودەوە بۆ وێناکردنی ئەوانیدی. مەبەستی سەعید لەم خاڵە نیشاندانی کێشەی ئەو وێنانەن کە کولتوور و کۆمەڵگا جیاوازەکان لەسەر یەکتری دروستیدەکەن. لە دۆخی ڕۆژهەڵاتناسیدا وێنەی ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ کۆمەڵگا نائەورووپییەکان وێنەیەکی تاک ڕەهەند و یەک تۆن و یەک ڕەنگە، ئەمەش وایکردوە ئەو وێنانە نەتوانن ئەو دەیاهە فۆرم و دید و ڕەنگە جیاوازانە ببینن کە لە ناو کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکاندا ئامادەن. بۆیە ڕۆژهەڵاتناسی هەڵگری هەموو ئەو کێشە میتۆدی و زانستی و سیاسی و کۆمەڵایەتییانەیە کە دروستکردنی ئەو جۆرە وێنانە بەرهەمیاندەهێنن.

بەم شێوەیە لەگەڵ ئێدوارد سەعیدا ڕۆژهەڵاتناسی، وەک کایەکی مەعریفی، چەندان مانا وەردەگرێت کە بەر لە سەعید هەڵگری نەبوون. لەدوای نووسینەکانی ئەویشەوە ڕۆژهەڵاتناسی دەبێتە سەرزەمینی چەندەها کێشەی ئەبستمۆلۆژی و سیاسی و کولتووریی کە بەهۆیانەوە کێشەکانی بەرهەمهێنانی شووناس و وێنە و پەیوەندی نێوان کولتوور و سەرزەمینە جیاجیاکان بۆ ئاستێکی تەواو جیاواز دەگوازێنەوە.

با کەمەکێک قووڵتر لەم مەسەلانە بدوێین.

**٣ـ ڕۆژئاوا و گەمەی وێنەکان**

لە کتێبی ئۆریانتالیزمدا سەعید سێ مانای گرنگ بە چەمکی ڕۆژهەڵاتناسی ئەدات کە هەر یەکێکیان لە پەیوەندییەکی پتەودایە لەگەڵ ئەوانی دیکەیاندا. ئەو سێ مانایەش بریتین لە:

١ـ ڕۆژهەڵاتناسی بریتیە لە کایەیەکی ئەکادیمی:

ئەمەش مانای ئەوەی ڕۆژهەڵاتناسی بریتییە لە بەشێک لەو جیهانە مەعریفییەی لەزانکۆکاندا لەئارادایە، مانای بوونی چەندان کورسی و بەشی تایبەت بۆ لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسییانە لە زانکۆکانی ڕۆژئاوادا و بوونی چەندان زانا و نووسەر و لێکۆڵەرەوە کەم بە ڕۆژهەڵاتەوە سەرقاڵن. لەم کایە ئەکادیمیەدا چەندان ئەکادیمی خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و لێکۆڵینەوە و نووسین لەسەر ڕەهەندە جیاجیاکانی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات، لە ئاینەوە بیگرە

بۆ لێکۆڵینەوەی ئابووری و سیاسی، لە کولتوورەوە بۆ کاراکتەری عەقڵ و سایکۆلۆژیا، لە ژیانی جنسییەوە بۆ نوکتە و زەوق.

بەکورتی ڕۆژهەڵاتناسی لەم ئاستەدا بریتییە لە ڕستێک تێکست و نووسین و بەرهەمهێنانی فیکری، ئەم بەرهەمانەش بەردەوام لەنێوان ئەکادیمییەکاندا باسکراون و ئیقتیباس کراون و سەرلەنوێ نووسراونەتەوە.

٢- ڕۆژهەڵاتناسی بریتیە لە شێوازێکی دیاریکراوی بیرکردنەوە.

ئاکاری هەرە سەرەکی ئەم شێوازە تایبەتەی بیرکردنەوە ئەوەیە کە لێکدابڕانێکی ئەنتۆلۆژیی و مەعریفیی و جەوهەریی لەنێوان ڕۆژئاوا و دەرەوەی ڕۆژئاوادا پێشنیاردەکات و ئەم دووانەش وەک دوو شت، دوو جیهان یان دوو جەوهەری ناکۆک و لەهەموو ڕوویەکەوە بەیەک جیاواز و ناتەبا دەناسێنێت. بەمانایەکی دیکە شێوە بیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسییانە ئەو شێوە بیرکردنەوە تایبەتەیە کە پێیوایە جیاوازیەکی جەوهەری و نەگۆڕ و بان - مێژوویی لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، هەیە. ئەم جیاوازییە هەم ئەپستمۆلۆژییە، واتە وابەستەی شێوازی بیرکردنەوە و شێوازی بەرهەمهێنانی مەعریفەیە کە ئەمانیش دەرەنجامی ئەو جیاوازییەن کە عەقڵی ڕۆژئاوا لە عەقڵی ڕۆژهەڵات جیادەکاتەوە.

لەسەرێکی دیکەوە جیاوازی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵات جیاوازییەکی ئەنتۆلۆژیشە، واتە وابەستەی شوێن و جێی ئینسانە لەناو بووندا. سەعید ئاماژە بەوە دەکات کە ژمارەیەکی گەورەی نووسەر و شاعیر و فەیلەسوف و تیوریستی سیاسی و ئابووریزان و فەرمانبەرانی ئیدارەی کۆلۆنیالی و چەندانی تریش ئەم جیاکارییەیان قبووڵبووە و وەک ڕاستییەکی گومانهەڵنەگر مامەڵەیان لەگەڵدا کردوە. کێشەکەش لەوەدایە ئەم جیاکارییە گریمانکراوانە لە گوتاری ڕۆژهەڵاتناسیدا دەنرخێنێت و بەهای جیاوازییان بۆ دادەنرێت. لەم نرخاندنەدا «جەوهەری» گریمانکراوی ڕۆژئاوا لە «جەوهەری» گریمانکراوی ڕۆژهەڵات بەرزترە، ڕۆژهەڵات نەخۆشە و ڕۆژئاوا دەبێت ئەم نەخۆشە چاکبکاتەوە، ڕۆژهەڵات پریەتی لە پێغەمبەر و ڕۆژئاوا پریەتی لە پزیشک، شارستانیەتی ڕۆژئاوا شارستاینیەتی زانایانە و هی ڕۆژهەڵاتیش شارستانیەتی پیاوانی ئاین، ڕۆژئاوا عەقڵانی و ڕۆشنگەر و دیموکراتە، بەڵام ڕۆژهەڵات ڕۆمانسی و خورافی و ستەمگەرە.

بەکورتی بیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەو بیرکردنەوەیە کە جیاوازییەکان وەک جەوهەری نەگۆڕو نامێژوویی و ئەبەدی دەبینێت و بەشێوەیەکی نایەکسانیش دەیاننرخێنێت.

٣- ڕۆژهەڵاتناسی بریتیە لە چەندان دەزگا و دامەزراوی جیاجیا کە خۆیان بە کۆکردنەوەی زانیاری و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە و هەڵسەنگاند و نرخاندن و دەرکردنی بڕیار دەربارەی ڕۆژهەڵاتەوە خەریکدەکەن، ئەمەش بە مەبەستی پێناسکردن و بەسەردازاڵبوون و لەدوائەنجامیشدا هەیمەنە پەیداکردن بەسەریدا. ئەم دەزگایانە ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاو دەبینن لە بڵاکوردنەوەی ئەو تێکست و زانیارییانەدا کە لەسەر ڕۆژهەڵات بەرهەمهاتوون.

بەبۆچونی سەعید ئەم سێ لایەنە بەسەریەکەوە ماشێنێکی گەورەی بەیەکداچوونی دەسەڵات و مەعریفەیان دروستکردوە کە سێ سەدەیە لە بەرهەمهێنانی وێنە و تیورە و حوکمی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی بەسەر ڕۆژهەڵاتدا بەردەوامە. سەعید بە گەڕانەوە بۆ فۆکۆ ئەم ماشێنە گەورەیە ناو دەنێت «گوتار» و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە بۆ خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی ڕۆژهەڵاتناسی دەبێت ئەم تەرزە تایبەتەی نووسین و هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات وەک گوتار تەماشابکەین. چونکە تەنها لەڕێگای بە گوتارکردنی ڕۆژهەڵاتناسییەوە دەتوانین لەوە تێبگەین چۆن ئەم کایەیە بەو شێوە بەرفراوان و هەمەلایەنە لەناوخۆیدا ڕێکخراوە و چۆن بەهۆییەوە ڕۆژئاوا لەدوای سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە توانیوەتی ڕۆژهەڵات نمایشبکات و لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازی و ئایدیۆلۆژی و زانستی و خەیاڵییەوە، بەرهەمیشیبهێنێت.

بە حوکمی ئەوەی ڕۆژهەڵاتناسی وەک گوتار کاریکردوە، بۆیە هەموو پەیوەندیکردنێک بە ڕۆژهەڵاتەوە ناچار بەناو ئەو تێکست و سەرنج و حوکم و نووسینانەدا تێپەڕیوە کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر ڕۆژهەڵات نووسیویانە. بەمانایەکی دیکە ڕۆژهەڵات بەبۆنەی ڕۆژهەڵاتناسییەوە شوێنێک نەبوو فیکر بتوانێت ئازادانە کاری تێدابکات، بەڵکو شوێنێک بووە کە نووسینی ڕۆژهەڵاتناسی گەمارۆی داوە و هەموو بیرکردنەوەیەک لە ڕۆژهەڵات بەناو ئەو ڕستە تێکستانەدا تێپەڕیوە کە پێشوەخت ڕۆژهەڵاتناسەکان نووسیویانە.

سەعید دەڵێت ڕۆژهەڵساتناسی وایکردوە ڕۆژهەڵات چ بۆئەوەی بیریلێبکەیتەوە چ بۆ ئەوەی کاری تێدا بکەیت بابەتێکی ئازاد نەبێت.

خاڵێک کە زۆر گرنگە باسیبکەین و گرنگیپێبدەین ئەوەیە کە سەعید بەردەوام ئەو ڕاستییە دووبارەدەکاتەوە کە ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دەربارەی ڕۆژهەڵاتناسی مانای ئەوە نییە کە ڕۆژهەڵاتناسی، یان ئۆریانتالیزم، ڕستێک درۆ و خورافە و غەیبنووسییە دەربارەی ڕۆژهەڵات، هەروەها نووسینەکانی ئەو هێرشکردنێکی ناشیرین نین بۆسەر ڕۆژئاوا، وەکچۆن بەهیچجۆرێک ستایش و پیاهەڵدانی ئیسلام و کولتوورە جیاوازەکانی ڕۆژهەڵاتیش نین. ئەوەی سەعید سەرقاڵییەتی نیشاندانی چۆنیەتی کارتێکردنی دەسەڵات و هێز و گوتارە لەسەر وێنە و نمایش و نیشاندانی ئەوانیدی، ئەم باسی پەیوەندی نێوان کولتوور و دەسەڵات دەکات و لەو سیاقە مێژووییە بەرفراوانە ڕادەمێنێت کە ئیمپریالیزم بۆ فیکر و نووسین و خەیاڵ و هەڵسەنگاندنی دروستدەکات. واتە ئەو نایەت بەرگری لە ئیسلام، یان لە ڕۆحانیەت یان هەرشتێکی دیکەی ڕۆژهەڵاتی بکات، بەڵکو ئەو دەیەوێت نیشانبدات چۆن میکانیزمەکانی پیادەبوون و کارکردنی دەسەڵات کاریگەریان لەسەر بەرهەمهێنانە مەعریفییەکان هەبووە. سەعید حوکمی ئەخلاقی دەرناکات، بەڵکو گوتارەکان شیدەکاتەوە و دەرکەوتەکانی دەسەڵات لەناو مەعریفەدا دەخوێنێتەوە.

لە دیدی سەعیدا کێشەی سەرەکی گوتاری ئۆریانتالیزم لەوەدایە کە خوێندنەوەیدا بۆ کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا و لە لێکدانەوەی دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانیدا ناگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی هۆکارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئابوورییەکان، ناگەڕێتەوە بۆ ڕاڤەکردنی پێکهاتی هێز و دەسەڵات و قۆناغی گەشەکردنی ئەو کۆمەڵگایانە، تەماشای برینە مێژووییە قووڵەکانی کۆلۆنیالیزم ناکەن. لەباتی ئەمانە تەماشای زمان و تێکست و بەرهەمە شەفەهییەکان دەکەن. گشتگیری دەکەن و سڵ لەوە ناکەنەوە لە ووتارێکی شەش لاپەڕەییدا باس لە پێکهاتی سایکۆلۆژی «ئینسانەکانی ڕۆژهەڵات» بکەن کە ژمارەیان لە ملیارێک ئینسان تێدەپەڕێت. ئەم شێوازە تایبەتەی مامەڵەکردنی گوتاری ڕۆژهەڵاتناسییە وا لە سەعید دەکات کە بڵێت ئەو وێنانەی ڕۆژهەڵاتناسی بۆ کۆمەڵگا و ئینسانەکانی ڕۆژهەڵاتی دروستدەکات، زیاتر بەدەم پێویستییەکانی ناو فەرهەنگی ڕۆژئاواییەوە دەچن تا

ئەوەی کۆمەڵێک ڕاستیمان لەسەر ڕۆژهەڵات پێبڵێن. ئەم خاڵە لای سەعید زۆر گرنگە و یەکێکە لە بنەما تیورییە گرنگەکانی هەردوو کتێبی «ئۆریانتالیزم» و «کولتوور و ئیمپریالیزم». ئەم گریمانە تیورییە دەڵێت ڕۆژئاوا لەڕێگای بەرهەمهێنانی وێنەی نێگەتیڤەوە بۆ ڕۆژهەڵات وێنەیەکی پۆزەتیڤ بۆخۆی دەکێشێت. کەوابوو ئەوەی زانیاری ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕۆژئاوادا بەرز ڕادەگرێت و گرنگی پێئەدات و بڵاویدەکاتەوە، لەوێوە نەهاتووە کە ئەم زانیارییە وێنە ڕاستەقینەکانی ڕۆژهەڵاتمان نیشانئەدات، بەڵکو لەوێوە هاتووە کە کۆمەڵێک وێنەی پۆزەتیڤ بۆ ڕۆژئاوا دروستدەکات کە بۆ بەرهەمهێنانی شووناسی سیاسی و کوولتووری و شارستانی ڕۆژئاوا خۆی گرنگییەکی گەورەیان هەیە.

سەرەڕای ئەم گریمانە تیورییە گرنگە زانیاری ڕۆژهەڵاتناسە بەدەست کۆمەڵێک کێشەی میتۆدی و تیوری سەختەوە دەناڵێنێت. ئەو میتۆدانەی ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ لێکۆڵینەوە بەکاریدەهێنن میتۆدی تەقلیدین، بەپلەی یەکەم میتۆدی فیلۆلۆجی زمانەوانی و میتۆدی وەسفی سادەن و بەهیچجۆرێک بەشێک نیین لەو دەسەکەوتە میتۆدەییە گرنگانەی زانستە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان بەدەستیانهێناوە. بۆ نمونە ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دیاردەکانی ئەو دنیایەی کە بە جیهانی ئیسلام ناویدەبەن، بەردەوام بۆ قورئان و فەتوا و دەقە ئاینیەکانی دیکە دەگەڕێنەوە و دەیانەوێت ڕووداوەکان بەهۆی ئەو دەقانەوە لێکبدەنەوە، نەک لەڕێگای پشکنین و خوێندنەوەی جومگە تاریک و ئاڵۆزەکانی ناو واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ئەو کۆمەڵگایانە. وەک ئەوەی مێژوو و ڕووداوەکانی دنیای موسڵمانان، یان ڕۆژهەڵات، لەناو قورئان و دەقە ئاینیەکانەوە بێنەدەرەوە، نەک بەرەنجامی کۆمەڵێک ململانێ و پێکدادان و ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەرزەمینی بن و لەناو واقیع و مێژوو و هاوکێشەکانی دەسەڵاتدا ئامادەبن. لە خوێندنەوەی ڕۆژهەڵاتناسیدا ئەو هێزەی لەپشتی قەیران و پێکدادان و ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتەوە وەستاوە وەستاوە ئایەتەکانی قورئان و ڕەمزە کۆنەکانی ئیسلام و قسەکانی پێغەمبەرن، نەک پەیوەندییەکانی هێز و مانا و بەرهەمهێنان، نەک پرۆژە و ئیرادەی کۆمەڵایەتی هێزە جیاجیاکان و ئەو کەش و هەوا نەتەوەیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتییەی ئامادەیە. لێرەوە ڕۆژهەڵاتناسی زانیارییەک دەربارەی ئەم کۆمەڵگایانە بەرهەمدەهێنێت کە ڕەگەکانی لەناو ڕووداوە واقیعی و زیندووەکانی ئەم

کۆمەڵگایانەدا نییە، بەڵکو لەناو ئەو کتێب و فەرمودە و ئایەتانەدایە کە لەساتێکی مێژوویی دیاریکراودا نووسراون و لە خەیاڵی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە و بۆهەتاهەتایە مێژووی ڕۆژهەڵات دەستنیشاندەکەن.

با کێشەی نەبوونی دیموکراسیەت لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا وەک نموونە بهێنینەوە و بزانین گوتاری ڕۆژهەڵاتناسی ئەم نەبوونە بۆچی دەگێڕێتەوە. لەم گوتارەدا نەبوونی دیموکراسیەت خەتای کۆلۆنیالیزم و ئابووری بنیادنراو لەسەر نەوت و خێڵگەرایی و هەژاری و نەخوێندەواری و ئامادەیی نوخبەیەکی سیاسی ناپاک و کورتبین و نائامادەیی چینی ناوەند و بوونی ماشێنێکی گەورەی تۆقاندن و ترس و سەرکوتکردن نییە، بەڵکو خەتای دوو ئایەت لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەیەک لە فەرمودەکانی پێغەمبەر و تەفسیرێک لە تەفسیرەکانی ئیبن تیمەیە. بە دیوی ئەودیویشدا ئەوەی دیکتاتۆریەت لە دنیای موسڵماناندا بەرهەمدەهێنێت ئەو فاکتەرانەی سەرەوە نین، بەڵکو ئەو تەفسیرە تایبەتەیە کە ئیسلامی سونی بۆ ڕۆڵی سیاسەت و سیاسی و سەرکردەکان دەیکات. لەڕاستیدا بەشێکی گەورەی بیری ڕۆژهەڵاتناسی لەم ئاستەدا نەک مەعریفە نییە، بەڵکو کاریکاتێریکی فیکریە.

**٤ـ دۆگماکانی ڕۆژهەڵاتناسی**

ئێدوارد سەعید دۆگماکانی ڕۆژهەڵات ناسی بەسەر چوار تەوەرەدا دابەشدەکات:

١ـ دۆگمای جیاکارییەکی نامێژوویی و جەوهەرگەرایی لەنێوان ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتدا بەوەی گوایە ڕۆژئاوا سەرزەمینی عەقڵانیەتێکی ماقوڵ و مەزنە و ڕۆژهەڵات سەرزەمینی گێلیەتیەکی گەورە.

٢ـ دۆگمای ئەوەی هەر شتێک کە لەدنیای ئیسلامدا ڕوودەدات دەبێت لەڕێگای ئاینی ئیسلامەوە لێکبدرێتەوە و بناسرێت و ڕاڤەبکرێت. لەم دیدەدا ئەم ئاینە جەوهەرێکی نەگۆڕی هەیە و بەرپرسیارە لەکۆی ئەو ڕووداوانەی لەو دنیایەدا ڕوودەدەن، نەک کۆمەڵێک هۆکاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی هتد..

٣ـ دۆگمای نیشاندانی بەردەوامی ڕۆژهەڵات وەک گشتێکی لێکچوو و هاوشێوە کە توانای بەرهەمهێنانی هێزی جیاواز و شووناسی جیاواز و

کولتووری جیاوازی نییە و ناتوانێت گۆڕانکاری بەرپابکات. مادامەکی ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتە کەواتە دەبێت، سلێمانی بۆ نمونە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کابول و کابولیش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ بێروت و بێروتیش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ تاراندا نەبێت. ڕۆژهەڵات مانای وێکچوونێکی سەرتاسەری گەورە.

٤ـ دۆگمای نیشاندانی ڕۆژهەڵات وەک شوێنی مەترسی و هەڕەشە و ترس، شوێنێک بۆ ئەوی ڕامبکرێت دەبێت لێکۆڵینەوەی بەردەوامی لەسەربکرێت و بناسرێت و کۆنترۆڵبکرێت، بەڵام گەر هەڕەشەکانی هەر بەردەوامبوو داگیربکرێت.

وەک ووتمان ئەمە گرنگترینی ئەو دۆگما فیکرییانەن کە لەناو گوتاری ڕۆژهەڵاتناسیدا ئامادەن. بێگومان پێویستە جارێکی دی ئەو ڕاستییە دووبارەبکەینەوە کە ئەو ڕەخنانەی سەرەوە لە ڕۆژهەڵاتناسی و ئاشکراکردنی ئم دۆگمانە، مانای ئەوە نییە ئەو دیدە دژە قبوولکەین کە ئوسوڵییە ئیسلامییەکان و ناسیۆنالیستەکان و ئەوانەی دەیان گرێی سایکۆلۆژییان بەرامبەر بە ڕۆژئاوا هەیە پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن. واتە نیشاندانی میکانیزمە ناوەکییەکانی کارکردنی گوتاری ڕۆژهەڵاتناسی مانای بەخشینی شەرعیەت نییە بە گوتاری هێزە ئیسلامی و ناسیۆنالیستی و دژە ڕۆژئاواییەکان. کە دەڵێین خوێندنەوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ ئیسلام و کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان هەڵەیە مانای ئەوە نییە ئەو دیدە دژە ناڕاست و پەرچەکردارییە قبوولکەین کە دەڵێت ئیسلام سەرچاوە و هۆکار و کانگای چارەسەر و پێشکەوتن و ئازادیی ئەم کۆمەڵگایانەیە. کە ڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێن ئیسلام ئاینی شمشێر و شەڕ و پەلامارە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت بەمدیودا پڕ بەدەم بقریشکێنین و بڵێین ئیسلام ئاینی مەحەبەت و دیموکراسیەت و ئاشتییە. گووتاری پەلاماردانی ڕۆژهەڵاتناسی بۆ ئیسلام چەند هەڵەیە ئەو گوتارەش کە وەک پەرچەکردار بەهەمان لۆژیکی ئۆریانتالیستانە بەرگری لە ئیسلام دەکات، بەهەمان ئەندازە هەڵەیە. ئۆریانتالیزم هۆکاری لەدایکبوونی گوتارێکی ئۆریانتالیانەی پێچەوانەیە، ئەم دوو گوتارەش بەقەد یەک هەڵە و ترسناکن.

کاری فیکری و میتۆدی ڕاستەقینە دەربارەی دیاردەکان وابەستەی تەماشاکردن و بەستنەوە و جێگیرکردنی ئەو دیاردانەیە لە سیاقە مێژووییەکانی

بەرهەمهێنان و بڵاوبوونەوە و بەکارهێنانیاندا، بەبێ نیشتەجێکردنی زانیارییەکان لەناو سیاقە کۆمەڵایەتییەکان و بەبێ بەستنەوەی ئەمانەش بە پێدراوە مێژووییەکانەوە هەموو قسەیەک لەسەر ئەوەی ئیسلام ئاینی مەحەبەت یان ئاینی شەڕ و شۆڕە قسەکردنێکی بێمانایە. ئیسلام دەشێت هەم وەک ئاینی مەحەبەت و هەم وەک ئاینی شمشێر بەدەرکەوێت، دەشێت ڕابیعەی عەدەوییە و حەجاجی سەقەفی بەرهەمبهێنێت. ئەوەشی ڕووخساری ئیسلام لە ساتەوەختێکی مێژووییدا دەستنیشاندەکات کۆی ئەو هێزانەن کە لەو ساتەدا لەناو هاوکێشە و پێدراوە مێژووییەکاندا ئامادەن و بە ستراتیژێکی دیاریکراوی دەسەڵاتەوە بەدوای وەڵامی پرسیارە ئێستاییەکاندا دەگەڕێن.

ئیسلام و هەموو ئاینەکانی دیکە کوڕی ڕۆژگار و سەردەم و قۆناغی خۆیانن، ڕەنگڕووی ئەو ساتەوەختە مێژووییە تایبەتەش دەگرنە خۆیان کە دەکەونە ناوییەوە. لەڕاستیدا ئاینەکان کوڕی قۆناغی بەر لە دایکبوونی ئەپستمۆلۆژیای مۆدێرنەن، گەرچی تائێستاش بەردەوامن و لە ئایندەشدا هەر بەردەوام دەبن. بەڵام وەزیفە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و ڕەمزییەکانیان گۆڕانی گەورە گەورەیان بەسەردا هاتووە. بەباوەڕی من ئینسان بوونەوەرێکە بەبێ ئاین ناژی، دین ڕەنگە ڕەهەندێکی ئەبستمۆلۆژی بوونی ئینسانی بێت. بەڵام نابێت پێویستییە سایکۆلۆژییەکانی ئینسان بۆ ئاین تێکەڵبکەین لەگەڵ توانا سنووردارەکانی ئایندا بۆ لێکدانەوەی دنیای ئاڵۆزی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکان. ڕەگەکانی زانیاری نوێ لەناو ئەزموونی ئینسان و پێشکەوتنی تواناکانی تێبینکردن و بەرخوردایە، ئەمەش شتێک نییە لە دینەوە هاتبێت. بەبۆچوونی من ئەو زانیارییە ئایینیانەی لە قۆناغی ئەبسمۆلۆژیای بەر لە مۆدێرنەدا بەرهەمهاتوون دەرەقەتی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانی ئەمڕۆ نایەن. دنیای ئەمڕۆ دنیایەکی ئاڵۆزە و لۆژیکی سادەی ئاین، کە زۆربەی جار لۆژیکی دابەشکردنی شتەکانە بۆ چاک و خراپ، ناتوانێت لە جەنگەڵە تاریکەکانی ئەم ئاڵۆزیە تێبگات. لێرەوە چارەنووسی هیچ هێزێک وابەستەی ئەوە نییە داخۆ ئەو هێزە چۆن مامەڵە لەگەڵ دین یان زانیاری دینیدا دەکات، بەڵکو وابەستەی ئەوەیە چۆن تێکەڵ بە پرۆسە فرە جۆرەکانی مۆدێرنە ئەبێت و چۆن مۆدێرنە ئەبێتە سەرزەمینێکی نوێی ئامادەگی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری. لە ڕاستیدا کتێبەکانی سەعید بەرگری لەهەمان ئەم

یدە دەکەن، ڕەخنەکردنی کۆلۆنیالیزم و ڕەخنە لە ڕۆژهەڵاتناسی و ئیمپریالیزم ۆ ئەوە نییە بگەڕێینەوە بۆ باوەشی ئاین، ڕەخنە لە هەندێک ڕەهەندی تایبەتی ۆژئاوا مانای بەرگریکردن نییە لە ناشیرینییەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا، ڕەخنە لە سێنترالیزمی ئەورووپی مانای بەرگریکردن نییە لە سێنترالیزمەکانی دیکە، کە ترا ڕۆژهەڵاتناسەکان بەهەڵەدا چوون مانای ئەوە نییە کە فەتواچییەکان استدەکەن. ئەوەمان لەبیر نەچێت سەعید هەمیشە بەرگریکەرێکی سەرسەختی یومانیزم بووە، لەدیدی ئەودا هیومانیزم چارەسەری زۆر کێشەی کولتووری و یاسی و کۆمەڵایەتی جیهانی هاوچەرخ دەکات و ئینسان لەهەر شوێنێک بێت ۆمەڵێک چاوەڕوانی و نرخ و پێداویستی هەیە کە دەبێت بپارێزرێت. لەمن ووەوە سەعید یەکێک لە بەرگریکەرە ڕاستەقینەکانی مافەکانی مرۆڤ بووە و تا ەر ئێسقان دژ بە ئوسولیەتی دینی و پەرگیری ناسیۆنالیستانە بووە. یومانیزمی سەعید وای لەهەندێک لە ڕەخنەگرەکانی کردوە بەوە تاوانباری کەن کە لە بۆچوون و میتۆدی کارکردنی میشێل فۆکۆ نەگەیشتوە و بەهەڵە ەندێک لە چەمک و بنەما تیۆرییەکانی ئەم فەیەلسوفەی بەکارهێناوە. بەڵام ەعید هەم لە کتێبی ڕۆژهەڵاتناسیدا و هەم لە کتێبی کولتوور و ئیمپریالیزمدا ەرگری لەم دیدە هیومانیستییە دەکات و لەهەندێک چاوپێکەوتنیشدا ڕەخنە لە یدی نا هیومانیزمی فۆکۆ دەگرێت.

لە قۆناغی لەدایکبوونی چەمکەکانی «پەیمانی کۆمەڵایەتی» و «دەستووری سیاسی» و «لێکدیجیاکردنەوەی دەزگایی دەسەڵاتەکان» دا، هیچ مانایەک بۆ ەو سەرەتاگە ئاینییانە نامێنێتەوە کە قسەکردن لە برایەتی دینی و مەحەبەتی اینی نێوان ئینسانەکان دەکاتە ئەلتەرناتیڤی ئەو چەمکانە. ڕاستە ئەم بیرۆکە اینییانە هەڵگری ڕەهەندێکی ڕۆحین و دەشێت یاریدەدەری هەندێک کەس بن بۆ ەوڵەمەندکردنی دنیا ڕۆحییەکەیان، بەڵام ئەم بیرۆکانە ناتوانن ببنە ەلتەرناتیڤی ئەو چەمکە نوێیانە و بونیادێکی دەزگایی وەرگرن و بەهۆیانەوە ایەی سیاسی کۆمەڵگا ئاڵۆزەکانی ئەمڕۆکە ڕێکبخرێن. لەدوای مۆدێرنەوە مانا شوێن و جێ و وەزیفەکانی ئاین لە دنیادا گۆڕاون. هەڵەی سەرەکی هێزە یسلامییەکان لەوەدایە ئەو دابڕانەی نێوان سەردەمانی مۆدێرنە و بەر لە ۆدێرنە نابینن، واتە ئەو ڕۆحە میتۆدییەی سەعید فەرامۆشدەکەن کە دیاردەکان ەخاتەوە ناو سیاقە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی خۆیانەوە.

لەڕاستیدا بەکارهێنانی ئیسلامییەکان بۆ تێزەکانی سەعید نەک دژ بە دێڕ بە دێڕی کتێبەکانی سەعیدە، بەڵکو دژ بەو ڕۆحیەتە عەلمانییەی سەعیدیشە کە بەردەوام جەغدیلێکردوە و دووبارە و چەندبارەی کردۆتەوە. کتێبەکانی سەعید مۆدێلێکی گرنگی بەستنەوەی فیکر و داهێنانە بە ڕەوتە مێژووییەکانەوە، جێنشینکردنی وێنە و بیرۆکە و سەرنجەکانە بە پەیوەندی و ستراتیژەکانی دەسەڵاتەوە، لەکاتێکدا ئەوەی هێزە ئیسلامییەکان پێشنیاریدەکەن، هێنانە دەرەوەی مێژووە لە تێگەیشتنماندا بۆ دەقە پیرۆز و ناپیرۆزەکان.

لێرەوە ڕەخنەکردنی ڕۆژئاوا نابێت مەترسی ئەو هەڵە فیکری و میتۆدی و ئەخلاقییانەمان لەیادبباتەوە کە دەخوازێت هەموو دەسکەوتە سیاسی و کولتووری و فیکریەکانی قۆناغی مۆدێرنە و ڕۆشنگەریی بۆناو ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو فەتوای ئیمامەکان بباتەوە. ڕەخنەکردنی ڕۆژئاوا مانای ئەوە نییە دەسکەوتێکی گرنگی وەک دیموکراسیەت، کە بەرهەمی فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنە و لێکدی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ئازادکردنی هێزەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنی و ئەقڵانیەتی دیالۆگ و هاتنەکایەی تاکەکەسی ئازاد و بەرهەمهێنانی سیستمێکی فرەڕەهەندی هەقیقەت و تاڕادەیەکی زۆریش کەنارگیرکردنی ئایینە، ببرێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی هێجگار گشتی لای ئەم یان ئەو سۆفی لە ئیسلامدا، یان بدرێتە پاڵ ئەم فەرمودە یان ئەویدیکەی پێغەمبەر، یان لەناو ئەم یان ئەو ئایەتدا سەرچاوە ڕەسەنەکەی بدۆزینەوە.

لەڕاستیدا سەعید لە پێشەکی چاپی تازەی کتێبی ئۆریانتالیزمدا کە لە ساڵی ١٩٩٥ دا چاپکراوەتەوە، گلەییەکی زۆر لەهەموو ئەو هێزە ناسیۆنالیستی و ئوسوڵییانە دەکات، بەتایبەتی لە جیهانی عەرەبیدا، کە بۆچوونەکانی ناو کتێبەکەیان بۆ بەخشینی شەرعیەت بە ئیسلام بەکارهێناوە و بە دیدێکی نەتەوەیی بەرتەسکەوە مامەڵەیان کردوە. سەعید بەگژ هەموو ئەوانە دەچێتەوە کە تێزەکانی ئەویان بۆ داکۆکیکردن لە بۆچوونی ناسیۆنالیستیی داخراو و دیدی توندڕەوی ئاینیی بەکارهێناوە. ڕەخنە قووڵەکانی سەعید لە ڕۆژئاوا مانای بەخشینی شەرعیەت بە ئاین نییە و ناکرێت توندڕەوی ئاینی و توندڕەوی نەتەوەیی لەناو کتێبەکانی سەعیدا بەدوای شەرعیەتدا بگەڕێت.

ڕەخنەی سەعید لە ڕۆژئاوا ڕەخنەیەک نییە لەپشتیەوە گەڕانەوەیەک بۆ ئیسلام هەبێت وەک چارەسەر، یان وای نیشاندات کە ئایندەی عەرب یان ڕۆژهەڵات

وابەستەی گەڕاندنەوەیە بۆ ئیسلام یان بۆ هەر کولتوورێکی دێرینی لۆکاڵی، بەپێچەوانەوە سەعید ڕۆشنبیرێکە تاسەر ئێسقان عەلمانییە و پرۆژەی ئازادی ئینسان لە هیچ پرۆژەیەکی ئاینیدا نادۆزێتەوە. ئالەم خاڵەدایە سەعید لەگەڵ سپینۆزادا یەکدەگرێتەوە و لەزۆر ڕووەوە هەوڵە فیکرییەکانی دەبێتە درێژکراوەیەکی لۆژیکی فیکری ئەم فەیلسوفە بێنیشتیمان و بێکۆمەڵگایە.

بەڵام ڕەخنەکانی سەعید لە ڕۆژهەڵاتناسی ئەوە ناگەیەنێت هەرچییەک ئەوان نووسیویانە قسەی بێمانا و پرووپوچ و بێبایەخ بێت. ئەم دیدە نابێت بەرە و ئەو کورتبینییەمان ببات کە پێمانوابێت ڕۆژهەڵاتناسەکان بەردەوام هەڵە و ناماقووڵیان بەرامبەر بە ڕۆژهەڵات کردوە، جگە لە ڕق و بێمانایی و بێحورمەتی بەرامبەر بەو میللەتانە هیچیدیان ئەنجامنەداوە. بەپێچەوانەوە ڕۆژهەڵاتناسەکان جگە لە دۆزینەوە و ئاشکراکردن و چاپکردنی چەندەها گەنجینەی فیکریی ڕۆژهەڵاتی، لەهەمانکاتدا زۆر ووردبینانە دەستنیشانی چەندان دیاردەی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی گرنگیان کردوە. بەبۆچوونی من کێشەی ڕۆژهەڵاتناسی بەپلەی یەکەم لە ڕاڤەکردن و لێکدانەوە تێگەیشتن لە دیاردەکاندایە، نەک لە وەسفکردن و ناساندنیاندا. بۆ نمونە شتێکی هەڵە یان ناماقووڵ نییە گەر بڵێین دیاردەی توندوتیژی و ستەمگەری یەکێک لە سیفەتە سەرەکییەکانی دەسەڵاتە لە دنیای ئێمەدا، لەمەدا ڕۆژهەڵاتناسەکان ڕاستدەکەن، بەڵام بەستنەوەی ئەم توندوتیژیە بە جەوهەرێکی کوردیی نەگۆڕەوە، یان گرێدانی بە جەوهەری گریمانکراوی ئیسلامەوە، یان بەستنەوەی بە بێتواناییەکی عەقڵییەوە، کارێکی هەڵەیە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی باسمانکرد هێڵە گشتییەکانی دید و تێڕوانینەکانی سەعیدە. ئەم نووسەرە ئەم بۆچوونانەی لە کتێبەکانی ئۆریانتالیزم» و «کولتوور و ئیمپریالیزم» و «نمایشکردنی ئیسلام» دا زۆر بە ڕوونی لێکداوەتەوە و ئەم کتێبانەش بۆ زۆربەی زمانەکانی دنیا وەرگێڕراون، کتێبی ئۆریانتالیزم بۆ ٣٦ زمان وەرگێڕدراوە.

دواهەمین بمەوێت لێرەدا بە خێرایی هێمای بۆبکەم ڕۆڵی سەعیدە وەک ڕۆشنبیر و پەیوەندی ئەوە بە ڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمی خۆیەوە. لەم ڕووەوە سەعید بەتەنها ئەکادیمیەکی پشت مێزی ناو هۆڵەکانی دەرس گووتنەوە نییە، بەڵکو ڕۆشنبیرێکی ئۆرگانیشە و ڕاستەوخۆ بەشدارە لەو هەڵسوکەوت و

چالاکییە سیاسییانەدا کە دەخوازن دنیایەکی باشتر و دادپەروەرانەتر بنیادبنێن. سەعید بەدەیان نووسینی ڕۆژنامەگەرییانەی بە عەرەبی و بە ئینگلیزی بڵاوکردۆتەوە کە بابەتی سەرەکییان کێشەی فەلەستینییەکانە، لەم ڕووەوە سەعید یەکێکە لەو فەلەستینییانەی کە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە بەرگریکردن لەم کێشەیە لە ناوەندە نێودەوڵەتی و کولتووریی و ئەکادیمییەکاندا ئەمە سەرەڕای بەشداربوونی لە چەندان دەمەتەقێی تەلەفیزۆنیدا و بەشداربوونی لە بەرهەمهێنانی چەند فلیمێکی دۆکۆمێنتیدا دەربارەی هەمان مەسەلە. سەعید پیاوێکە دانیشتووی دوو فەرهەنگ و دوو شار، فەرهەنگی نیشتیمان و فەرهەنگی مەنفا، قودس و نیویۆرک. قودس وەک شاری یادەوەری و منالی، نیویۆرکیش وەک شاری زیندەگی و کاری فیکریی و ئەکادیمی گەورە.

سەعید لە ساڵی ١٩٣٥ دا لە فەلەستین لەدایک بووە، لە ساڵی ٩٤٨ دا و لە دەرەنجامی شەڕی یەکەمی نێوان عەرەب و جولەکەدا لەگەڵ خێزانەکەیدا ڕایانکردوە بۆ میسر. دوای ئەوە وەک خوێندکار چووە بۆ ئەمریکا. لە ساڵی ٩٦٣ دا بڕوانامەی دکتۆرای لە ئەدەبی ئینگلیزیدا وەرگرتووە و پاش ماوەیەک بۆتە مامۆستا لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیویۆرک. ئێستاش وەک زانایەکی کۆمەڵایەتی و نووسەرێکی گەورە جیهان شارە و شار دەگەڕێ و گەمەکانی ئۆریانتالیزم و خەمەکانی مەنفا، ئازارەکانی داگیرکردن و وێنەکانی یاداوەری بە خوێنەر و گوێگرەکانی نیشانئەدات.

ڕەنگە لەدوای میشێل فۆکۆوە، ئێدوارد سەعید یەکێک لەو نووسەرە گرنگانە بێت کە توانیبێتی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژئاوا شیبکاتەوە. فۆکۆ لەڕێگای ئەو پەیوەندیەوە کە عەقڵ لەگەڵ دێوانەییدا دروستیدەکات و سەعیدیش لەڕێگای ئەو پەیوەندییەوە کە ڕۆژئاوای لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دروستیدەکات، هەوڵیانداوە نیشانیبدەن چۆن ڕۆژئاوا وێنەکانی خۆی و وێنەکانی ئەویدی دروستکردوە و بە چ شێوەیەک شووناسی خۆی بەرهەمهێناوە و چ شوناسێکیشی بەوانیدی بەخشیوە. لەدوای سەعیدەوە مەسەلەی بەرهەمهێنانی شووناس و مەسەلەی پەیوەندی نێوان شووناسە جیاجیاکان لەگەڵ یەکدا و مەسەلەی پەیوندی نێوان کۆلۆنیالزم و مەعریفە، کەوتوونەتە ناو سەرزەمینێکی میتۆدی و زانستی نوێوە ، لەدوای ئەم نووسەرە گەورەیەوە ناکرێت بە شێوەکانی بەر لە نووسینی کتێبی ئۆریانتالیزم لە کێشەی شوناس و لە کێشەی پەیوەندی نێوان شوناسە جیاجیاکان بدوێین بیربکەینەوە.

## سەرچاوەکان

1- Edward W Said, Orientalism, New York 1978.

2- Stichting Internationale Spinozaprijs. Edward Said, denker over grenzen, Uitgeverij Boom 1999.

3- Edward W. Said, Culture and Imperialism, Alfred A. Knopf, New York, 1993.

## نیتشه

## ئەو فەیلەسوفەی دەیویست هەموومان بکات بە شاعیر

«براکانم، تکاتان لێدەکەم، تکا، بەوەفابن بۆ زەوی و باوەڕ بەو کەسانە مەکەن کە باسی هیوایەکتان بۆ دەکەن لە دەرەوەی زەویدا»

نیتشه

### ١- دووسەد ساڵ دوای مەرگی نیتشه

٢٥ مانگی هەشتی ساڵی ٢٠٠٠ سەدساڵ بەسەر مەرگی نیتشەدا تێپەڕی. ئەم بۆنەیە بەسبوو بۆ ئەوەی دەیەها کتێب و سەدەها نووسین و ووتار و لێکۆڵینەوەی نوێ لەسەر ژیان و بیر و ئەندێشەکانی ئەم فەیلەسوفە بنوسرێ و دەیەها کۆڕ و کۆنفرانس و هەڵقەی لێکۆڵینەوەشی بۆ سازبدرێت. لە شوێنێکی وەک هۆڵەندادا سەرجەمی کتێبەکانی ئەم فەیلەسوفە ئەڵمانییە جارێکی دی چاپکرانەوە و ژمارەیەکیش لە کتێبەکانی سەرلەنوێ وەرگێڕدرانەوە. ڕەنگە چاپی بیست و نۆهەمی کتێبی «زەردەشت بەم شێوەیە دوا» و «مێژووی ژیانی نیتشه» کە لە پێنجسەد لاپەڕەی گەورەدا چاپکرابوو دیارترینی ئەو کتێبانەبن کە کەوتنە بازاڕەوە.

سەدساڵە ئەم فەیلەسوفە بە زمانە جیاجیاکانی جیهان دەخوێندرێتەوە کەچی کەم فەیلەسوف هەیە ئەوەندەی نیتشە خوێندنەوەی دژبەیەک و ناکۆکی بۆ کرابێت. هەندێک بە فەیلەسوفی نازیەتی لە قەڵەم ئەدەن، هەندێکی دیکە بە فەیلەسوفی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم، یەکێکی دی دەڵێت فەیلەسوفی پەرستنی ژیانە، ئەویدی دەڵێت فەیلەسوفی پەرستنی هێز و دەسەڵاتە، یەکێک دەیکاتە سەرسەخترینی فەیلەسوفی دژ بە خودا و دژ بە ئاین، ئەویدی

دەخوازێت بۆچوونەکانی نیتشە و خوداناسی بەیەکەوە کۆبکاتەوە، هەندێک وەک نەخۆشترین عەقڵ پێناسیدەکەن و هەندێکی دیش وەک گەورەترین و دووربینترین و بیلەمەتترین فەیلەسوفی مێژووی هاوچەرخ، هەندێک دەڵێن گەورەترین فەیلەسوفی ئازادی ڕاستەقینەی ئینسانە، هەندێکی دی جگە لە ئەرستۆکراتێکی دژ بە ئازادی شتێکی دیکەی تێدا نابینن، زۆریش هەن نیتشە بە فەیلەسوفی ئیرادە و ئیرادەگەرێتی دادەنێن.

یەکەمین دەرەنجامێک لەم هەموو پێناسە و خوێندنەوە ناکۆکانەوە وەدەستیبهێنین چڕ و پڕی و فرە لایەنی و زۆر ئاراستەیی بیری ئەم فەیلەسوفەیە. تەنها فەیلەسوف و داهێنەرە گەورەکان ناهێڵن بە ئاسانی خانەبەندی بکرێن و لەژێر چەتری پێناس و قوتابخانە و بۆچوونێکدا دەستبەسەربن. ڕۆحی گەورە هەمیشە لە دەرەوەی نەخشە و دۆگما و پێناسە سادەکانی فیکردا دەژی، تەنها داهێنەر و فەیلەسوفە گەورەکان دەتوانن لە یەککاتدا لەشکرێک دوژمن و لەشکرێک هەوداریان هەبێت، هەم وەک گوناهبار و هەم وەک فریشتە ببینرێن، بەهەندێک چێژ و بەهەندێک ئازار ببەخشن، لەهەندێکدا خۆشەویست و عەشق بچێنن و لەهەندێکی دیکەدا ڕق و ئێرەیی. ئەوەی بە تەنها هەر هەوادار و ئەوەشی بە تەنها هەر دوژمنی هەبێت زوو دەمرێت و لەیاد دەچێتەوە، گەورەیی فیکر لە گەورەیی دۆست و گەورەیی دوژمنەکانیدایە، فیکرێک لەیەککاتدا دۆست و دوژمنی نەبێت، فیکرێکە کێشەی گەورەی هەیە.

لەدەرەوەی ئەو پێناسە ناکۆکانەدا کە کەسانی دی بۆ ئەم فەیلەسوفەیان کردوە، نیتشە خۆی گومانی لەوە نەبووە کە فەیلەسوفێکی گەورەیە، ئەو خۆی دەیزانی بلیمەتێکی گرنگە و شوێنێکی گرنگ لە مێژووی فیکردا داگیردەکات، لەڕاستیدا نیتشە هەرگیز ئەم مەسەلەیەی نەشاردۆتەوە، لەزۆر شوێندا باس لە گەورەیی خۆی دەکات. نیتشە دەیگوت «سەدساڵ دوای مردنم تێمدەگەن من کێم و باسی چیتان بۆ دەکەم، ترسی گەورەشم ئەوەیە دوای مردنم بمپەرستن». لە شوێنێکی دیکەدا فیکری خۆی بە بورکان و دینامیت بەراورد دەکات. لەو نامانەشدا کە بۆ هاوڕێ و دۆستەکانی دەنووسی بەردەوام خۆی وەک «فەیلەسوفی ژیان» پێشکەشدەکرد. ئەمڕۆش لەزۆر ڕووەوە ئەم پێناسەیەی نیتشە بەسەر زۆربەی پێناسەکانی دیکەیدا زاڵە.

**٢- نیتشه و فیكری هاوچەرخ**

لە هەشتاکانەوە نیتشە یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە لەناو زۆربەی مشتومڕە فەلسەفییەکاندا ئامادەیە. لە هەرشوێنێکدا باس لە ئاین و خوداوەند، باس لە هەقیقەت و دەسەڵات، باس لە ئیرادە و ئارەزوو، باس لە جەستە و چێژ، باس لە ئەتیک و ئەخلاق بکرێت، لەوێدا نیتشە ئامادەیە. هەموو ئەمانەش بەشێکن لەو بابەتە گرنگانەی کە لە گرنگیپێدانی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکانن لە فیکری هاوچەرخدا، بەتایبەت لە دواهەمین چارەکی سەدەی بیستەمدا.

لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا بیری نیتشە یەکێکە لەو سەرچاوە فەلسەفییە گرنگانەی کە ڕۆحە ڕەخنەییەکان دەرس لە دید و میتۆد و تێڕوانینەکانی وەردەگرن و ئەو لایەنانەی فیکری ئەم فەیلەسوفە گەشەپێئەدەن کە قابیلی گەشەپێدانێکی ڕەخنەیی و بەرهەمهێنن بۆ خوێندنەوەی چەند ڕەهەندێکی دیاریکراوی دنیای هاوچەرخ. بە تایبەتی ئەو ڕەهەندانەی باس لە پەیوەندی نێوان هەقیقەت و دەسەڵات، ئیرادە و مەعریفە، ئەخلاق و ئاین، چێژ و جەستە و چەندان مەسەلەی گرنگی دیکەی لەم بابەتە دەکەن.

گەر ئەو وێنەیەی نیتشەمان قبووڵبێت کە بەهۆیەوە خۆی وەک فەیلەسوفی ژیان دەناسێنێت، ئەوکات وانەی یەکەم لە پەیوەندیدا بەم فەلسەفەیەوە، واتە لە پەیوەندیدا بە «فەلسەفەی ژیانەوە» وانەی بە تراژیدیاکردنی ژیانە. چەمکی تراژیدیا یەکێکە لە چەمکە گرنگەکانی بیری ئەم فەیلەسوفە. بەباوەڕی نیتشە بەبێ گەڕاندنەوەی ڕەهەندی تراژیدی بۆ ژیان، ئینسان لەناو بۆشاییەکی بێئەندازە وەڕسکەر و دووبارەبوونەوەیەکی بێتام و پڕ ڕۆتیندا دەژی. تراژیدیا بارگاویکردنی ژیانە بە چەندەها بڕیار و هەڵوسێت و هەڵبژاردنی پێشوەخت نەزانراو و دەرکپێنەکراو و حیساب بۆ نەکراو. تراژیدیا مانای سەفەر بە جوگرافیایەکدا کە نەخشەیەک نەبێت بتوانێت نهێنییەکانمان بۆ بدۆزێتەوە.تراژیدیا بە مانا نیتشەییەکەی بریتییە لە هەستکردن و هۆشیاربوونی ئینسان بە تەنیابوونی خۆی لەبەردەم وجودا بە گشتی و لە بەردەم بوونی تاکانەی خۆیدا بەتایبەتی.

ڕووداوی هەرە سەرەکی بوونی تراژیدی ئینسان دەرککردنیەتی بە مەرگی خوداوەند. لە دوای مەرگی خوداوە دڵنیاییەک نامێنێت ئینسان لە دەرەوەی

ڕاتی خۆیدا بەدوایدا بگەڕێت، لەدوای ئەم مەرگەوە هەقیقەتەکان، ئەخلاق، ماناکان دەکەونەوە ناو ژیان خۆیەوە، شتێک نامێنێت لەو دیوی ژیانەوە تیایدا بۆ مانا و هەقیقەت و ئەخلاق بگەڕێین. مەرگی خودا مەرگێکی گەردوونییە، بۆیە تەنهاکەوتنی ئینسانیش لەدوای ئەم مەرگەوە تەنیاکەوتنێکی گەردوونییە، لەبەردەم مەرگی خوداوەندا ئینسان ناچارە بۆ خودی خۆی و ئیرادە و ویست و توانا و لاوازیەکانی خۆی بگەڕێتەوە. بۆ دۆزینەوەی مانکانی ژیان، ماناکانی هەقیقەت و ئەخلاق و سەرفیرازی لە ڕووبەرە فراوانەکانی ئەو خودەدا بگەڕێت. خودا لای نیتشە ئەو پەناگە میتافیزیکییە گەورەیەیە کە ئینسان بە دەستی خۆی لەناویبردوە، لەناوبردنی خوداش ئازادییەکی داوەتێ کە تێکەڵە بە تەنیاکەوتنێکی کەینونی قووڵ. مانا تراژیدییەکانی ژیان لە دەرککردندایە بەم ڕاستییە وجودیە، دەرککردنیش بەم ڕاستییە و قبووڵکردنی تەحەداکانی جەوهەری تراژیدیایە لای نیتشە.

بێگومان هاتنەکایەی ئەم دیدە تراژیدییە بۆ ژیان ڕووداوێکی سادە نییە. مەرگی خودا و تەنیاکەوتنی ئینسان کۆمەڵێک دەرنجام دەخەنەوە کە سەرلەبەری بوون و تەماشاکردنەکانی ئینسان بەرامبەر بە ژیان و دیاردەکان دەگۆڕن. یەکەمین شتێک ئەم مەرگە لەگەڵ خۆیدا لەناویدەبات بیرۆکەی باشە و چاکەکاری ڕەهایە. مەرگی خودا و ئەو تراژیدیایەی لەم مەرگەوە لە دایکدەبێت وا لە نیتشە دەکات باوەڕی بەوە نەمێنێت کە شتێک هەبێت ناوی باشی ڕەها بێت و ئەرۆڤایەتی ناچاربێت هەمیشە و هەموو کات بەدوایدا بگەڕێت. لە سەرزەمینی تراژیدیادا، کە سەرزەمینی ژیانی هاوچەرخی ئینسانە، هەقیقەت لەت لەتە و بووەی بە تەنها موتڵەقە مەسەلەی تەنیاکەوتنی ئینسان خۆیەتی. لەت لەتبوونی هەقیقەت مانای نەمانی دڵنیایی ڕەها، کۆتایی مەعریفەیەک کە خۆی بە سەرچاوەی هەموو ڕاستییەکان بزانێت و کۆتایی هەقیقەتێک بۆ هەموو سەردەمانێک بشێت. لەدوای لەت لەتبوونی هەقیقەتەوە ئینسان ناچارە بە بەردەوامی ماناکانی باشە و خراپە، ڕاستی و درۆ و جوان و ناشیرین سەرلەنوێ پێناس بکاتەوە. نیتشە لێرەدا بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ هەقیقەت لە دەستی ئاین و هەموو میتافیزیکێکی نا ئاینیش دەسێنێتەوە و ڕاستەوخۆ دەیبەستێتەوە بە بوونی ئینسان و ئەو هاوکێشە وجودیانەی ژیانی ئینسانەوە کە لەسەر زەویدا دروستدەبن و دێنە کایەوە. تراژیدیا مانای کۆتایی ڕۆژگاری هەقیقەت و دڵنیاییە موتڵەقەکان.

گەڕاندنەوەی ئەم ڕەهەندە تراژیدیە بۆ ژیان، لە ئاستی ئەخلاق یان مۆراڵدا، مانای سەندنەوەی بەها ئەخلاقییەکان لەدەستی سیستەمەکانی ئەخلاق و بەخشینەوەی ئەم بەهایانە بە ئینسان و هەڵبژاردنەکانی. دوای مەرگی خوداوەند ئیدی سیستەمێکی ئەخلاقی گشتگیر نامێنێت هەمووان ناچارکات ملکەچی بن، لەم ساتە بەدواوە ئیرادەی بەرهەمهێنانی ئەخلاق ڕاستەوخۆ دەبێتە وابەستەی ئیرادەی ئینسان خۆی. ئیرادەی ئینسانیش نووقمی ناو گەمە و ئیرادەی دەسەڵات و کۆی هاوکێشە سەرزەمینییەکانی دیکەی بوونی ئینسانە. لەم ئاستەدا نیتشە ئینسان ناچاردەکات خۆی بەرهەمهێن و دروستکەر و داهێنەری نۆرم و بەها ئەخلاقییەکان بێت، خۆی نەخشە و پلان و ژیانی خۆی دیاریبکات. لەباتی ئەوەی ڕازیبێت لەدەرەوەڕا هێزێک بەناوی ڕاستییەکی موتڵەقەوە یان بەناوی هێزێکی میتافیزیکی دەرەوەی ژیان و دەرەوەی ئینسانەوە ئاغای بێت و شتەکانی بۆ دەستنیشانکات، خۆی دەبێتە دەستنیشانکەری چییەتی و چۆنیەتی چارەنووس و ئەخلاق و ئیرادە و هەڵبژاردنەکانی خۆی. بەم کارەش ژیان دەبێتە سەرزەمینی ملاملانێی ناوەکی و دەرەکی بەردەوام، دەبێتە سەرزەمینی بڕیاردانی بەردەوام و بزربوونی ئەو دڵنیاییە ڕەهایانەی پێمان دەڵێن چی باشە و چی خراپ. لێرەدا ژیان دەبێتە ڕستێک بەرپرسیاریەتی گەورە لە بەرامبەر خود و دنیا و ئیرادەدا. لە دۆخێکی لەم بابەتەدا ئینسان ناچارە شتەکان هەمیشە و سەرلەنوێ پێناسبکاتەوە، بەردەوام ماناکانی باشە و خراپە، بەختەوەری و بەدبەختی، هەقیقەت و درۆ، ئازادی و کۆیلەبوون بۆ جاری هەزارەهەم بنووسێتەوە. چونکە کە خودا دەمرێت هەموو پێناسەکان دەگۆڕێن، کە تراژیدیاش دەبێتە ماڵی بوون هیچ مانایەک بە نەگۆڕی نامێنێتەوە. ئەم مەسەلەیەیە وا لە نیتشە دەکات بڵێت ژیان کارێکی هونەریە و ئینسان دەبێت ببێتە ئەو هونەرمەندەی خۆی دەستنیاشانی فۆرم و ناوەرۆک و ماناکانی ژیان و کارەکانی خۆی بکات، کردنی ژیان بە هونەر مانای گۆڕینی ژیان لە شتێکی پێشوەخت پێدراو و دەستنیشانکراو و تەواو بووەوە بۆ تەوژمێک لە گۆڕان و جوڵەی بەردەوام و کارکردن بۆ بنیادنانی هونەرمەندانەی خود. بوونی ژیان بە کارێکی هونەری ئەو پەیامە ئەخلاقییەیە کە نیتشە لەدوای مردنی دینەوە بە ئینسانی دەبەخشێت. ئینسانی دوای مەرگی خوداوەند لەبەردەم ئەگەری کردنی ژیانیدایە بە تابلۆیەکی هونەری کراوە بەسەر ئەگەری دەیان و سەدان فۆرم و مانا و دەلالەتی نوێدا، بەمەش بڕی بەرپرسیاریەتی ئینسان بە ڕادەیەکی

پڕۆکێنەر بەرزدەبێتەوە و مرۆڤ جگە لە خودی خۆی عەلاگەیەکی بۆ نادۆزرێتەوە ناشیرینییەکانی ژیانی پێداهەڵواسێت.

### ٣- نیتشە و سەرزەمینیبوون

کەم فەیلەسوف هەیە ئەوەندەی نیتشە سەرزەمینی بێت و لە ئارەزو و ترس و چاوقایمی وحەز و توانا و ئیرادەی ئینسانەوە ئاڵابێت. نیتشە تا ئەو ڕادەیە سەرزەمینییە کە ئاسمانیش بکاتە بەشێک لە زەمین خۆی، بیکاتە فەزایەکی هەڵواسراو کە لە خوارەوە دروستکراوە و بەرزکراوەتەوە بۆ سەرەوە. ئەوەی ئاسمان لە شتێکی سەرزەمینییەوە دەکاتەوە شتێکی ئاسمانی خەیاڵی کۆیلەکانە، ئاسمان کە وێنەیەک لە وێنەکانی سەرزەمینە لەلایەن خەیاڵی ئەو کۆیلانە بۆ ئاسمان بەرزکراوەتەوە کە ئیرادەی بەرگری و موغامەرەیان تێدا کوژاوەتەوە. جەوهەری ئەم ئاسمانە سەرزەمینییە جەوهەری ئیفلیجکردنی ئیرادە و سەندنەوەی سەروەریە لە ئینسان، دنیایەکە کەسانێکی دیاریکراو بۆ کۆیلەبوونی خۆیان و پەکخستنی ئیرادە و کوشتنی ڕۆحیەتی سەرچڵانەی هەمووان دروستیانکردوە. نیتشە لەم بۆچوونانەیدا یەکێکە لە ڕەخنەگرە هەرە چاوقایمەکانی ئاین و لە بێدینترین فەیلسوفەکانی مێژوو. نیتشە بەناوی سەرزەمینیبوونی شتەکانەوە داوا لە ئینسان دەکات بە وەفابێت بۆ دنیا و باوەڕی بە مژدە و بەڵێنێکی دەرە زەمینی نەبێت. نیتشە ئینسان ئامۆژگاری دەکات لەو ڕاستییە تێبگات کە ژیان هەمیشە ڕووی لە کۆتاییە و لە جەوهەردا سەفەرێکی کورتە و لە هەموو ساتێکدا قابیلی کوژاندنەوەیە، بۆیە داوای ئەوە دەکات ئینسان سەرقاڵی ئەوەبێت ژیانی خۆی بکاتە پرۆژەیەکی ئیستاتیکی و بەردەوام سەرگەرمی تازەکردنەوە و گۆڕان و کرانەوەی سنوورەکانی بێت.

نیتشە خۆی کوڕی قەشەیەک بوو و لە خێزانێکی ئاینیشدا گەورەبوو، کەچی دواتر بووە یەکێک لە ڕەخنەگرە هەرە گەورە و کوشندەکانی دین، بەتایبەتی مەسیحیەت. بەڕای نیتشە یاسا و ئەحکام و داواکاریە ئاینیەکان جگە لە دروستکردنی بەندیخانەیەکی ڕۆحی شتێکی دیکە نین و ئاین دوژمنی یەکەمی ئازادی و دوژمنی یەکەمی ژیان و دوژمنی یەکەمی ئیرادەی ئازادە. لەم ڕووەوە شەڕی نیتشە لەگەڵ ئاییندا یەکێکە لە شەڕە هەرە گرنگ و گەورەکانی فیکر لەگەڵ ئاییندا. جەوهەری تراژیدیا لای نیتشە دەربڕی پەلاماری فرەلایەنی ژیانە

بۆسەر تاکلایەنی ئاین و تاکمانایی هەر یەقینێکی میتافیزیکی دیکەش. نیتشە لەباتی تەسلیمبوون بە یاسا پێشوەخت نووسراو و لە ئەزەلەوە پێدراوەکان ئینسان بانگێشە دەکات خۆی بیر لە دنیا و ڕووداو و کار و کردەوەکان بکاتەوە، خۆی بەرپرسیاریەتی هەڵگرێت و ئیرادەی خۆی بکاتە سەرچاوەی پەیوەندیکردن بە دنیاو بوون و ژیانەوە نەک ئیرادەیەک لەدەرەوەی ئەم شتانەوە ئەمر بکات. نیتشە ئەوەندە پێ لەسەر سەربەخۆبوونی ئینسان و سەربەخۆیی ئیرادە دادەگرێت داوای ئەوە دەکات کەس باوەڕ بەو نەکات و نەکەونە دوای بیر و بۆچوونەکانی، لەباتی ئەمە هەرکەس لە هەوڵی ئەوەدا بێت خۆی بیر و بۆچووون و ئەخلاق و شێوە ژیانی خۆی بەرهەمبهێنێت و دنیای خۆی خۆی بینابکات.

بۆ پیادەکردنی ئەم ستراتیژییە سەربەخۆ و ئیرادەگەرییە وجودییە نیتشە ئامۆژگاریمان دەکات هەموومان ببینە شاعیری ژیانی خۆمان. مەبەستی نیتشە لە شاعیربوون ئەوەیە هەر یەک لە ئێمە خۆی ببێتە خاوەنی ژیانی خۆی و خۆی خاوەنی مانا و بەها و پەیامەکانی ئەم ژیانە بێت. بەباوەڕی نیتشە ژیانی هەر یەکێک لە ئێمە بریتییە لە حیکایەتێک، ئێمە دەبێت لێنەگەڕێین کەس ئەم حیکایەتەمان بۆ بنووسێتەوە، دەبێت نووسینەوەی ئەم حیکاتە لە کەسانی دیکە بسێنینەوە و خۆمان حیکایەتی خۆمان بنووسینەوە. بەڵام بۆ ئەوەی ببینە حیکایەتنووسی ژیانی خۆمان دەبێت هەریەکێکمان سەرەتا ژیانی خۆی خۆشبووێت، دەبێت لە چارەنووس و ئازار و مەترسییەکانی ناو ئەم ژیانە نەترسێت، نا نەک نابێت لە چارەنووس بترسین، نیتشە تا ئەو شوێنە دەڕوات و دەڵێت پێویستە هەرکەسێک چارەنووسی خۆی خۆشبوێت. خۆشویستنی ژیان و خوشویستنی چارەنووس مانای خۆشویستن و ڕێزگرتنی دەرکەوتە جیاوازەکانی ژیان، مانای ئامادەگی بەپیرەوەچوونی ژیان لە تاڵ و شیرینییەکانیدا. بەڵام نووسینەوەی حیکایەتەکانی ژیان کارێکی ئاسان نییە، خۆشویستنی چارەنووس و کردنی ژیان بە قەسیدەیەکی کراوە، بیابانێک لە زەحمەتی لە دواوەیە. بۆئەوەی ببین بە نووسەری حیکایەتەکانی ژیان، بۆئەوەی لە چارەنووسی خۆمان نەترسین و بتوانین سەما بە مەترسییەکانی ناو ئەم چارەنووسە بکەین، دەبێت خاوەنی فیکرێکی بنیادنەر و داهێنەربین، فیکرێک ئەکتیف لەسەر ژیان و دنیا و مەترسییەکان کاربکات، فیکرێک بنیادنەری جیهانبینی و دیدێکی کراوەب و ڕیسکئامێزێت بۆ ژیان، فیکرێک بەردەوام هەم تێبینی خۆی بکات و هەم تێبینی

ژیان و هەم تێبینی جیهان، بەچاوێکی هونەرمەندانەوە لە ژیان و بوون بڕوانێت و مەترسییەکان وەک داوەتکردنێک بۆ سەماکردن تەماشا بکات. لەم ڕەوتەدا نیتشە خۆی وەک دواهەمین قوتابی ئەو خودا پڕ پێکەنین و پڕ سەمایە دەناسێنێت کە پێیدەڵێت «دیۆنیسوس». وەک دەبینین نیتشە دوای ڕەخنە کوشندەکانی لە ئاین پێماندەڵێت من ئاینێکم بۆ هێناون، بەڵام ئاینێکی ئاسایی نا، بەڵکو ئاینێکی تراژیدی. ئاینێک تێیدا ئینسان خۆی چارەنووسی خۆی دیاریدەکات و خۆی سەروەری خۆیەتی. لەنێوان ئینسان و ئەم چارەنووسەشدا خۆشەویستی و ئیرادە و ئارەزوو هەیە، نەک قەدەرێکی نابینا و سەپاو.

بەڵام نیتشە هەمیشە ئەم پیاوە دینۆسیسییە نەبووە کە ئامێزی بە ژیاندا کردبێت و مەترسییەکانی وەک داوایەک بۆ سەماکردن ئەزموونکردبێت. نیتشە ڕۆژگارێکی درێژ لە ژێر کاریگەری شۆپێنهاوەردا دنیای وەک تاریکستانێک بینیوە. ڕەشبینی شۆپێنهاوەر بەشێکی گرنگی دیدی نیتشە بووە بۆ ژیان، سەردەمانێک لەپاڵ شۆپێنهاوەردا باوەڕی وابووە کە ژیان بریتییە لە ئازارێکی بەردەوام، ئینسانی هۆشیار و حەکیم ئەو کەسە نەبووە عەوداڵی دۆزینەوەی زۆرترین خۆشی بێت و لەدوی سەماکردنبێت لەگەڵ مەترسییەکاندا، بەڵکو ئەو کەسەبووە کە سەرقاڵی ئەوەیە کەمترین ئازار بچێژێت. لەو قۆناغە شۆپێنهاوەریەدا نیتشە باوەڕی وابووە تێرکردنی ئارەزووەکان جگە لە وەهم شتێکی دیکە نییە و ئینسان هەرگیز ناتوانێت هەموویان وەدیبهێنێت. بۆیە لەباتی زیادکردنی بڕی بەختەوەری باس لە کەمکردنەوەی بڕی بەدبەختی دەکات، لەباتی باس لە ڕووکارە درەوشاوەکانی ژیان باس لە ڕووبەرە تاریکەکانی دەکات. نیتشە دواتر لەژێر کاریگەری شۆپێنهاوەر دەردەچێت و ژیان لەو تاریکییە ئەبەدیەدا نابینێت کە شۆپنهاوەر پێشنیاریدەکات. لەمە بەدوا نیتشە تێرکردنی ئارەزووەکان وەک هەنگاوێکی سروشتیی و پێویستی گەیشتن بە مەسەلەی باشە و چاکەکاری تێدەگات. کەچی لە ژیانی تایبەتی خۆیدا سۆفی ئاسا ژیاوە و دژایەتیەکی گەورەی خواردنەوەی ئەلکهولی کردوە. نیتشە لەهەموو ژیانیدا تەنها یەک جار چوار پەرداخ بیرەی خواردۆتەوە، لە هەرشوێنێک دانیشتبێت شیری داواکردوە و شیری خواردۆتەوە. بەلای نیتشەوە ئەلکهول و مەسیحیەت، یان دین، وەک یەک وان، هەردووکیان کاریان بێهۆشکردنی ئینسانە. بە باوەڕی نیتشە گەورەترین دوو دەرمانی بەنجکردن لە ئەوروپادا

بریتین لە ئەلکهول و مەسیحیەت. مەسیحیەت فەلسەفەی ئەو کۆیلە تەمبەڵانەی ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووە کە تاقەتی تەحەداکردنی ژیانیان نەبووە، تاقەتی بەکارهێنانی ئیرادەی خۆیان و تێپەڕین بەناو تراژیدیاکانیاندا نەبووە. هەڵویستی نیتشە لە مەسیحیەت هەڵویستی فەیلەسوفێکە کە ئیرادەی ئینسان و ئارەزووەکانی لەپێشتر دادەنێت تا هەر بەها و نۆرم و یاسا و حەڵاڵ و حەرامێک لەدەرەوەڕا بەسەر ژیان و بەسەر ئینساندا، بەناوی هەقیقەتێکی بان ـ ئینسانی و ئاسمانیەوە، سەپێندرابێت. نیتشە تا سەر ئێسقان فەیلەسوفێکە دژ بە ئاین. بەباوەڕی ئەو ئینسان لە ئایندا ئیرادەی خۆی ئەدۆڕێنێ و تەسلیمی بەشە لاوازەکانی ناو ڕۆحی خۆی ئەبێت. ئاین بەپلەی یەکەم بیرنەکردنەوە و قبووڵکردنێکی بێبیرکردنەوەی لاوازییەکانی ژیانە. ئاین فەلسەفەی کۆیلەیەتییە، فەلسەفەی ئەو ئینسانە بچووکانەیە کە نایانەوێت ژیانیان بکەنە پەلامارێکی بەردەوام بۆسەر خاڵە لاواز و نەخۆشەکانی ناو ژیان خۆی. ئاین نەک تەنها ئیرادە وێران دەکات، بەڵکو ئارەزوەکانیش دەکوژێت. لەم ڕەوتەدا نیتشە بیرۆکەی چاکەکاری ئاینی ڕەتدەکاتەوە، چونکە چاکەکاری ئاینی کۆمەڵێک ئەخلاقیاتە لە جەوهەردا دژ بە ژیان و دژ بە خەون و دژ ئیرادە و تواناکانی ئینسانن. ئاین دژ بە ژیانێکە تراژیدیای کردبێتە فەلسەفەی خۆی، ژیانێک بەردەوام چەپڵە بۆ ئیرادە لێبدات و خۆی فۆرم و ناوەڕۆکی خۆی دیاریبکات. نیتشە دوژمنی هەرسەرەکی قەناعەت و لاوازیی و گلەیی و گازەندەکردن بووە. ئەو گۆرانیبێژی ئیرادە و شاعیری گەمەکردن بە ژیان و سەماکەرێکی وجودیانەیە کە تێیدا ئینسان هەمیشە لەلێواری مەترسیدا ماناکان و مەوداکانی خۆی دەستنیشانکات. ئەم گۆرانی گوتنە بۆ ژیان و ئیرادە و هێز و چاوقایمی و بازادانی پڕ مەترسییەیە نیتشە دەکاتە یەکێک لە سەرسەختین دوژمنەکانی ئاین.

لە دیدی نیتشەدا ئاین ژیان دەکاتە تەسلیمبوونێکی سەرتاسەری و سەرزەمینی پەککەوتنی ئیرادە، ژیان لە ناو ئایندا ژیانێکە چارەنووسی خۆی لە دەستی خۆیدا نییە، ڕووبەرێکی لەدەرەوەڕا کۆنترۆڵ و چاودێریکراو و گەمارۆدراوە. ئاین ژیان دەکاتە بوونەوەرێکی بچووک و ترسا و نەک ژیان ئەو بکاتە سەرزەمینی سەرچڵی و موغامەرە و گەمەی چاوقایمانە. ئاین مەعریفەیەکە جۆرێک لە دڵنیایی و جۆرێک لە وەهمیش پێشکەشدەکات، ئینسان لە بوونەوەرێکی یاخییەوە دەکاتە بوونەوەرێکی گوێڕایەڵ و ملکەچ، لە پیاوێکەوە

ژیان و هەم تێبینی جیهان، بەچاوێکی هونەرمەندانەوە لە ژیان و بوون بڕوانێت و مەترسییەکان وەک داوەتکردنێک بۆ سەماکردن تەماشا بکات. لەم ڕەوتەدا نیتشە خۆی وەک دواهەمین قوتابی ئەو خودا پڕ پێکەنین و پڕ سەمایە دەناسێنێت کە پێیدەڵێت «دیۆنیسوس». وەک دەبینین نیتشە دوای ڕەخنە کوشندەکانی لە ئاین پێماندەڵێت من ئاینێکم بۆ هێناون، بەڵام ئاینێکی ئاسایی نا، بەڵکو ئاینێکی تراژیدی. ئاینێک تێیدا ئینسان خۆی چارەنووسی خۆی دیاریدەکات و خۆی سەروەری خۆیەتی. لەنێوان ئینسان و ئەم چارەنووسەشدا خۆشەویستی و ئیرادە و ئارەزوو هەیە، نەک قەدەرێکی نابینا و سەپاو.

بەڵام نیتشە هەمیشە ئەم پیاوە دینۆسیسییە نەبووە کە ئامێزی بە ژیاندا کردبێت و مەترسییەکانی وەک داوایەک بۆ سەماکردن ئەزموونکردبێت. نیتشە ڕۆژگارێکی درێژ لە ژێر کاریگەری شۆپێنهاوەردا دنیای وەک تاریکستانێک بینیوە. ڕەشبینی شۆپێنهاوەر بەشێکی گرنگی دیدی نیتشە بووە بۆ ژیان، سەردەمانێک لەپاڵ شۆپێنهاوەردا باوەڕی وابووە کە ژیان بریتیە لە ئازارێکی بەردەوام، ئینسانی هۆشیار و حەکیم ئەو کەسە نەبووە عەوداڵی دۆزینەوەی زۆرترین خۆشی بێت و لەدوی سەماکردنبێت لەگەڵ مەترسییەکاندا، بەڵکو ئەو کەسەبووە کە سەرقاڵی ئەوەیە کەمترین ئازار بچێژێت. لەو قۆناغە شۆپێنهاوەریەدا نیتشە باوەڕی وابووە تێرکردنی ئارەزوەکان جگە لە وەهم شتێکی دیکە نییە و ئینسان هەرگیز ناتوانێت هەموویان وەدیبهێنێت. بۆیە لەباتی زیادکردنی بڕی بەختەوەری باس لە کەمکردنەوەی بڕی بەدبەختی دەکات، لەباتی باس لە ڕووکارە درەوشاوەکانی ژیان باس لە ڕووبەرە تاریکەکانی دەکات. نیتشە دواتر لەژێر کاریگەری شۆپێنهاوەر دەردەچێت و ژیان لەو تاریکییە ئەبەدیەدا نابینێت کە شۆپنهاوەر پێشنیاریدەکات. لەمە بەدوا نیتشە تێرکردنی ئارەزوەکان وەک هەنگاوێکی سروشتیی و پێویستی گەیشتن بە مەسەلەی باشە و چاکەکاری تێدەگات. کەچی لە ژیانی تایبەتی خۆیدا سۆفی ئاسا ژیاوە و دژایەتیەکی گەورەی خواردنەوەی ئەلکهولی کردوە. نیتشە لەهەموو ژیانیدا تەنها یەک جار چوار پەرداخ بیرەی خواردۆتەوە، لە هەرشوێنێک دانیشتبێت شیری داواکردوە و شیری خواردۆتەوە. بەلای نیتشەوە ئەلکهول و مەسیحیەت، یان دین، وەک یەک وان، هەردووکیان کاریان بێهۆشکردنی ئینسانە. بە باوەڕی نیتشە گەورەترین دوو دەرمانی بەنجکردن لە ئەورووپادا

بریتین لە ئەلکهول و مەسیحیەت. مەسیحیەت فەلسەفەی ئەو کۆیلە تەمبەڵانەی ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووە کە تاقەتی تەحەداکردنی ژیانیان نەبووە، تاقەتی بەکارهێنانی ئیرادەی خۆیان و تێپەڕین بەناو تراژیدیاکانیاندا نەبووە. هەڵوێستی نیتشە لە مەسیحیەت هەڵوێستی فەیلەسوفێکە کە ئیرادەی ئینسان و ئارەزووەکانی لەپێشتر دادەنێت تا هەر بەها و نۆرم و یاسا و حەڵاڵ و حەرامێک لەدەرەوەڕا بەسەر ژیان و بەسەر ئینساندا، بەناوی هەقیقەتێکی بان ـ ئینسانی و ئاسمانیەوە، سەپێندرابێت. نیتشە تا سەر ئێسقان فەیلەسوفێکە دژ بە ئاین. بەباوەڕی ئەو ئینسان لە ئایندا ئیرادەی خۆی ئەدۆڕێنێ و تەسلیمی بەشە لاوازەکانی ناو ڕۆحی خۆی ئەبێت. ئاین بەپلەی یەکەم بیرنەکردنەوە و قبووڵکردنێکی بێبیرکردنەوەی لاوازییەکانی ژیانە. ئاین فەلسەفەی کۆیلەیەتییە، فەلسەفەی ئەو ئینسانە بچووکانەیە کە نایانەوێت ژیانیان بکەنە پەلامارێکی بەردەوام بۆسەر خاڵە لاواز و نەخۆشەکانی ناو ژیان خۆی. ئاین نەک تەنها ئیرادە وێران دەکات، بەڵکو ئارەزوەکانیش دەکوژێت. لەم ڕەوتەدا نیتشە بیرۆکەی چاکەکاری ئاینی ڕەتدەکاتەوە، چونکە چاکەکاری ئاینی کۆمەڵێک ئەخلاقیاتە لە جەوهەردا دژ بە ژیان و دژ بە خەون و دژ ئیرادە و تواناکانی ئینسانن. ئاین دژ بە ژیانێکە تراژیدیای کردبێتە فەلسەفەی خۆی، ژیانێک بەردەوام چەپڵە بۆ ئیرادە لێبدات و خۆی فۆرم و ناوەرۆکی خۆی دیاریبکات. نیتشە دوژمنی هەرسەرەکی قەناعەت و لاوازیی و گلەیی و گازەندەکردن بووە، ئەو گۆرانیبێژی ئیرادە و شاعیری گەمەکردن بە ژیان و سەماکەرێکی وجودیانەیە کە تێیدا ئینسان هەمیشە لەلێواری مەترسیدا ماناکان و مەوداکانی خۆی دەستنیشانکات. ئەم گۆرانی گوتنە بۆ ژیان و ئیرادە و هێز و چاوقایمی و بازادانی پڕ مەترسییەیە نیتشە دەکاتە یەکێک لە سەرسەختترین دوژمنەکانی ئاین.

لە دیدی نیتشەدا ئاین ژیان دەکاتە تەسلیمبوونێکی سەرتاسەری و سەرزەمینی پەککەوتنی ئیرادە، ژیان لە ناو ئایندا ژیانێکە چارەنووسی خۆی لە دەستی خۆیدا نییە، ڕووبەرێکی لەدەرەوەڕا کۆنترۆڵ و چاودێریکراو و گەمارۆدراوە. ئاین ژیان دەکاتە بوونەوەرێکی بچووک و ترسا و نەک ژیان ئەو بکاتە سەرزەمینی سەرچڵی و موغامەرە و گەمەی چاوقایمانە. ئاین مەعریفەیەکە جۆرێک لە دڵنیایی و جۆرێک لە وەهمیش پێشکەشدەکات، ئینسان لە بوونەوەرێکی یاخییەوە دەکاتە بوونەوەرێکی گوێڕایەڵ و ملکەچ، لە پیاوێکەوە

ڕۆحی پڕ بێت لە نەخێرکردنێکی ئیرادەگەرانە دەیکاتە بوونەورێکی تەسلیم بە هەموو شێوەکانی بەڵێ گووتن. مەعریفەی ئاینی مەعریفەی ترسە، نیتشە ئەو فەیلەسوفەیە کە دەڵێت من مەعریفەیەکم ناوێت بێ مەترسی، ژیان بەبێ مەترسی و موغامەرە مانای نییە، پێویستمان بە گەڕاندنەوەی عەقڵەیتی ئەو شازادانەیە کە گەمەیان بە ژیانی خۆیان دەکرد و ئامادەبوون بۆ پاراستنی غروری خۆیان ژیانیان لەدەستبدەن.

نیتشە باوەڕی وایە ئاین تەسلیمبوون، بچووکیی، قەناعەتهێنان و بێدەسەڵاتی وەک چاکەکاری پێناسدەکات. ئاین ژیان دەکاتە لاپەڕەیەکی سپی تەسلیمبوو بە هەر حەرفێک لەسەری بنووسرێت. ئەوەی لەم گەمەیەی ئایندا ئەدۆڕێت توانای ئینسانە بۆ نووسینەوەی حیکایەتەکانی خۆی، ڕێگرتنە لەوەی ئینسان ببێتە شاعیری بوون و ژیانی خۆی. لەڕاستیدا ئاین بەسەندنەوەی توانای نووسینەوەی حیکایەتەکان لە ئینسان دزییەکی گەورە لە ژیان دەکات و ئینسان لە گرنگترین شتێک تالاندەکات کە کە توانای بەرهەمهێنانی مانای سەربەخۆی هەبێت. قەناعەتی ئاینی لای ئەم فەیلەسوفە شتێک نییە زیاتر لە تالاکردنی خەزێنە نادیارەکانی ژیان، ئەو خەزێنانەی کە دەبێت لەڕێگای چاوقایمی و ڕیسک و سەماکردن لەگەڵ مەترسییەکاندا بیاندۆزینەوە، قەناعەت کوشتنی هەموو ئەو ئەگەرانەیە کە دەشێت لە قووڵایی ساتە مێژووییە جیاجیاکاندا پەنهانبێت و ئێمە دەبێت بیاندۆزینەوە. نیتشە گەورەیی ژیان لە گەورەیی تەحەداکانیدا دەبینێت، ژیان لەوکاتەدا مانا بەرزەکانی خۆی وەردەگرێت کە تەحەداکانی گەورە و پڕ مەترسی بن.

خودا کە دەڕوات ئینسان بەجێدەهێڵێت بۆ خۆی و بۆ هەڵبژاردنەکانی خۆی، بە ئینسان دەڵێت من تۆم دروستکردوە، ئەوە دنیا و ئەوەش زیندەگی، بڕو خۆت پادشای خۆت و خۆت سەروەری ژیانی خۆت بە. کۆچی خودا مانای لەدایکبوونی خودایەکی دیکەیە کە هەموو شتەکان و هەموو چارەنووسەکان و هەموو بڕیارەکان ئەداتەوە دەستی ئینسان خۆی.

بۆ نووسینی ئەم باسە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

بەشە فەلسەفییەکەی ڕۆژنامەی Trouw ڕۆژی ٢-٩-٢٠٠٠

بەشە فەلسەفییەکەی ڕۆژنامەی Trouw ڕۆژی ٩ سێپتێمبەر ٢٠٠٠

Filosofie Magazine ژمارەی ٧ مانگی ٩ ساڵی ٢٠٠٠

# سەدەیەک لە شوناس

# سەدەیەک لە نێوان ئومێد و نائومێدیدا

## ١- کورد و سەدەی بیستەم

بە تێپەڕبوونی سەدەی بیستەم و پێنانە ناو سەدەی بیست و یەکەمەوە یەکێک لە گرنگترین ئەرکە فیکرییەکانمان ڕاوەستانێکی ڕەخنەییە لەبەردەم مێژووی ئەو سەدەیەدا کە لە ئێستاتدا چەند مەترێک لە دوامانەوەیە. ڕاستە ئەمڕۆکە ئەو سەدەیە بۆتە بەشێک لە ڕابووردوو،، ڕۆژگارێکە تێپەڕیوو، بەسەرهاتەکانی بەشێوەی حیکایەت دەگێڕدرێنەوە، هەندێک بە سۆز و هەندێک بە ڕق و هەندێک بە شەرم و هەندێک بە فەخرەوە بیر لە ڕووداوەکانی دەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا حیکایەتی ئێمەو ئەو سەدەیە کۆتایی پێنەهاتوە، هێشتا زۆربەی ئەو کێشە و مەسەلە و بابەتە گرنگانەی ڕۆژانە ڕووبەڕوویان دەبینەوە، شتگەلێکن لەو سەدەیەوە بۆمان ماونەتەوە. ئێمە هێشتا لەناو تاریکی و ڕووناکی، کەوتن و هەستانەوە و خەون و تێکشکانی پرسیارەکانی سەدەی بیستەمدا نووقمین، زۆربەی ئەو وەڵامانەش کە لە لامان کۆبوونەتەوە وەڵامگەلێکن لە فەزا فیکری و ڕۆشنبیریی و ڕەمزییەکەی ئەو سەدەیەوە هاتوون. بەم مانایە بۆ ئێمەی کورد سەدەی بیستەم ڕابوردوویەک نییە لە پشتمانەوە بەجێمان هێشتبێت، بەڵکو بەشێکە لە ئاییندە و بەرەوڕووی دەچین، قۆناغێک نییە تێپەڕیبێت بەڵکو سەردەمانێکە و پێیدەگەین.

لئێستا ئەوپرسیارەی بکرێت لە خۆمانی بکەین ئەوەیە: ئایا بە چ مانایەک سەدەی بیستەم سەدەیەکە هێشتا لە پێشمانەوەیە؟ چۆن و بە چ مانایەک بەرەوڕووی دەچین و چ مەبەستێکمان هەیە کە دەڵێین ئەو سەدەیە هێشتا کۆتایی پێنەهاتووە؟

زۆر بە کورتی مەبەستم لە کۆتاینەهاتنی سەدەی بیستەم ئەوەیە کە تائێستاش زۆربەی ئەو بابەت و مەسەلە و کێشانەی ئەو سەدەیە لە دنیای

ئێمەدا هێناونیەتە کایەوە، کۆتاییان پێنەهاتووە، نا نەک هەر کۆتاییان پێنەهاتووە، بەڵکو شێوازی تەماشاکردن و ڕاڤەکردن وچارەسەرەکردنیشیان تا ڕادەیەکی زۆر وەک خۆی ماوەتەوە و لە هەمان ڕوانگەی سیاسی و ئەخلاقی و مەعریفیەوە مامەڵەدەکرێن کە لەو سەدەیەدا باڵادەستبوون.

بەڵام داخۆ گرنگترین مەسەلەیەک لە سەدەی بیستەمدا کۆمەڵگای ئێمەی سەرقاڵکردبێت و بەدوای وەڵام و چارەسەردا گەڕبێت چیبووە؟ چییە ئەو مەسەلەیە کە تا ئێستاش لەهەمان ڕوانگەوە مامەڵەدەکرێت؟

دەشێت زیاد لە وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارە هەبێت، دەشێت نەوە جیاکان وەڵامی جیاجیا بەم پرسیارە بدەنەوە، ئافرەتان بەشێوەیەک ئەوسەدەیە وێنابکەن جیا لە وێناکردنی پیاوان، خەڵکی شارەکان دیدێکیان هەبێت جیا لە خەڵکی لادێ، خوێندەواران هەڵگری تێگەیشتنێک بن جیا لە تێگەیشتنی نەخوێندەواران، هتد...

بۆ کەسێکی وەک من، کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا ژیاوە و سەرەتاکانی ووشیاریی بەڕووی جیهاندا لە ناوەڕاستی هەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی ئەو سەدەیەدا کراوەتەوە، مەسەلەی هەرەسەرەکی کۆمەڵگای کوردی لەو سەدەیەدا مەسەلەی بنیادنان و گەشەپێدان و پاراستنی «شووناسی نەتەوەیی کوردییە». مەسەلەی چۆنیەتی پاراستنی بنەما سەرەکییەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی و چۆنیەتی پاراستنی بنەما ڕۆشنبیری و ئەخلاقی و ڕەمزی و سیاسییەکانی ئەم بزوتنەوەیە. بە مانایەکی دیکە سەدەی بیستەم لە دیدی منەوە سەدەی بڕیاردانی خەڵکی کوردوستانە بۆ خۆبینین و خۆپێناسەکردن وەک ئەندامی یەک نەتەوە، نەتەوە وەک پێکهاتێکی سیاسی و کولتووری و ویژدانی کە وەک چوارچێوەی بەرهەمهێنانی شووناسی کۆیی کاربکات و بە شووناسی تاکەکەسیش یەکێک لە ئاراستە سەرەکییەکانی ماهییەت وەرگرتن ببەخشێت.

ئەگەر ئەمە تەحەدای گەورەی مێژووی ئێمەبێت لە سەدەی بسیتەمدا لەهەمانکاتدا ئەو مێژووە مێژوویەکە نووقمە لەناو کێشە و گرفت و زەحمەتییەکانی بنیادنانی شووناسی نەتەوەییدا. شوناسێک کە گەورەتر و کراوەتر و مژدەبەخەشترە لە شووناسە ناوچەییە بەرتەسکەکان و بچووکتریشە

لەو شووناسە کۆسمۆپۆلیتییانەی دەکەونە ئەودیوی شووناسی نەتەوەییەوە. شووناسی نەتەوەیی بەمانای ڕزگاربوونێکی دووجەمسەر لە شوناسێک گەورەتر لە شووناسی نەتەوە و لە شوێناسێک بچووکتر لە شووناسی نەتەوە. بەم مانایە سەدەی بیستەم لە مێژووی ئێمەدا سەدەیکە لە دۆخێکی مێژوویی و فانتازی و ویژدانی سەختدابووە، لەسەرێکەوە دەبێت بە سەدەی خەونی ماڵئاویکردن لە پێکهاتە بچووکەکانی بەر لەنەتەوە، لەسەرێکی دیکەوە دەبێتە ڕۆژگاری خەونبینین بە ڕزگاربوون لە پێکهاتە زەبەلاحەکانی ئەودیوی نەتەوەوە. لەهەردوو دۆخەکەشدا ئەم سەدەیە سەدەی بەخشینی ئەو مژدە گەورانەیە کە باس لە ئازادی و ڕزگاری ویەکسانی و سەروەری و دیموکراسیەت و مەدەنیەت دەکات.

بەبۆچوونی من مەسەلەی بنیادنانی شووناسی نەتەوەیی بەو مانایەی دەستنیشانمانکرد، گرنگترین مەسەلەیەکی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئێمە بووە، چ لە نیوەی یەکەمی سەدەکەدا و چ لە نیوەی دووهەمیدا، چ بە نیسبەت نەوەکانی سەرەتای سەدەکەوە و چ لەبەردەم نەوەکانی کۆتایی سەدەکەدا، چ لەلای هەڵگرانی حەرف و «قەڵەم و موراجەعات»، چ لەلای ئەوانەش کە ڕووداوەکانیان بە خوێن و قوربانی و فیشەک نووسیوەتەوە.

بەم مانایە پرسیاری ئەوەی ئێمە کێین؟ ئەو پرسیارە گرنگەیە کە لەسەدەی بیستەمدا لە پشتی زۆربەی هەوڵەکانی ئینسانی کورد و تەقالای هێزە چالاکەکانی ناو کۆمەڵگای کوردییەوە بووە. مێژووی سیاسی و کولتووریی و کۆمەڵایەتی ئێمە لەو سەدەیەدا سەرزەمینی هەوڵدانێکی بەردەوامە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە و بۆ پێناسکردنی ئەو شووناسە و بەرجەستەکردنی لە کۆمەڵێک ماف و داواکاری تایبەتدا. بەڵام داخۆ ئەنجامەکانی ئەم هەوڵ و کۆشش و سەرقاڵبوونەی کۆمەڵگای ئێمە بەکوێ گەیشتووە و چارەنووسی شووناسی نەتەوەیی ئێمە لە ساڵە درێژ و زەحمەتەکانی ئەو سەدەیەدا بەچی گەیشت؟

**٢- سەدەی بیستەم و گۆڕانە گەورەکان**

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستمان بە کێشانی وێنەیەکی گشتییە بۆ ئەو ڕەوگە گەورەیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە کە کۆمەڵگای کوردی لەناو ڕەهەندە

جوگرافی و خەیاڵی و سیاسییەکانیدا ئامادەبووە، مەبەستم کێشانی وێنەیەکە بۆ ئەو دنیا فانتازی و فیکری و سیاسیەی لە ناوچەکەدا ئامادەبووە و کورد تێیدا ژیاوە و تێیدا ڕووداوەکانی لێکداوەتەوە و تێیدا پلانی بۆ وەڵامدانەوەی تەحەداکانی کێشاوە. بەبێ دەستنیشانکردنی ئەم چوارچێوە گشتییە زەحمەتە بتوانین لە هێڵە سەرەکی و گرنگەکانی مێژووی ئێمە لەو سەدەیەدا تێبگەین.

ئاشکرایە بیستوپێنج ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەم ڕۆژگاری لەبەریەکدی هەڵوەشاندنەوەی ئەو چوارچێوە دینی و سیاسی و کولتووری و ئەتنیە گشتیە بوو کە هێڵە گشتییەکانی شووناسی ئێمەی وەک میلەتێک و شوناسسی زۆربەی میللەتەکانی دیکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەستنیشان دەکرد. مەبەستم لەو چوارچێوە هەڵوەشاوەیە، چوارچێوە سیاسی و کولتووری و ڕەمزییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییە. هەڵوەشاندنەوەی ئەم ئیمپراتۆریەتە چەندان مانای جیاوازی هەبوو بەڵام لە هەموویان گرنگتر بۆ ئێمە وەک میللەتێک لە بەریەکترازانی کۆڵەکەکانی ئەو شووناسە ئاینییە بوو کە کۆمەڵگای ئێمەی لەڕێگای دینەوە بە سێنتەری ئیمپراتۆریەتەکەوە گرێدەدا. لە سەرەتاکانی ئەو سەدەیەدا ئەو دنیا بەرفراوان و پڕ ناکۆکییەی ئیسلام لە فۆرمی ئیمپراتۆریەتێکی بان نەتەوەییدا پارچە جیاجیاکانی بەیەکەوە بەستبۆوە، تادەهات لاواز دەبوو و هەرجارەی لە قوژبنێک لە قوژبنەکانیەوە بەشێکی دادەڕما و هەرجارەی چەند نەتەوە و گروپێک لە ئیمپراتۆریەتەکە جیادەبوونەوە. سەرەتا بەشە مەسیحییەکانی ئیمپراتۆریەتەکە و دواتریش بەشە موسڵمانەکانی لەبەریەکدی هەڵوەشانەوە. هەر میللەتە و «ماڵی نەتەوەیی» خۆی جیاکردەوە و هەر یەکەشیان بەشێوەیەک ماڵئاویی لەو شووناسە ئیمپراتۆریە کرد کە هەمووانی لە چوارچێوەی ئیسلامدا و لە فۆرمی «برای دینیدا» بەیەکدیەوە دەبەستەوە.

ئەم پارچە پارچەبوونەی ئیمپراتۆریەت بە پلەی یەکەم کۆتایی ئەو شێوە شووناسەی ڕادەگەیاند کە ئیسلام بناغە و ژێرخان و کۆڵەکە سەرەکییەکانی بوو. لاوازبوون و کەوتنی ئیمپراتۆریەتەکە مانای لاوازبوونی توانا ڕەمزییەکانی ئیسلام بوو لە پاراستنی ئەو شووناسە کۆسمۆپۆلیەدا کە هەمووانی بەیەکەوە کۆدەکردەوە، شووناسێک جیاوازییەکانی لەناوەوەڕا ڕێکدەخست و بە هەر میللەت و گروە و ئەتنییەکی ناو ئیمپراتۆریەکە فانتازییایەکی دەبەخشی کە

یەکانگیربوو لەگەڵ فانتازیای سیاسی و کولتووریی ئیمپراتۆریەتەکە خۆیدا. کەوتنی ئیمپراتۆرەکە و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی مانای لاوازبوونی شوناسی دینی بوو لەبەردەم شووناسێکی نوێدا کە سەرەتاکانی دروستبوونی خۆی دەژیا: مەبەستم شووناسی نەتەوەییە. لە سەرەتاکانی ئەو سەدەیەدا ئیسلام چیدیکە نەیدەتوانی ئەو سەرزەمینە هاوبەشەبێت کە «برا دینیەکان» لە «پەیمانێکی دینیدا» بەیەکەوە کۆبکاتەوە. لەشوێنی ئەمدا شووناسی نەتەوەیی و پەیمانی کۆمەڵایەتی و بەشێکی زۆری دەزگا و بۆچوون و پرنسیپ و فانتازیا تایبەتەکانی مۆدێرنە دەهاتنەپێشەوە کە خوازیاری بنیادنانی مۆدێلی سیاسی نوێ بوون لە فۆرمی دەوڵەتی نەتەوەیی و بزاوتی ناسیۆنالیستیدا.

ئیسلام، کە ڕووی بە ڕووی تێزە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فانتازی و عەقڵییەکانی مۆدێرنەدا تەقییەوە، کە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک پێدراوی سیاسی و ئەخلاقی و ڕەمزی نوێ بووەوە لەودیوی گریمانە دینییەکانەوە دەستبەکاربوون، کە ئینتیمای نوێ وردە وردە شوێنی ئینتیمای دینی گرتەوە یان لەپاڵیدا دروستبوو، ئیدی نەیدەتوانی وەک بناغەی سیاسەت و بناغەی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و بناغەی بە دەزگاییکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان و بناغەی ئەو دنیا ڕەمزییە نوێیە بمێنێتەوە. یەکەمین وانەکانی عەلمانیەت و یەکەمین وانەکانی ناسیۆنالیزم ڕاستەوخۆ لەسەر لاوازکردنی توانا سیاسیەکانی ئیسلام لە بەیەکدی بەستنەوەی نەتەوە جیاجیاکان بە یەکدیەوە، دروستبوون. بیرۆکەی نەتەوە شوێن بە بیرۆکەی «برای دینی» چۆڵدەکات و خەیاڵگەی نیشتیمانی نەتەوەیی، دەچێتە شوێنی فانتازیای ئیمپراتۆریەت. وەک چۆن مۆدێرنە سەدەیەک پێشتر مەسیحیەتی ناچارکردبوو دەستبەرداری تەماحە سیاسیەکانی خۆی ببێت و کەنیسەکان لە شوێنی حوکمکردن و سیاسەتەوە ببنە ماڵی خودا و قەشە و ئیماندارە بەوەفاکان، ئاواش ئیسلام، لە ئاستی ئیمپراتۆریەتەکەدا، ناچار بەم وازهێنانە مێژووییە لە تەماحە سیاسیەکانی کرا و خەلافەت وەک سیستمێک ناچار بە ماڵئاواییەکی نائومێدانە لە مێژوو، کرا.

لە مێژووی هاوچەرخدا ئەمە یەکەمینجار بوو ئیسلام ناچاربکرێت واز لە تەماحە ئیمپراتۆرییەکانی بهێنێت و لەشوێنیدا شێوازی نوێی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و ڕێکخستنی دەوڵەت و ڕێکخستنی ئەو پەیوەندیانەی دەوڵەت و کۆمەڵگا بەیەکەوە گرێدەدات، بێتەکایەوە. ناسیۆنالیزم بووە هۆی ئەوەی ئیسلام

لە باشترین حاڵەتدا وەک نیشتیمانێکی ڕۆحی بمێنێتەوە و مانا سیاسەیەکانی نیشتیمان واز لێبێنێت بۆ خەونە سیاسییەکانی ناسیۆنالیزم. بە گۆڕانی ئیسلام لە «نیشتیمانێکی سیاسیەوە» بۆ «نیشتیمانێکی ڕۆحی» ئیدی چوارچێوە سوونەتییەکانی شووناسی دینی و ئەتنی و سیاسی گۆڕانی گەورەیان بەسەرداهات و بەم گۆڕانەش ماناکانی ئیسلام بۆ هەریەکێک لەو نەتەوانەی لەڕووی دینییەوە موسڵمان بوون، گۆڕانی گەورەتریان بەسەرداهات. لای تورک، بۆ نموونە، دەرچوون لە ئیسلام دەبێتە بنەمای سەرەکی ناسیۆنالیزمی تورکی، بۆ فارس دروستبوونی پەیوەندی لەنێوان شیعیزم و ناسیۆنالیزمدا دەبێتە بنەمای شووناسی نەتەوەیی، لەکاتێکدا لای عەرەب مانەوەی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزم دابڕانە ڕادیکاڵ بەخۆیەوە نابینێت و ئەم پەیوەندییە هەڵبەز و دابەزی زۆر لەخۆدەگرێت.

لە هەلومەرجی مردنی ئیمپراتۆریەتەکەدا ئەوەی شووناسی میللەتە جیاوازەکانی دەستنیشاندەکرد چیدی مانا ڕۆحی و کولتووریی و ڕەمزییە گەردوونییەکانی ئیسلام نەبوو، ئەو مانایانەی بازی بەسەر خەیاڵی نەتەوەییدا ئەدا و لەدیندا هەموو جیاوازییەکانی کۆدەکردەوە و سنووورداری دەکردن، بەڵکو کۆمەڵێک مانای نەتەوەیی و ئەتنیی هاتنەکایەوە کە ئەم میللەتانە هەم بە خۆیان و هەم بە ئیسلامیشیان ئەبەخشی. ئەمەش لەجەوهەردا پرۆسەیەکی مێژوویی بەرفراوانی خۆپێناسکردنەوە بوو، لەم پرۆسەیەدا خودی ئیسلام خۆشی لەسەر بنەمای فانتازیای نەتەوەیی جارێکی دی پێناسدەکرایەوە و وردە وردە مانا گەردونییەکانی لەدەستئەدا و بارگاوی دەکرا بە چەندان مانای نەتەوەیی و ئەتنی تایبەت. لەو شوێنانەدا کە نەدەکرا پەیوەندییەکی ئەتنی ڕاستەوخۆ لەنێوان ئیسلامبوون و شووناسی نەتەوەییدا پێشنیاربکرێت، وەک لای کورد، هەوڵئەدرا سود لەو نەغمەی عەدالەتخوازییە وەربگیرێت کە ئیسلام هەڵگریەتی، بەڵام بۆ بە بەخشینی شەرعیەت بە داواکارییە نەتەوەییەکان. واتە ناسیۆنالیزم بۆ بەخشینی شەرعیەت بەداواکارییە نەتەوەییەکانی هەندێک ئەرگومێنتی دینی بەکاردەهێنێت کە لەدەرەوەی ناسیۆنالیزم خۆیدا دروستبوون. لەم پرۆسەیەدا خودای گەردونییانەی ئیسلام تەرجەمە دەکرا بە خودایەکی نەتەوەیی و دەقی ناو کتێبە پیرۆزەکان بەکاردەهات بۆ بەرگریکردن لە داخوازی نەتەوەیی و ئەتنی. لێرەدا بەرگریکردن لە شووناسی نەتەوەیی بەناو ئەو تۆنە یەکسانخوازییەدا

دەڕۆیشت کە ئیسلام بۆ ئیماندارانی داوادەکات. ئەگەر موسڵمانەکان هەموو براین و دەبێت یەکدی بە شێوەیەکی مافپەروەر و یەکسان مامەڵەبکەن، ئەوا لەسەر هەمان نەغمەی دینی کوردیش هەموو برای یەکدین و دەبێت هەمان مافای یەکسانبوونیان هەبێت لەگەڵ براکانی دیکەیاندا کە کورد نین. لێرەوە کوردبوونی ناو گوتاری ناسیۆنالیستی داخوازیە دینییەکانی ئیسلام وەردەگرێت و لە ڕەوتە دینییەکەی دەریدەکات و لە ڕەوتێکی نەتەوەییدا بەرجەستەی دەکات. جگە لەم خاڵە، هەموو ئەو میللەتانەی لەناوچەکەدا دەژیان و سەرقاڵی خەباتی نەتەوەییبوون، سوودێکی گەورەیان لەو ژێرخانە دەزگایی و کولتووری و ڕەمزییە وەردەگرت کە ئیسلام هەڵگریبوو. ئەم ژێرخانە ئائینیە دەخرایە خزمەتی چەسپاندنی بنەماکانی دروتسکردنی دەوڵەت و گەشەدان بە بزوتنەوەی ناسیۆنالیزم و پێکهێنانی شووناسی نەتەوەیی. کەمال ئەتاتورک تاڕادەیەکی زۆر ووزەی بەردەوامبوونی شەڕی نەتەوەیی تورکی دژ بە یۆنان لە هەستی ئاینی کوردەکانەوە وەردەگرت، وەک چۆن بەدیوی ئەودیویشدا هەم عوبەیدوڵای نەهری و هەم شێخ سەعیدی پیرانیش، وەک سەرکردەی دینی و هەڵگری سەرمایەیەکی ڕەمزی ئاینی، سوودیکێ بێوێنەیان لە ڕۆحیەتی ئاینی و لە دەزگا و ڕێکخستنەکانی تەریقەت وەردەگرت بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتدارانی تورک. لەو ڕۆژگارەدا لە هەموو کون و قوژبنێکی ئیمپراتۆریەتە وێرانەکەدا پرۆسەیەکی گەورەی بە نەتەوەییکردن و بە خۆماڵیکردنی ئاین لەئارادابوو، وەکچۆن لەهەمانکاتدا کارخانەیەکی گەورەی گۆڕینی شووناسی ئاینی بۆ شووناسی نەتەوەیی، لە فۆرمی چاپ و نووسین و حیزب و ڕێکخراو و بنکەی کولتووریدا، لە کاردابوو.

لەم هەلومەرجە تازەیەدا هەموو ئەو بنەما کولتوورییانەی دنیای ڕۆحی ئەم ئیمپراتۆریەتە و ئەو پرنسیپە سیاسیانەی شێوازی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکەی بەڕێوەدەبرد، ڕووبەڕوی قەیرانی کوشندە بوونەوە. ڕۆڵی مۆدێلی دەوڵەتی مۆدێرنی نەتەوەیی لە قەبراندن و لەناوبردنی فۆرمی ئیمپراتۆریەتدا ڕۆڵێکی لەڕادەبەر گرنگە و ئەو پاڵە سیاسییە پێویستەی بە عەرشی خەلافەتەوە نا کە ماڵئاوایی لە مێژووی ناوچەکە و مێژووی جیهانکرد و تائێستاش هیچ هێزێک نەیتوانیوە بۆ ناو مێژووی هاوچەرخی بگەڕێنێتەوە. مۆدێلی دەوڵەتی نەتەوەیی بووە ڕەگەزی سەرەکی ناو فانتازیای سیاسی

میللەتانی ناو ئیمپراتۆریەتەکە و شێوازی ڕێکخستنی باوی پەیوەندی نێوان میللەتە جیاوازەکانی لەگەڵ سێنتەری ئیمپراتۆریەتەکەدا وێرانکرد. ئەم مۆدێلە بیرۆکەی برایەتی ئاینی لەناوبرد و لەشوێنیدا بیرۆکەی یەکبوونی نەتەوەیی و پەیمانی کۆمەڵایەتی و برایەتی سیاسی چەسپاند، شووناسی ئاینی قەیراناوی کرد و هێڵە گەورەکانی نەخشەی شووناسی نەتەوەیی دەکێشا، ئەم مۆدێلە شەهیدبوونی لە پێناوی ئایندا دەگۆڕی بە شەهیدبوون لە پێناوی نیشتیمان و جیهادی ئاینی دەگۆڕیە سەر جیهادێکی نەتەوەیی و خەبات بۆ خودای دەگۆڕی بۆ خەبات بۆ نەتەوە.

بێگومان قەیرانی شووناس لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بە تەنها قەیرانی شێوازی ئۆرگانیزەکردن و ڕێکخستنی پەیوەندییە سیاسیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکە نەبوو، بەڵکو لە قەیرانی ئەو دنیا ڕۆحیەش بوو کە چوارچێوەکانی بەرهەمهێنانی مانا و ڕەمز و فیکری دەستنیشاندەکرد. بەمانایەکی دیکە قەیرانی ئیمپراتۆریەتەکە لە هەمانکاتدا قەیرانی لێکدانەوەکانی ئاین بوو بۆ جیهان و مێژوو و دەوروبەر و شوێن و جێی ئینسان لەناوئەو گشتە گەورەیەدا کە ئاین نەخشەکانی کێشابوو. ئەمەش مانای ئەوەبوو کە ئیسلام وەک دین نەک لەبەردەم قەیرانێکی سیاسیدا بوو کە بەهۆیەوە نەیدەتوانی چیدی نەتەوە جیاوازەکان بەیەکدییەوە گرێبدات، بەڵکو لەبەردەم قەرانێکی مەعریفیشدابوو کە بەهۆیەوە نەیدەتوانی جیهان بەهەمان ئەو شێوەیە ڕاڤەبکات کە سەدان ساڵبوو ڕاڤەی دەکرد.

کۆمەڵگای کوردیی سەرەتای سەدەکە هێدی هێدی قەیرانەکانی شووناسی خۆی لەهەناوی ئەم قەیرانە بەرفراوانەی شووناسی ئیمپراتۆریەکەدا دەژیا. پرسیاری شووناسی کوردی وەک شووناسێکی نەتەوەیی لەسەرخۆ و بەهێواشی دەبووە پرسیاری هەرەسەرەکی مێژووی ئێمە. هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ کورد بە پلەی یەکەم مانای لابردنی ئەو فشارە ڕەمزی و ڕۆحییە بوو کە نەیدەهێشت شێوازێکی نوێی خەیاڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە دنیای ئێمەدا بێتەکایەوە کە بائاراستەی پێداگرتن لەسەر بوونی نەتەوەیی کاربکات. بەڵام لە چوارچێوەی قووڵبوونەوەی قەیرانەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا و لە بەردەمی پرۆسەی لاوازبوونی فانتازیای دینیدا وەک بنەمای سەرەکی شووناس، ئیدی ئەو فانتازیا نوێیە هێدی هێدی لەدایکدەبوو کە وزەی خۆی تەرخاندەکات

بۆ بەرهەمهێنانی شووناسی نەتەوەیی. ئەم فانتازیا تازەیە زمانی کوردی پڕدەکات لەو چەمک و وێنە و دەستەواژانەی کە شووناسی نەتەوەیی دروستدەکەن و لە ڕێگەیانەوە لەدایکبوونی چەمکەکانی نیشتیمان و نەتەوە لەناو گووتارێکی سیاسی و ڕۆشنبیریدا مەیسەردەبن. لەم سیاقەدا چەمکەکانی نیشتیمان، نەتەوە، شەهادەت، ئازادی، خەبات، سەربەخۆیی، دەوڵەت، ئۆتۆنۆمی هتد.. کە بەسەریەکەوە کەرەستەی سەرەکی بنیادنانی ڕەمزیی نەتەوەن، یەک لەدوای یەک لەدایکدەبن و بەشێوەیەکی ڕۆژانە بەکاردێن و بەناو خەڵکدا بڵاودەبنەوە. بەر لەم سەدەیە کۆمەڵگای کوردی بە تێرم و چەمک و دەستەواژەی دیکە باسی خۆی و باسی کێشە و ئازار و هیوا و ئامانج و داواکاریەکانی خۆی کردوە. لە مەحویەوە بۆ قانیع، لە کوردیەوە بۆ بێکەس، لە نالییەوە بۆ ئەحمەد موختار، کۆمەڵگای ئێمە شایەتی کۆمەڵێک گۆڕانی فیکری و ڕۆشنبیرییە کە ڕاستەوخۆ لە پەیوەندیەکی ئاشکرادایە بە قەیرانی شووناسی ئاینی و لەدایکبوونی شووناسی نەتەوەییەوە.

### ٣. سەدەی بیستەم و مەرجەعیەتی ڕۆشنبیری

بەم گۆڕانانە بەشێکی گرنگی مەرجەعیەتی ڕۆشنبیریی ئێمە لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا گۆڕانی بەسەردادێت. مەرجەعیەتی ئاینی سەدەی نۆزدەهەم وردە وردە لاوازدەبێت و لەشوێنیدا و لەسەرخۆ مەرجەعێکی دیکە دێتەکایەوە کە لە تێکەڵبوونێکی تایبەتی مژدەکانی مۆدێرنە و بەڵێنەکانی ڕۆشنگەریی و خەیاڵگەی ناسیۆنالیزمەوە سەردەرێنێت. مەرجەعیەتی ڕەوایەتی ئاینی و ڕەوایەتی سیاسی ئیمپراتۆریەت شوێنی خۆیان ئەدەن بە مەرجەعیەتی سیاسی نەتەوەیی، مەرجەعیەتی کولتووری ئاینی دەگوازرێتەوە بۆ ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی و نانەتەوەیی، مەعریفەی ئاینی و خورافەت شوێنی خۆیان ئەدەن بە گووتاری پیاهەڵدانێکی خۆشنوودانە بە زانستدا، ڕۆشنبیری تەقلیدی شانۆ چۆڵدەکات بۆ ڕۆشنبیری نوێ کە بەناوی نەتەوە و مافی سیاسی و ئازای کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن و یەکسانییەوە ددوێت. لەم وەرچەرخانە تازەیەدا سەرەتاکانی مۆدێرنە و سەرەتاکانی ناسیۆنالیزم بەیەکدی تێکەڵدەبن. بردنی هێڵی شەمەندەفەر بۆ چیاکانی هەوارامان لای ئەحمەد موختار و پیادەکردنی ڕیفۆرمی زەوی لای قانیع و بنیادنانی سۆسیالیزم لای گۆران دەبنە دیارترین

سێ ساتەوەختی تەعبیرکردن لەم وەرچەرخانە مەرجەعییە. لای ئەم نەوە تازانەی ڕۆشنبیریی کوردی خەمی سەرەکی بنیادنانی شووناسێکی کوردی سەربەخۆ تێکەڵدەبێت بە خەونی تازەکردنەوەی ئەم کۆمەڵگایە، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی شانبەشانی پاراستنی مافە نەتەوەییەکان دەڕۆن و بەرگریکردن لە کۆمەڵگا و بەرگریکردن لە نەتەوە بەیەک خێرایی دەچن بەڕێوە. لای ئەم نەوەیە سەربەخۆبوون و تازەبوونەوە، نەتەوە و ڕۆشنگەری، پێشکەوتن و ڕزگاربوون دەبنە تێکەڵێکی لێکدیجیانەکراوە و بەسەریەکەوەی ئەو فەزا ڕۆحی و ڕەمزی و کولتوورییە نوتێیە دروستدەکەن کە کۆمەڵگای ئێمە لە ساڵەکانی کۆتایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا و دوای کەوتنی ئیمپراتۆریەتەکە و دەیەکانی دواییدا دەکەوێتە ناوییەوە.

ئەو هێزە کۆمەڵایەتییەش کە داینەمۆ و بەرهەمهێنەری ئەم گۆڕانانەیە، ئەو نوخبە نوێیەیە، کە پرۆسەی تازەکردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم هێنابوویە کایەوە. نوخبەیەک کە لە پەنجا ساڵی بەر لە کەوتنی ئیمپراتۆریەتدا نوخبەیەکی بچووک و لاواز و کەم قسەیە بەڵام لەدوای کەوتنی ئیمپراتۆریەتەکەوە دەبێتە گرنگت ن نوخ ەی ڕۆشنبیری و یەکێک لە پڕ قسەترین نوخبە چالاکەکانی مێژووی ئێمە ۔ نوخبەیە لەناو سیستمی تازەی خوێندن و سیستمی قوتابخانە سەربرییەکان و میدیا و ڕۆژنامەگەری مۆدێرن و زانینی زمانی بێگانە و سەفەرەوە دێت، لە پاڵیشیدا ژمارەیەک لەو ڕۆشنبیرە ئاینیانەی کە بەدیدێکی دیکەوە لە ئاین ڕاماون تا دیدی سونەتی و خورافەئامێز هەوڵیانداوە لەنێوان ئای و زانستدا جۆرێک لە هاوئاهەنگی و نزیکبوونەوە درووستبکەن، یان لانی ێیان لەسەر ئەو ڕەهەندانەی ئاین داگرتوە کە بەدەم گۆڕان و گەشەکردن و بەدەستهێنانی زانین و مەعریفەوە چووە. ئەم گروهە دینییە تازەگەرەش یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی تازەبوونەوە و خەونی تازەبوونەوەن لە دوای کۆتایی ئیمپراتۆریەتەوە.

لە ڕووی سیاسییەوە ناسیۆنالیزمی کوردی بۆ بەرهەمهێنانی گوتار و ڕەمز و خەیاڵی سیاسی نوێ هەر پشتئەستووربوو بە کارەکانی ئەم نوخبە نوێیە. دروستکردنی حیزبی سیاسی و دامەزراندنی یانە و دەزگا و کۆڕ و کۆمەڵەی نوێش هەر دەرەنجامی دەستپێشخەرییەکانی ئەم نوخبەیەیە. کێشەی سەرەکی

ئەم نوخبەیە لەوەدابووە کە نەیتوانیوە پەیوەندییەکی ئۆرگانی لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و کولتووریی و زمان و ڕەمزە تەقلیدی و باوەکانی کۆمەڵگادا دروستبکات. ئەمەش وابەستەی نەبوونی سەرمایەیەکی ڕەمزی بەهێزبووە، کە بە خەون و خەیاڵ و ویستەکانی ئەم نوخبەیە هێزێکی واقیعی ببەخشێت و بتوانێت بەهۆیەوە هێزەکانی دیکە لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە و کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەبێت. لەم ڕووەوە نفوزی کۆمەڵایەتی ئەم نوخبەیە لە نفوزی کۆمەڵایەتی نوخبە تەقلیدیەکەی کۆمەڵگای کوردی لاوازتربووە کە لەڕێگای دینەوە هەوڵی پەکخستنی پرۆژەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگای داوە، لێرەوەیە ئەدەب و ڕۆشنبیری ئێمە دوای جەنگی جیهانی یەکەم پڕە لە هێرشبردنە سەر ئەو هێزە سونەتیانە کە لەنێوان دین و تازەبوونەوەدا ناکۆکییەکی گەورە دروستدەکەن. ئەمەش لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە وادەکات دابەشبوونێکی بونیادی قووڵ دروستببێت کە دواتر ببێتە هۆی لێکترازان و لێکجیابوونەوەی خەون و چاوەڕوانییە مێژووییەکان. کێشەی سەرەکی ئەم قۆناغە لەوەدایە کە خەونی بنیادنانی کیانێکی سیاسی کوردی، یەکانگیر نەبووە لەگەڵ خەونی تازەکردنەوەی کۆمەڵگای کوردیدا. پرۆژەی بە بە مەلیک بوونی شێخ مەحمود و خەونی بردنی هێڵی شەمەندەفەر بۆ هەورامان لای ئەحمەد موختار یەک پرۆژە نەبوون، لەنێوان جەمیل سائیب و شێخ مەحمودا مەسافەیەکی سایکۆلۆژی و فیکری و سیاسی و کولتووریی هەیە کە هیچ یەکێک لەو دوو لایەنەی هاوکێشەکە بۆیان پڕنەکراوەتەوە. لەمەش پڕکێشەتر ئەوەیە کە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی ئەو سەردەمە مژدەی گەورەتری پێبووە بۆ کەسێکی وەک ئەحمەد موختار، یان جەمال عیرفان یان ڕەفیق حیلمی یان ئەمین زەکی بەگ، کە بەشێکن لە نوخبەی نوێی کوردی، تا بزوتنەوەیەکی سیاسی کە سەرکردایەتییەکەی لەژێر دەسەڵاتی شێخ و مەلاکانی کوردستاندابێت. ئەم دابڕان و جیابوونەوەی قازانج و سودی کۆمەڵایەتییە وادەکات نوخبەی نوێی کوردی ببێتە نوخبەیەکی ئۆتۆنۆمیست و دروشمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ شوێنی خۆی بدات بە دروشمی ئۆتۆنۆمی. لەگەڵێشیدا سەردەمی ڕاپەڕین و خەبات و شۆڕشی چەکدارانە بگوازرێتەوە بۆ سەردەمی «قەڵەم و موراجەعات». ڕەگەکانی دروشمی ئۆتۆنۆمی لە سیاسەتی کوردیدا لەم ڕاستییە کۆمەڵایەتییەی پێکهات و شوێنوجێی نوخبەی نوێی کوردییەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر ئەم ڕاستییە سۆسیۆلۆژیەشە درزێکی گەورە لە

پێکهاتی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دروستدەکات کە تائەم ڕۆش پڕنەکراوەتەوە. ئەمەش لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی دامەزراندن و دروستکردنی شووناسی نەتەوەییەوە یەک مانای هەبووە کە بریتییە لە دابەزینی ئەم بزوتنەوەیە بۆ ئاستی بەر لە ئامادەگی ووشیاری نەتەوەیی و دابەشبوونیی بەسەر گروە و ئایدیۆلۆژیا و دیدی ناتەبا و ناکۆکدا. لەهەمانکاتدا بێتواناییەکی مێژوویش نیشانئەدات لە دروستکردنی چوارچێوەیەکی گشتیدا بۆ تێپەڕاندنی ئەو ناکۆکییە جۆراوجۆرانە.

**٤ـ نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم**

ئەگەر ئەمە ئەو دیمەنە گشتییەبێت کە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە کوردستاندا دروستیکردبێت، ئەوا ئەم دیمەنە لە نیوەی دووهەمی هەمان سەدەدا گۆڕانی گەورە و ڕیشەیی بەسەردادێت. ئەگەر نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە سالآنی لەدایکبوونی خەونی تازە و پرۆژەی تازە و خەیاڵی تازەبێت، سالآنی هاتنەکایەی ووشیارییەکی ڕۆشنگەرانە و جیابوونەوەی شوناسی دینی و شووناسی نەتەوەییبێت لەیەکدی، سەردەمی هاتنەکایەی نوخبەیەکی نوێی بێت کە پێشکەوتنی کوردستان و ئۆتۆنۆمبوونی لە جیابوونەوە و دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ بەلاوە گرنگتربێت، ئەوا ئەم وێنەیە لە نیوەی دووهەمی سەدەکەدا لەزۆر ڕووەوە دەگۆڕێت.

لە سەرەتای شەستەکانەوە هەلومەرجێکی نوێ دێتەکایەوە کە دەسکاری زۆر شت دەکات، لەم هەلومەرجەدا دوو گۆڕانی زۆر گرنگ ڕوودەدان: یەکەمیان لەدایکبوونی دەوڵەتی پۆست کۆلۆنیاڵ کە دەوڵەتێکی حیزبی دەسەلآتگەری نادیموکرات و سەربازییە. دووهەمیان لەدایکبوونی بەرفراوانی شۆڕش و خەباتی چەکدارە. لەڕاستیدا پەیوەندی نێونا ئەم دوو دیاردەیە هێجگار ئاڵۆز گەرچی ناکرێت لەدایکبوونی یەکێکیان لەویدیکەیان جیابکەینەوە. ئەوەی لێرەدا شایانی گرنگیپێدانە ئەو ڕاستییەیە کە سەرەکیترین گۆڕانێک ئەم هەلومەرجە نوێیە خستبێتییەوە بریتییە لە شوێن چۆڵکردنی لەسەرخۆی خەمی تازەکردنەوەی کۆمەڵگای کوردی بۆ خەمی پاراستن و بەهێزکردن و بەردەوامیبەخشین بە بەرگری و شۆڕش و خەباتی چەکدار. بیرۆکەی بوژاندنەوە و ڕۆشنگەری و تازەبوونەوە جێی خۆی دەبەخشێت بە بیرۆکەی شۆڕش.

بێگومان ڕەگەكانی ئەم گۆڕانە لەناو زەمینەی ئەو واقیعە پۆست كۆلۆنیالییەدایە كەدێتە كایەوە. لەم قۆناغەدا كۆمەڵگای كوردی دەكەوێتە بەر هێرشی ڕاستەوخۆی ئەو دەوڵەتە پۆست كۆلۆنیاڵە تازە ڕزگاربووەی لە عێراقدا دروستدەبێت و وەڵامی سیاسی هێزە كوردییەكانیش بەم پەلامارە ڕووبەڕووبوونەوەی چەكدارانەیە. چەند پەلامارەكانی دەوڵەتی عێراقی بەردەوام و فرەلایەنتر بووبێت، ئەوەندەش پێویستی خەباتی چەكدار لە زەینی نوخبە سیاسییەكانی كوردستانی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا وەك چارەنووسێكی گشتگیری لێدێت و ڕاستەوخۆ چارەنووسی كۆمەڵگاشی پێوە گرێدەدرێت. لەو ساتەشدا كە خەباتی چەكدار دەبێتە گرنترین دیاردەی سیاسی مێژووی ئێمە و بەشی زۆری توانا و هێز و وزە مێژووییەكانی كۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دەبات، ئیدی لەگەڵیدا ئەم كۆمەڵگایە شاقوڵیانە دابەشدەبێت بۆ ئەوانەی دەبنە سووتەمەنی ئەم خەباتە و بۆ ئەوانەش دژایەتییەكی سەرسەخت و بەردەوامی گیانی و ماڵی ئەم خەباتە ئەكەن. ئەم وەرچەرخانە لە نیوەی دوهەمی سەدەكەدا سەرلەبەری ستراتیژیەتی ڕۆشنبیریی و بناغەكانی بنیادنانی شووناسی نەتەوەیی ئێمە دەگۆڕێت، بە ڕادەیەكی زۆر خەونی ڕۆشنگەرانە شوێنی خۆی ئەدات بە مەسەلەی كۆكردنەوەی ووزەی پێویست بۆ بەرگری، گووتاری ڕەخنەی كۆمەلایەتی بەنیازی پێشخستنی كۆمەڵگا شوێنی خۆی ئەداتە بە گووتاری حەماسەت بۆ شۆڕش، ڕەخنە لە دەسەڵات تەنانەت لەو فۆرمەدا كە جەمیل سائیب لە شێخ مەحمودی دەگرێت دەچێتە شوێنی بێدەنگبوون لە ناشیرینییەكانی شۆڕش.

بەبۆچوونی من سەدەی بیستەم لە مێژووی ئێمەدا سەدەیەكی دابەشبوو بووە بۆ دوو نیوەی جیاواز و لێكپچڕاو و تا ڕادەیەكی زۆر بەیەك ناكۆك: نیوەی یەكەمی، نیوەی بینینی خەونێكی ڕۆشنگەرانەی تازەگەرە بەو مانایەی لەسەرەوە باسمانكرد. لەكاتێكدا نیوەی دووهەمیان دەبێتە ڕۆژگاری بەرپابوونی خەباتی چەكدار و لاوازبوونی فرلایەنی خەونی ڕۆشنگەرانە.

بێگومان من مەبەستم لەكەداركردنی خەباتی چوكدار و شۆڕش و شەهیدەكانی نییە، هەروەها ناتوانین بەهیچ جۆرێك نكوڵی لە ڕۆڵی ئەم خەباتە لە پەرەپێدانی هەندێك ڕەهەندی گرنگی شووناسی نەتەوەییماندا بكەین، بەڵام لە ئاستی ستراتیژیدا، واتە لە ئاستی تەماشاكردنی هەودا دوورەكانی ئەم

دیاردەیەدا، دەتوانین بڵێین کە خەباتی چەکدار زیانی تایبەتی بە شووناسی نەتەوەیی ئێمە گەیاندوە و لەهەندێک دۆخدا ڕێگربووە لەبەردەم دروستبوون و پتەوبوونیدا. بەبۆچوونی من قۆناغی خەباتی چەکدار لە زۆر ڕووەوە قۆناغی گەڕانەوەیە بۆ سەدەی نۆزدەهەم، قۆناغی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی پێکدادانی چەکدارانەی نێوان هێزە کوردییەکانی ئەو سەدەیەیە. مێژووی شۆڕشی چەکداری حیزبە بەرهەڵستکەرەکانی کوردستان لە شەستەکان بەدوا لە مێژووی پەیوەندی نێوان ئیمارەتە کوردییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەچێت. ئەوەی لەم مێژووەدا ونە ئامادەگی ئەو چوارچێوە نەتەوەییە بەرفراوانەیە کە بتوانێت جیاوازییەکانی ئەم بزوتنەیە لەناوخۆیدا کۆبکاتەوە. خەباتی چەکدار هەر زوو دەبێتە هۆی دابەشبوونی هێزە چەکدارەکان لەناو خۆیاندا و هەرزووش هەلومەرجێک دروستدەکات کە تیایدا چەندان هێز لەدایکبن کە بدەنە پاڵ دەوڵەتە مەرکەزییەکان دژ بە شۆڕش و ڕەهەندە چەکدارییەکەی ناسیۆنالیزمی کوردی.

وەک ووتمان، لە شەستەکان بەدوا سەدەی بیستەم لە مێژووی ئێمەدا دابەشدەبێت بۆ دوو نیوە، نیوەی یەکەمی، نیوەی هەوڵدانی خۆدەربازکردن و دابڕانە لە سەدەی نوزدەهەم و ئەو کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەعریفییانەی ئەو سەدەیە دروستیدەکات. لەکاتێکدا نیوەی دووهەمیان، واتە لە شەستەکان بەدواوە، دەبێتە ڕۆژگاری گەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ سەدەی نۆزدەهەم کە کاراکتەری سەرەکی لە پەیوەندیدا بە شووناسی نەتەوەییەوە بریتییە لە دابەشبوونی کۆمەڵگای کوردی لە پەیوەندی و هەڵوێستیدا لە بەرامبەر شۆڕش و خەباتی چەکداردا، هەروەها دابەشبوون و پێکدادانی هێزە کوردییەکان لەگەڵ یەکدا. ئەگەر نیوەی یەکەمی سەدەکە ڕۆژگاری ڕزگاربوونبێت لە فانتازیای دینی و لە چوارچێوەی سیاسی ئیمپراتۆریەت، چوارچێوەیەک کە لە بوونی نەتەوەیی گەورەترە و بەم گەورەبوونەشی ڕێدەگرێت لە هاتنەکایەی ووشیاری و شووناسێکی نەتەوەییدا. ئەوا نیوەی دووهەمیان نیوەی دابەشبوون و هاتنەکایەی شووناسی ناوچەیی و حیزبی و ئایدیۆلۆژییە کە شووناسێک بەرهەمدەهێنێت بچوکتر لە شووناسی نەتەوەیی و ڕێگر لەبەردەم دروستبوونی ئەم شووناسەدا. تراژیدیای مێژووی ئێمە لە سەدەی بیستەمدا لەم دابەشبوونەی سەدەکەدایە بۆ دوو نیوەی دژ بەیەک، لەو گەڕاندنەوە ناوەختەی

سەدەی نۆزدەهەمدایە بۆ ناو نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم، لەو بەسەدەی نۆزدەهەمکردنەی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدایە. لە هەمووشی کوشندەتر ئەو ڕاستییە تاڵەیە کە کۆمەڵگای ئێمە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا نەک ئامادەنەکراوە و ئامادەنییە بۆ چوونە ناو سەدەی بیستویەکەمەوە، بەڵکو بەزۆر مانا هێشتا لە هەناوی سەدەی نۆزدەهەمدا دەژی کە غائیبی ژمارە یەک تیایدا نەتەوە و شووناسی نەتەوەییە.

## ٥- سەدەی بیستەم لەنێوان دروستبوون و دروستنەبوونی نەتەوەدا!

بەو مانایانەی سەرەوە ئێمە لەسەدەی بیستەمدا نەتەوەمان نەک بە مانا سیاسییەکەی بۆ دروستنەکراوە، بەڵکو زۆربەی بناغەکانی دروستبوونی نەتەوە و شوناسی نەتەوەییشمان لاوازکردوە. لە کۆتاییەکان سەدەی بیستەمدا کۆمەڵگای کوردی لە هەموو کاتێک پارچە پارچە ترە، نەک لە غیابی هەموو ئەفسانەیەکی نەتەوەیی گشتیدا دەژی، بەڵکو لە غیابی هەر چوارچێوەیەکی سیاسی یەکگرتووشدا دەژی کە تێیدا هێزە جیاجیاکان مەودای تەعبیرکردنیان لە خۆیان وەک بەشی جیاوازی یەک نەتەوە هەبێت. لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا سیاسەتی بەر لە دروستبوونی نەتەوە و سیاسەتی یەکسانکردنی نیشتیمان بە ماڵی خێڵ و ماڵی حیزب و ماڵی سەرکردە لە هەرکاتێکی دیکەی مێژووی ئێمە بەهێزتر و هەمەلایەنترە. لێرەوە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لە مێژووی ئێمەدا لەزۆر ڕووەوە ڕێکاوڕێک سەرلەنوێ ژیانەوەی کێشە خێڵەکییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و لۆژیکی ململانێکانی سەدەی نۆزدەهەم بەرهەمدەهێنێتەوە، کە ئەمانەش بەهەموو مانایەک کێشە و ململانێکانی بەر لە دروستبوونی نەتەوەن.

بە گێڕانەوەی سەدەی بیستەم بۆناو هەناوی سەدەی نۆزدەهەم کۆمەڵگای ئێمە ناچارە لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمدا لە هەوڵی ئەوەدابێت مێژووی ئێمە لەدەستی لۆژیکی سەدەی نۆزدەهەم بسێنێتەوە. لەباتی ئەوەی بگوازینەوە بۆ سەدەیەکی نوێ یان بچینە ناو سەدەی بیستویەکەمەوە، دەبێت جارێکی دیکەش لەهەوڵی ئەوەدابین لە سەدەی نۆزدەهەم دەربازببین و بگەڕێینەوە بۆ گەلێک لە پێدراوە سیاسی و کولتووری و ڕەمزییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. ئەگەر سەدەی نۆزدەهەم سەدەیەک بێت کە تیایدا لۆژیکی بالادەست لۆژیکی شووناسە ناوچەیی و خێڵەکییەکانی بەر لە دروستبوونی نەتەوەن بن و

لەڕاستیشدا ڕێ لە دروستبوونی نەتەوە بگرن، ئەوا بەر لەوەی بچینە ناو سەدەی بیست و یەکەمەوە کە بەزۆر مانا سەدەی جیهانی دوای نەتەوەییە، دەبێت جارێکی دی مانا ڕاستەقینەکانی بوونمان لەسەدەی بسیتەمدا بژینەوە.

هۆڵەندا
مایسی ٢٠٠٠

## قەیرانی کراوە و قەیرانی داخراو

## چەند سەرنجێک دەربارەی پەیوەندی نەوەکان لە کوردستاندا

### ١- نەوەکان و وێنەکانیان

هیچ نەوەیەک نییە قۆناغی ژیانی خۆی بە قەیراناویترین قۆناغی مێژوو نەزانێت. کام نەوە ئەوەی قبووڵە پێیبگوترێت تۆ لە ڕۆژگارێکی جوانتر و هێمنتر و بێکێشەتر لە ڕۆژگاری نەوەکانی بەر لەخۆتدا دەژیت و گرفتەکانت لە گرفتەکانی ئەوان کەمتر و سادەتر و هێورترن. هەر نەوەیەک لە نەوەکان وێنەیەکی دیاریکراوی خۆی و وێنەیەکی تایبەتی نەوەکانی بەر لەخۆی و وێنەیەکی جیاوازی مێژووی ئەو کۆمەڵگایەی لەلایە کە لە ناویدا دەژی. تاڕادەیەکی زۆر ئەم وێنەیە تەعبیر لە ویست و ئارەزوو و داواکارییەکانی ئەو نەوەیە دەکات لە پەیوەندیدا بەهەموو ئەو شتانەوە کە دەکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی خۆیەوە، لە هەمانکاتیشدا تەعبیر لە ووشیاری ئەو نەوەیە دەکات بەرامبەر بەو دنیایەی تێیدا دەژی و بەرامبەر بەو ئەگەر و مژدە و بەربەستانەی ئەو دنیایەدا ئامادەن. بەشێکی گەورەی ئەم وێنەیە زادەی ئەو ئەرک و فەرمانانەشە کە ئەو نەوەیە دەیخاتە سەرشانی خۆی و لەڕێگای پیادەکردن یان نەکردنیانەوە شووناسێکی تایبەت بەخۆی دەبەخشێت، هەروەها ئەم وێنەیە زادەی ئەو چاوەڕوانییانەشە کە کۆمەڵگا و دەوروبەر و نەوەکانی دی بەرامبەر بەو هەیانە، جا لەڕێگای بەدیهێنانی ئەو چاوەڕوانییانەوە بێت یاخود لەڕێگای پێ لادان و پوچەڵکردنەوەیانەوە.

بەم مانایە هەر نەوەیەک لە نەوەکان لەناو کۆمەڵێک هاوکێشەی کولتووریی و ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیدا دەژی کە بەشێکیان لەگەڵ ویست و چاوەڕوانی و خەونەکانی ئەودا دەگونجێن و زەمینەیەک بۆ پراکتیکردنیان دەخولقێنن، ئەمەش وادەکات جۆرێک لە بەردەوامیی دروستببێت لەگەڵ ئەو نەوە و مێژووەدا کە بەر لە ئامادەگی ئەو لەئارادابوون و ئەو هەلومەرجە مێژوویی و

ئەخلاقی و ڕەمزییەیان خولقاندوە کە ئەو دەکەوێتە ناوییانەوە، هەم لەهەمانکاتدا دەشێت بەشێک لە ویست و ئارەزوو و چاوەڕوانییەکانی ئەو نەوەیە تەواو ناکۆکبێت بەو پێدراوە مێژووییانەی کە ئامادەن و ئەم لەناویاندا پەیوەندییەکی ململانێئامێز بەرامبەریان دروستدەکات. لەم دۆخەدا جۆرێک لە دابڕن لەنێوان نەوەی پێشوو و نەوەی نوێدا، لەنێوان مێژوویەکدا کە پێشتر ئامادەیە لەگەڵ ئیرادەیەکدا کە دەیەوێت ئەو مێژووە بگۆڕێت، دروستدەبێت. ئەگەر بەردەوامی جۆرێک لە هارمۆنیەت و هێمنی و ئاسایشی کۆمەلایەتی دروستبکات، ئەوا دابڕان بەبێ کێشە و بێ ناکۆکی و هەندێکجار بێ پێکدادانی ڕەمزی و واقیعی دروستنابێت. ئەو یاسایەی کە نەوەیەک بە نەوەکانی بەر لە خۆی و دوای خۆیەوە گرێدەدات یاسای بەردەوامی و دابڕان و پێکەوەبوون و جیابوونەوەیە لە یەک کاتدا.

لەم بەردەوام و دبڕانەدا هەر نەوەیەک سەرلەنوێ پێناسی تایبەت بەو چەمک و مانا و پرنسیپە کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگییانە دەبەخشێت کە لە هەناویاندا گەورەدەبێت و بەهۆیانەوە دنیا دەناسێت و دیاردەکان ڕاڤەدەکات و دواجاریش لەهەناویاندا دەمرێت. لەڕێگای پێناسەکردنەوەی شتەکانەوە ئەم نەوەیە شوناسێک بەخۆی دەبەخشێت و بە خۆی و بە دەرەوەی خۆی دەڵێت ئەمە منم و ئەمەش هەڵوێستی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووری و مەعریفیم و ئەمەش ماناکان و تێگەیشتنەکان و هەڵوێستەکانی من بۆ دنیا و دیاردەکانی دەوروبەرم. هەر نەوەیەک نەتوانێت ئەم کارە مەیسەربکات نەوەیەکی بێشوناس دەبێت و ئەم بێشوناسیەشی دەیکاتە بوونەوەرێک شتەکان لەدەرەوەڕا ئەو ببەن، بێ پلان و بێ چاوەڕوانی و بێ ئاراستە لەناو ئەو ساتەوەختە مێژووییەدا ئامادەبێت کە گەمارۆیداوە. لۆژیکی ململانێی نەوەکان پێماندەڵێت کە لەزۆر ڕووەوە ئەو پێناسانەی نەوە تازەکان سەرلەنوێ بۆ شتەکانی دەکەن جیاوازن لە پێناسەی نەوەکانی بەر لە خۆیان و جیاشدەبن لە پێناسەی نەوەکانی دوای خۆیان. ئەم جیاوازیەش بەتەنها بەرهەمی جیاوازی هەلومەرجی مادیی ژیانی نەوەکان نییە، بەتەنها ئامادەبوون لە ساتەوەختی مێژویی جیاوازدا لە ساتەوەختەکانی دی نایخولقێنێت، بەڵکو لە چەند ڕوویەکەوە بەرهەمی ئەو ڕۆحی «نارسیسمە کۆیی»ەشە کە هەر نەوەیەک لە نەوەکان هەڵگریەتی و لەپاڵیدا ماناکان و ئەزموونەکان و بۆچوونەکانی بەرهەمدەهێنێت. هیچ نەوەیەک نییە لە

قوڵایی خۆیدا هەڵگری جۆرێک لە نارسیسم نەبێت، نارسیسمێک فو بە ڕۆحی خۆجیاکردنەوەیدا بکات و وەک بوونەوەرێکی جیاواز لەبەرامبەر نەوەکانی دیکەدا ڕایوەستێنێت.

بەشێکی گەورەی کێشەی نێوان نەوەکان لەو ڕاستییە سادانەی سەرەوەڕا دروستدەبێت، بەڵام ئەو ڕاستییە سادانە بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی هەر نەوەیەکە لە نەوەکان، لەڕاستیدا بەشێکی ئۆرگانی ژیان خۆیەتی وەک سەفەرێک کە زیاد لە نەوەیەک ناچارن لەگەڵ یەکدا و پێکەوە ئەنجامیبدەن. بۆیە لەڕاستی دوورناکەوینەوە گەر ووتمان هیچ نەوەیەک نییە بێ کێشەبێت، هیچ نەوەیەک نییە لە دنیایەکی بەهەشتئامێزدا بژی و لە ڕووباری شیردا مەلەبکات و نانی بەیانیانی لە دوورگەیەکی هەنگویندا بخوات، لانیکەم ئەمە ئەو وێنەیە نییە کە نەوەکان لەسەر خۆیان هەیانە. هەر نەوەیەک ڕووی بە چەندان ململانێی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی تایبەتدا دەتەقێتەوە و بەجۆرێک لە جۆرەکان لە پەیوەندیەکی گرفتئامێزدایە لەگەڵ خۆی و دنیا و دەوروبەریدا. نەوەی بێگرفت بوونی نییە و تائێستاش ژیان لەم ئەستێرەیەدا ژیانە لەناو کۆمەڵێک کێشە و گومان و مەترسی گەورە گەورەدا. لە ناهەق نییە سۆسیۆلۆژی ئەڵمانی بەناوبانگ ( ئولریش بێک ) کۆمەڵگا هاوچەرخەکان بە «کۆمەڵگای مەترسی» ناودەبات و پێیوایە ئەوەی چینەکان لەم قۆناغەی تازەیەی مێژووی مرۆڤایەتیدا لە یەکدی جیادەکاتەوە جیاوازی لە دابەشکردنی داهاتدا نییە، بەڵکو جیاوازییە لە دابەشکردنی مەترسیدا. هەژار ئەو کەسەیە کە زۆرترین و خراپترین شێوەکانی مەترسی بەردەکەوێت، بەڵام دەوڵەمەند ئەو کەسەیە کە کەمترین مەترسی و جۆرە سادەکانی مەترسی بەردەکەوێت. لە دیدی ئولریش بێکدا چەمکی مەترسی ئەمڕۆکە شوێنی چەمکی ئابووری گرتۆتەوە.

کە دەڵێم ژیان لەسەر ئەم ئەستێرەیە ژیانە لەنێو کۆمەڵێک مەترسی گەورەدا مەبەستم نییە داکۆکی لەوەبکەم کە جیاوازی گەورە لەنێوان ئەو هەلومەرجە کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیانەدا نییە کە نەوە جیاجیاکان خۆیانیان تێدا بینیوەتەوە، یاخود بمەوێت بڵێم نەوەکان هەموویان ڕووبەڕووی یەک مەترسی دەبنەوە، یان بە هەمانئەندازە بەختەوەر یان بێبەختن. نا ئەوەی من دەمەوێت بیسەلمێنم بوونی کۆمەڵێک کێشەی گەورەیە کە هەر نەوەیەک ڕووبەڕووی دەبێتەوە و ناچارە وەڵامی تایبەتیان پێبداتەوە. یان ئەو وەڵامانە دەسکاریبکات

کە نەوەکانی بەر لەخۆی بەهەمان ئەو کێشانەیان داوەتەوە کە ئەو ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. بێگومان شێواز و ناوەڕۆکی کێشەکان جیاوازن، هەندێک کێشە هەن سنووری نەوەکان تێدەپەڕێنن و لەکاتێکدا هەندێکی دیکەیان تایبەتن بە نەوەیەک لە نەوەکان. هەندێک کێشە هەن نەک تەنها سنووری نەوەکان تێدەپەڕێنن بەڵکو سنووری نەتەوە و گروهە ئەتنی و دینییەکانیش دەبەزێنن و لەیەک کاتدا ڕووبەڕووی هەمووان دەبنەوە، وەک کێشەکانی ژینگە و تیرۆریزم و کۆچ، هتد...کە کێشەی بان ـ نەتەوەیی و بان ـ نەوەیین. بەڵام کێشەی دیکە هەن، وەک کێشەی ڕەوشتی سیاسی و کێشەی هەڵوێست لە دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و کێشەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەخلاقیاتی باڵادەست، کە کێشەگەلێکن لە بەردەم هەر نەوەیەکدا بەشێوەی جیاواز ئامادەدەبن.

**٢- ئەورووپا و نەوەکانی**

با نموونە لەسەر جیاوازی کێشەکان لە مێژووی ئەورووپاوە بهێنینەوە و بۆ ئاشکراکردنی مەبەستەکانمان لە ئامادەگی دوو نەوەی تایبەتی مێژووی هاوچەرخی ئەورووپی ڕامێنین. مەبەستم لەو دوو نەوەیەش نەوەی پەنجاکان و نەوەی شەستەکانی سەدەی بیستەمی ئەو کۆمەڵگایانەیە.

هەر کەسێک کەمەکێک شارەزای مێژووی ئەورووپا بێت ئەو ڕاستییە ئەزانێت کە جیاوزییەکی گەورە لەنێوان ئەو دوو نەوەیەدا هەیە. نەوەی یەکەمیان نەوەی ڕۆژگارە تاریک و نووتەکەکانی جەنگ و پێکدادانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی ناو ئەورووپا خۆیەتی، ئەم پێکدادانانەش جەستە و ڕۆح و یاداوەریی ئەم نەوەیەی لێوانلێکوردوە لە حیکایەتە ترسناکەکانی جەنگ، لە مەترسی مەرگ و برسیەتی و تۆتالیتاریزم. لە کاتێکدا نەوەی دووهەمیان مناڵی دەوڵەتی خۆشنوودگەرا و نەوەی ئامادەگی و بەرقەراری ئاشتییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسییە کە جەنگ بۆ ئەوان زیاتر ڕووداوی ناو حیکایەتی باپیران و داپیرانە، نەک واقیعێکی حەیاتی تێیدا ژیابن و ئازاریان بەدەستەوە کێشابێت.

نەوەی یەکەمیان لە باشترین حاڵەتدا لەناو سیستمێکی دیموکراسی باوکسالارادا ژیاوە کە بازی بەسەر ئازادی و ئیرادە و ئارەزووی تاکەکەسدا داوە، بەڵام نەوەی دووهەمیان ویستوویەتی هەموو بەهاکان بە خۆی بداتەوە و

ئازادی بکاتە پرۆژەیەکی تاکەکەسی و تاڕادەیەکی زۆریش ئیستاتیکی. نەوەی یەکەمیان نووقمی ناو کولتوورێکی سیاسی بوو کە هیرارکیەتی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و مەعریفیی وەک پیرۆزێک مامەڵە کردوە، لە کاتێکدا نەوەی دووهەمیان لەناو زانکۆ و قاوەخانە و شەقامە گشتییەکانەوە دەیانقریشکان: لێگەڕێ خەیاڵ حوکمبکات، دەسەڵات بۆ گووڵ، خۆشەویستی لەشوێنی جەنگ، لەباتی شەڕکردن جنسکردن. هیرارکیەت ڕۆحی یەکەمیان داگیردەکات بەڵام دووهەمیان دژ بە فۆرمە جیاوازەکانی دەسەڵات دەجەنگێت، تا ڕادەی گەیشتن بە ئەنارشیزم.

نەوەی یەکەمیان داوای بە دەزگاییکردنی سیاسەت و بەدەزگاییکردنی دەسەڵاتی دەکرد و لەم ڕووەوە باوەڕی خۆیان بەشێوەیەکی گشتگیر بە سەرکردە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی خۆیان بەخشیبوو تاڕادەیەکی زۆریش بێپرسیاربوون بەرامبەر بە ئایدیاکان و مژدەکان و شەرعیەتەکانی ئەو ڕابەرە باوەڕپێکراوانەی وێنەی گشتی سەردەمەکەیانی دەکێشا، کەچی نەوەی دووهەمیان دەیگووت هەموو شتێکی شەخسی سیاسیە و سیاسەتکردن بەتەنها کاری سەرکردە و سیاسییەکان نییە، لە کاتێکدا یەکەمیان سیاسەتی لەناو حیزب و دەستی سەرکردە سیاسی و ئاینییەکاندا دەبینی، دووهەمیان باوەڕی وایە سیاسەتکردن شتێکە لەسەرجادە و ناو ماڵ و شوێنە گشتی و تایبەتەکاندا ئەنجامئەدرێت. ئەم نەوەیە گوومانێکی گەورەی لەهەموو ئەو ئایدیا و بەڵێن و دەزگایانە هەبوو کە ڕابەرە جیاجیاکان بەڕێوەیاندەبردن و هەڵگریانبوون.

نەوەی یەکەمیان پێیەکی لەناو کولتوورێکی سیاسیدا بوو کە بەرهەمهێنەری تۆتالیتاریەت و پیرۆزڕاگرتنی سەرکردەی کاریزمی و پایەدارکردنی پاتریارکیەت بوو، لەکاتێکدا نەوەی دووهەمیان نەک تەنها لە پەلامارێکی بەردەوامدا بوو بۆسەر ئەو کولتوورە، بەڵکو خودی ئەو دەزگا و سیمبۆلە سیاسییانەشی خستبووە ژێر پرسیارەوە کە ئەو کولتوورە لە ناویاندا هەناسەی ئەدا. یەکەمیان شووناسێکی داخراو و دەستەجەمعی هەبوو، ددووهەمیان دەیوست شووناس بکاتە مەسەلەیەکی تاکەکەسی، یەکەمیان کەم تا زۆر لەناو دیندا نووقم بوو، دووهەمیان ڕەخنەیەکی توندی هەموو فۆرمەکانی ئیمان دەکات، یەکەمیان بەها سوونەتییەکانی جنس و پێکەوەبوونی سوونەتیانەی نێرومێ بەکاردەهێنێت و دەپارێزێت، دووهەمیان دەسکارییەکی ڕادیکاڵی ئەم بەهایانە دەکات. ئیقاعی

سەرەکی ژیانی نەوەی یەکەمیان ئیقاعی لەسەرخۆی بەردەوامبوونە، لەکاتێکدا ئیقاعی ژیانی نەوەی دووهەمیان ئیقاعی دابڕان و هەڵوەشاندنەوەی بەهاکانە.

بەم مانایە لەنێوان نەوەی جەنگ و نەوەی شەستەکان و هەفتاکانی مێژووی ئەوروپیدا دابڕان هەیە نەک بەردەوامی، ئەم دابڕانەش بەر لەوەی ببێت بە واقیع و بگواسترێتەوە بۆناو پراکتیکی ڕۆژانە و شێوازیی ژیان و دەزگا و بەرخوردی سیاسی، واتە بەر لەوەی ببێت بە هەقیقەتێکی مێژوویی، سەرەتا لە فۆرمی قەیرانێکی کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی گەورەدا دەرکەوتوە کە بنەماکانی مەرجەعیەت و شەرعیەتی کولتوور و کۆمەڵگا و دەسەڵاتی خستۆتە ژێر پرسیارەوە. شەستەکانی ئەوروپا قۆناغی قەیرانێکی کولتووری گەورەبوو کە هێمای بۆ وەرچەرخانێکی تەواوەتی دەکرد لە نێوان دیدی جیاوازی دوو نەوەدا.

**٣ـ قەیران و ماناکانی**

بەڵام داخۆ مەبەست لە قەیران چییە؟ جۆرەکانی کامانەن و مانا پۆزەتیف و نێگەتیڤەکانی قەیرانی کولتووری چین و پەیوەندی نەوەکان بە قەیرانە کولتوورییەکانەوە چۆنە؟

قەیران شوناسی ئەو ساتەوەختەیە کە تێیدا شتەکان و مەسەلەکان لەبەردەم وەرچەرخانێکی گرنگدان، ساتەوەختی هاتنەکایەی ئەگەری گۆڕانێکی هەمەلایەنە، زەمەنی تەسفیەی حیساباتی کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیە لە نێوان زیاد لە مەرجع و زیاد لە نەوە و زیاد لە هێزێکدا. قەیران ساتەوەختی نائارامییەکی سیاسی و کولتووری و ڕۆحییە کە پرسیاری جیاواز و وەڵامی جیاواز لە ململانێ و بەریەکەوتنێکی ئاشکرا و نهێنیدان بەبێئەوەی هیچ یەکێک لەم پرسیار و وەڵامانە باڵادەستی تەواوی بەدەستهێنابێت. قۆناغی قەیران قۆناغی دروستبوونی جیهانبینی نوێیە کە مەسافەیەکی فیکری و مەعریفی و ئیستاتیکی گەورە لە نێوان خۆی جیهانبینیەکانی پێشخۆیدا بەرجەستەکردوە. قەیران ساتەوەختی تەقینەوەی ناکۆکیەکانی نێوان دوو مەرجەعە، ئەو ساتەیە کە پرنسیپە گەورە و گشتییەکان، کە بەها خۆ بەپیرۆززان و هەمەلایەنەکان تووشی پرسیاری قووڵ و گومانلێکردنی هەمەلایەن دەبن و هێزێک یان چەند هێزێکیش لەئارادان کە ئامادەن ئەو پرسیارانە لە واقیعدا بەرجەستەکەن و وەڵامی

تایبەتیشیان پێبدەنەوە. بە کورتی ساتەوەختی قەیران بریتییە لە ساتەوەختی تێکچوونی هارمۆنیەتی ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان بەردەوامی و دابڕاندا دوو ساتەوەختی مێژویی جیاوازدا دروستدەبێت و هێزی جیاوازیش هەن کە بەرگری لە لایەنێک لە لایەنکانی ئەم بەردەوام و دابڕانە دەکەن.

بێگومان بوون و ئامادەگی قەیران مانای بوون و ئامادەگی گۆڕان نییە، هەموو ئەو شتانەی لە ساتەوەختی قەیراندا ئامادەن لە فۆرمی ئەگەردا ئامادەن، بوونێکی هێزەکییان هەیە، بۆئەوەی ببن بە واقیع و گۆڕان بخەنەوە یان بۆئەوەی لە ساتەوەختی قەیرانەوە بۆ ساتەوەختی پیادەکردنی ئەگەرەکانی ناو ئەو قەیرانانە لە واقیعدا بگوازنەوە، هەمیشە هێزێک یان چەند هێزکی کۆمەڵایەتی و فەزایەکی سیاسی و کولوورتی و ئەخلاقیی پێویستە کە ئامادەگی دروستبوون گۆڕانی تێدابێت، کە نەتوانێت بەر بە گۆڕان بگرێت، توانای ئەوەی نەبێت بەهەر نرخێک بووە پایەکانی ئەو جیهانە تەقلیدی و باڵادەستە بپارێزێت کە قەیرانەکانی بەرهەمهێناوە. بە مانایەکی دی بوونی قەیران یەکسان نییە بە بوونی گۆڕان، گواستنەوە لە قەیرانەوە بۆ گۆڕان بەناو کۆمەڵێک پێداویستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریدا تێدەپەڕێت کە وابەستەی ئیرادە و ئامادەگی تاک و گروپ و کۆمەڵگایە بۆ گۆڕان، وابەستەی ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵگایە ژیان و بەختەوەری ئینسانەکان لە پاراستن و هێشتنەوەی مەرجەعەکان بە گرنگتربزانێت، کاتێک ناچاردەبێت لەنێوان دەسکاریکردنی مەرجەعەکان و بەختەوەری ئینسانەکاندا هەڵبژێرێت، ئامادەبێت بەختەوەری هەڵبژێرێت نەک لەڕێگای بەدبەختکردنی ئینسان و سەرکوتکردنی کۆمەڵگاوە مەرجەعەکان بپارێزێت.

لێرەوە کە باس لە قەیرانی کولتووری دەکەین مەبەستمان باسکردنی ئەو ساتەوەختە مێژووییە تایبەتەیە کە کوولتورێک تیایدا لەبەردەم ئەگەری وەرچەرخانێکی گەورەدا وەستاوە، لەبەردەم ئەگەری گۆڕانێکی ڕادیکاڵدا کەتێیدا نەک بەتەنها بەرهەمە کولتوورییەکان، بەڵکو مەرجەعە کولتوورییەکان لە ململانێیدان لەگەڵ یەکدا. ئەوەی لە ساتەوەختی قەیراندا لەبەردەم هەڕەشەدایە بەتەنها پێناسەکان و ماناکان و دیدە باڵادەستەکان نین، بەڵکو ئەو سەرزەمینە مەعریفی و فیکری و ئەخلاقییشە کە پێناسەکان و دیاردە کولتووریەکان و دیدەکان بەرهەمدەهێنێت. قەیرانی کولتووریی بەم مانایە لەو شێوازی قەیرانانە

نزیکدەبێتەوە کە تێیدا گشتێتی بەها کولتوورییەکان لەبەردەم ئەگەری گۆڕاندان، شتێک لەو بابەتەی میشێل فۆکۆ ناوی «گۆڕانی ئەبستیمەکان» ی لێدەنێت. ئەگەرچی ئەم شێوازە لە گۆڕان لای فۆکۆ زۆر ڕیشەیتر و ڕادیکاڵترە تا گۆڕانی مەرجەعەکان. گۆڕانی ئەبستیم بەتەنها گۆڕانی مەرجەعەکان نییە، بەڵکو گۆڕانی ئەو ژێرخانە مەعریفی و فیرکییەشە کە کۆی مەرجەعە جیاوازەکانی لەسەر دروستدەبێت. ئەمەش مانای گۆڕان لەو زەمینە قووڵەدا کە جیهانبینییەکان بەرهەمدەهێنێت و شێوازەکانی بەرهەمهێنانی کولتوور و فیکر و مەعریفە دەستنیشاندەکات. ئەگەر بکرێت ڕستەیەکی گرنگ، بەڵام بە دەسکارییەکی زۆرەوە لە مارکس وەربگرین دەکرێت بڵێین: قەیران مامانی مێژووە. وەکچۆن مامان یارمەتی لەدایکبوونی ژیانێکی نوێ ئەدات و بوونەوەرێکی زیندوو بۆ ناو جیهان ڕێنماییدەکات، ئاوا قەیرانیش شتێکی نوێ بۆ ناو واقیع و کولتوور و خەیاڵ داوەت دەکات. ساتەوەختی قەیرانی کولتووری ساتەوەختێکی زیندووە چونکە زەمەنی ململانێ و پێکدادانی مەرجەعەکان و لێکجیابوونەوەی شتە کۆنەکانە لە نوێکان، ئەمەش ڕێک وەک وەک لێکجیابوونەوەی مناڵە لە ڕەحمی دایکی. بەڵام قوەک چۆن مامان ڕێنمایکەری هاتنە ژوورەی مناڵە بۆ ناو جیهان، ئاواش قەیرانی کولتووریی و مەرجەعی پێویستی بە کۆمەڵێک هێز و کۆمەڵگایەک هەیە ئامادەبێت شەرعیەت بەم لەدایکبوونە بدات، یان لانیکەم ئامادەگی وەرگرتنی ئەو مناڵەی هەبێت و لەژێر هیچ ناوێکدا لەناوینەبات. لەم ساتەوەختەدا شەرعیەت و توانای مەرجەعێک، کە تا ساتی بەر لە قەیران باڵادەستبووە، دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە و ڕێ بۆ هاتنەکایەی مەرجەعێکی دی خۆشدەکات. تەواو وەکچۆن لەدایکبوونی مناڵێک ژیانێکی نوێ و سەرەتایەکی نوێ و مێژوویەکی نوێ دەخاتەوە.

لە ساتەوەختی قەیراندا ئەو ڕەهەندە لاواز و چەپێنەرانەی مەرجەعە باڵادەستەکان ئاشکرادەبن کە دەرەقەتی تەحەدا تازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئەخلاقی نایەن، هەروەها ئەو ڕاستییەش ئاشکرادەبێت کە چۆن ئەم ڕەهەندانە ڕێگرن لەبەردەم گەشەکردنی فۆرمە تازەکانی ئازادی ئینسان و ئازادی کۆمەڵگا و ئازادای عەقڵ و ئازادی خەیاڵدا. ساتەوەختی قەیران ساتەوەختی ڕووتبوونەوەی ڕاستییەکان و دەرکەوتنی ڕەهەندە سوڵتەوییەکانی ئەو هەقیقەتانەیە کە تا ئەو ساتە توانیویەتی لەژێر چەتری دەیان نۆرم و بەها و

بۆچوون و لێکدانەوەدا بیانشارێتەوە. هیچ شتێک هێندەی ساتەوەختی قەیران نیشاندەری ڕەهەندە دەسەڵاتگەرەکانی هەقیقەت نییە.

بەڵام قەیرانیش فرەجۆرە. قەیران هەڵگری فۆرمی جیاواز و ئەگەری جیاوازە. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم ڕەهەندە تایبەتەی قەیران من لێرەدا دوو شێوازی جیاوازی قەیران لەیەکدی جیادەکەمەوە، یەکەمیان ناودەنێم «قەیرانی کراوە» و دووهەمیشیان «قەیرانی داخراو».

قەیرانی کراوە ئەو قەیرانەیە کە تیایدا دەرەنجامی ململانێ و کێبەرکێ و بەیەکدادانی مەرجەعەکان دەرەنجامێکی پۆزەتیڤە و گۆڕانکاری دەخاتەوە. گۆڕانەکانیش تازەبوونەوەیەکی کولتووری و ئەخلاقی و سیاسی لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن و سەرزەمینێکی نوێ بۆ لەدایکبوونی هەقیقەت و دەسەڵات و مەعریفەی نوێ مەیسەردەکەن. مەبەستم لە چەمکی پۆزەتیڤیش ئەوەیە کە ململانێ و کێشمەکێشە سیاسی و ئەخلاقی و کولتوورییەکان بە کەناڵی ئاسایی چارەسەرکردندا تێدەپەڕن و لە پانتاییەکی کراوە و ئازاددا بەرەنجامی ململانێکان ئاشکرادەبن و دوادەرەنجامیشیان بەرپابوونی گۆڕانە لەو واقیعەدا کە تووشی قەیران هاتووە. قەیرانی کراوە قەیرانێکە کە بەرەنجامەکەی پێشوەخت نەزانراوە و لایەنە جیاوازەکانی ئەو قەیرانە و گەمەکەرەکانی لەبەردەم فەزایەکی کراوەدان و ئەگەری گۆڕانی ئەو دەستگا و دامەزراو و سیستمانەی ڕووبەڕوویان دەبنەوە ئەگەرێکی کراوەیە و لەزۆر ڕووەوە وابەستەی ئیرادە و ویست و هێزی لایەنەکانی ناو ئەو قەیرانە و بڕی کراوەیی ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەیە کە ململانێکانی لەناودا ئامادەیە. لە قەیرانی کراوەدا هەم ئیرادەی هێزەکان و هەم ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەی کە لەئاراداان ئامادەن بۆ بەرپابوونی گۆڕان. بە مانایەکی دی ئەگەری بەرپابوونی گۆڕان ئەگەرێکی زیندوە و فەزای بەردەمی ململانێکان کراوەیە و ئەو هاوکێشەیەی کە هەقیقەت و دەسەڵات بەیەکەوە گرێدەدات هاوکێشەیەکی داخراو نییە. لێرەدا دەسەڵات لە فۆرمی «پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا» ئامادەیە، نەک لە فۆرمی هەیمەنەی هەمەلایەنی هێز و لایەن و هەقیقەتێک بەسەر هێز و لایەن و هەقیقەتەکانی دیکەدا. دەسەڵات لە ڕێگای ئامادەبوونییەوە وەک پەیوەندی بە لایەنە جیاوازەکانی دەسەڵات توانا و پانتایی بەرگری دەبەخشێت کە بکرێت لە ساتێک لە ساتەکانی قەیراندا پەیوەندییەکان بەشێوەیەکی نوێ

ڕیزبکاتەوە، هەقیقەتەکان دەسکاریبکات و ڕێککەوتنە کۆمەڵایەتییەکان سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە.

بەڵام «قەیرانی داخراو» ئەو شێوەیەیە لە قەیران کە تێیدا کۆمەڵگا نەک تازەنابێتەوە، مەرجەعەکان نەک ناتوانن جێگۆڕکێ بکەن و سیستمە ئەخلاقی و سیاسی و دەستگا و دامەزراوە باڵادەستەکان نەک ناتوانن بگۆڕێن، بەڵکو تادێت سنوورەکانی بەها و دەزگا و مەرجەعە باڵادەستەکان ئەستوورتر و داخراوتر و قایمتر دەبێت و ڕووکارێکی چەپێنەرانەش وەردەگرن. لە قەیرانی داخراودا دەسەڵات دەبێتە توانای هەیمەنەیەکی هەمەلایەن کە ئیرادەی هێزەکانی بەرامبەری تێکدەشکێنێت و هەقیقەتەکانیان وەک خورافە و ناعەقڵانیەت نیشانئەدات. قەیرانی داخراو قەیرانی داخرانی دەسەڵات و داخرانی هەقیقەتەکانە. ئەوەی دەسەڵات خوازیاریەتی سیستمی باڵادەستی هەقیەت ڕەوایەتی پێدەبەخشێت و ئەوەشی سیستمی هەقیقەتی باڵادەست بانگێشەی بۆدەکات دەسەڵات دەیپارێزێت. لە قەیرانی داخراودا مەرجەعی باڵادەست لەسەر کوشتن و بێدەنگکردنی مەرجەعەکانی دی دەژی، دەریاندەکاتە دەرەوەی سنوورەکانی هەقیقەت و وەک ناعەقڵانیەت و دێوانەیی دەیانناسێنێت. لەڕاستیدا دواهەمین دەرەنجامی ئەم جۆرە قەیرانانە بەهێزبوونی پایەکانی مەرجەعی تەقلیدییە لەڕێگای سەپاندنی هەیمەنەی ئەو مەرجەعەوە بەهەر شێواز و تاکتیک و ستراتیژێک بێت، ئەگەرچی دەشێت ئەو مەرجەعە بۆ ساتێک تووشی هەژان و ڕاوەشاندنێکی ناوەکی گەورە هاتبێت. ئەمجۆرە قەیرانە ئەگەری هاتنەکایەی مەرجەعی نوێ لاوازتر دەکات، لەباتی گۆڕان و لێکجیابوونەوە، بەردەوامییەکی بەزۆر و سەپێندراو دەخاتەوە. قەیرانی داخراو قەیرانی ڕێگرتنە لە لەدایکبوونی جیهان و مەرجەع و هەقیقەتی نوێ، قەیرانی ڕێگرتنە لەبەرپابوونی کۆمەڵێک گۆڕان کە هێمابن بۆ گۆڕانی ئەخلاق و دەزگا و جیهانبینی، واتە هێمابن بۆ گۆڕانی ئەو سیستمە ڕەمزییەی لەو ساتەدا باڵادەستە. قەیرانی داخراو قەیرانی واقیع و کولتوور و سیستمێکی دەزگایی و ئەخلاقییە کە هێزی نەگۆڕان تیایدا لە هێزی گۆڕان بەهێزترە، ئیرادە و توانای بێدەنگکردن لە ئیرادە و توانای بەدەنگهاتن بەهێزترە، گەرچی تاقە دەروازەیەکیش بۆ دەرچوون لە کێشەکانی ئەو واقیعە گۆڕانبێت. لە قەیرانی داخراودا نەگۆڕان و مانەوەی شتەکان وەک خۆیان لۆژیکی ئەو هێزنانەن کە

نایانەوێت و ناهێڵن گۆڕانکاری بەرپابێت، یان سنووری گۆڕانکارییەکان بەشێوەیەک بەرتەسک دەکەنەوە کە چارەسەری ڕاستەقینەی کێشەکانی ئەو واقیعەی تێدانەبێت کە بەدۆخی قەیران گەیشتووە. لۆژیکی قەیرانی داخراو زۆرجار لۆژیکی باڵادەستی باوکانە دژ بە لۆژیکی منداڵەکانیان، یان لۆژیکی ئەو هێز و گروپ و چینە کۆمەڵایەتییە باڵادەستانەن کە نایانەوێت و ناهێڵن کۆمەڵێک گۆڕانی ڕاستەقینە لە پەیوەندییەکانی دەسەڵات و پەیوەندییەکانی مانا و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانبدا دروستببن.

لە قەیرانی کراوەدا نەوە نوێکان سیستمی بەها و نۆرم و ئەخلاق و چێژ و ئیستاتیکای کۆمەڵگا تازەدەکەنەوە و ڕەهەندەکانی بوونی خۆیان و بوونی کۆمەڵگا بە دەنگ و ڕەنگ وچێژ و هەقیقەت و شێوەژیانی نوێ دەوڵەمەند دەکەن. بەڵام لە قەیرانی داخراودا ژیان تادێت بەرتەسکتر و ئەخلاق تادێت چەپێنەرتر و سیاسەتیش تادێت ترسێنەرتر و هەقیقەتیش تۆتالیتێرتر دەبێت. جیاوازی نێوان قەیرانی کراوە و قەیرانی داخراو جیاوازی نێوان دوو مێژووە، یەکێکیان پڕ لە ئەگەر و پرۆژەی گۆڕان و تازەکردنەوە و ئامادە بۆ گۆڕان، ئەویدیکەیان مێژوویەکە خۆی لە ناوەوەڕا وێران و هێز و توانا و وزە چالاکەکانی ناو هەناوی لاوازدەکات و بەمەش بەر بە گۆڕانی ڕاستەقینەی شتەکان دەگرێت.

بەبۆچوونی من بەیەکدادانی مەرجەعەکان تاڕادەیەکی زۆر بەرەنجامی بەیەکدادانی نەوەکانە، بێگومان پێکدادانی چینەکان و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەش دەکرێت لە فۆرمی پێکدادانی مەرجەعی جیاجیادا بەرجەستەبێت، بەڵام باسکردنی ئەم لایەنەیان دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینەی ئێمەوە، سەرەڕای ئەوە بوونی ئەم شێوازە تایبەتەی پێکدادانی مەرجەعی، پێکدادانی مەرجعی جیاوازی چینەکان، لە کوردستاندا زۆر لاوازە.

کاتێک نەوەکان بەریەکدەکەون هەر یەکێکیان دەیەوێت بەرگری لەو مەرجەعە سیاسی و ئەخلاقی و ڕۆشنبیرییە بکات کە لەپاڵیدا ماناکانی بوونی خۆی و بوونی کۆمەڵگا و بوونی دنیا و بوونی کولتوور و بوونی مێژوو لێکدەداتەوە. هەریەکێکیان دەیەوێت سیاسەتێکی تایبەتی بەرهەمهێنانی هەقیقەت و بەرهەمهێنانی مانا و بەرهەمهێنانی سیمبوڵ و بەرهەمهێنانی شووناس پیادەبکات کە تەعبیر لەشوێن و جێی کۆمەڵایەتی و ڕەمزی و تێگەیشتنی ئەو بۆ

دنیا وکۆمەڵگا و دیاردەکانی ناویان دەکات. بەبۆچوونی من گۆڕانی قەیران بۆ قەیرانی کراوە وابەستەی ئەوەیە تاچەند ئەو کۆمەڵگایە لەناوخۆیدا کراوەیە و تاچەند نەوە جیاجیاکان پانتایی و مەودای قسەکردن و تەعبیرکردن و خۆڕێکخستنی ئازادیان هەیە، تاچەند ئەو نەوانە دەتوانن بڵێن، ئەمە دنیا و شێوە ژیان و چێژ و زەوق و ئیستاتیکای ئێمە و ئەمەش پرۆژەی ئێمە بۆ پیادەکردن و دابەزاندنیان بۆ ناو مێژوو. کۆمەڵگای کراوە ئەو کۆمەڵگایەیە کە پانتایی ئارام بۆ پیادەکردن و جێکردنەوەی ئەو پرۆژە و شێوەژیان و وێنە و هەقیقەتانە فەراهەم دەکات کە لەئێستادا بالادەست نین. ئەو کۆمەڵگایەی نەتوانێت لە هەناوی خۆیدا پانتایی تایبەت بەهەر نەوەیەک لە نەوەکانی ببەخشێت و نەتوانێت بە هەر گروهێک لە گروهەکانی سەرزەمینێکی تایبەت بۆ تەعبیر و بۆ نیشتەجێکردنی شێوەژیان و شێوە ئەخلاقی تایبەت ببەخشێت، کۆمەڵگایەکە لە قەیرانێکی گەورەدا دەژی. لە مانەش گرنگتر پاراستنی ئەو ڕاستییەیە کە خەیاڵە سیاسی و ڕۆشنبریی و کولتوورییەکانی ئەمڕۆ دەتوانن ببنە واقیعی بەرجەستەی سبەینێ، هێزە لاواز و پەراوێزەکانی ئەمڕۆ دەکرێت ببنە هێزە گەورەکانی دوای ئەمڕۆ، گومانەکانی ئەمڕۆ ببنە هەقیقەتەکانی سبەینێ.

بێگومان ئەم جۆرە قەیرانانە دەبنە قەیرانی داخراو گەر نەتوانن ئەو مەرجانەی سەرەوە فەراهەم بکەن. قەیرانی داخراو هەمیشە بەداخرانی زیاتر و بە چەپاندنی زیاتر و بە بێدەنگکردنی زیاتر کۆتاییدێت. قەیرانی داخراو نەک پانتایی ئازاد ناکاتەوە بەڵکو ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بە زمانی حەرام و حەلاڵی ئاینی و غەیرە ئاینی ئەدوێت. لەزۆر کاتیشدا هەندێک پانتایی تایبەت و بچووکی ئازادی، کە بەر لە قووڵبوونەوەی قەیرانەکان و بەر داخرانیان لەئارادابوون، دەکەونە ژێر فشارەوە و هەندێکجار لەناویشدەچن. نموونەی ئەم جۆرە داخران و لەناوچوونانە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بریتییە لە لەناوچوونی هەندێک ئازادی بچووک و ڕۆژانە کە لە سالانی هەفتا و هەشتادا ئامادەبوون، بەلام لەدوای هاتنەکایەی ئیسلامی سیاسییەوە و دوای بە ئیسلامبوونی بەشێکی گرنگی فەزای کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووری ئێمە، بزردەبن. سادەترین فۆرمی ئەم ئازادییە بچووکانە ئازادی ئافرەتە لە پۆشین یان نەپۆشینی پەچەدا. لە داخراندا نەوەیەک لە نەوەکان زۆربەی ئەوانیدیکە بێدەنگ

دەکات، نەوەیەک زۆربەی سەرزەمینەکانی بەرهەمهێنانی مانا، پراکتیکی کۆمەڵایەتی، ئەخلاق و بەهاکان بۆ خۆی پاواندەکات و لێناگەڕێت دیدی دیکە و شێوە مامەڵەی دیکە و شێوەژیانی دیکە بێتەکایەوە. لەسەرزەمینی قەیرانی داخراودا فەزایەکی گشتی دروستدەبێت کە دەبێتە فەزای سەرکوتکردنی ئەو ووزە و توانا و مانایانەی لەگەڵ ووزە و توانا و مانای دەسەڵاتداردا ناگونجێت.

ئەوەی لە شەستەکاندا لە ئەوروپا ڕوویدا نموونەیەکی بەرچاوی مێژوویەکە سکپڕ بە قەیرانی کراوە. لەو قەیرانەدا دوو نەوە و دوو مەرجەع بەریەکدەکەوتن کە بە دوو زمان و دوو خەیاڵ و دوو سیستمی جیاوازی هەقیقەت قسەیان دەکرد، یەکێکیان نوێنەر و قسەکەری ئەو عەقڵانیەتە بوو کە مارکۆزە بە ماشێنی بەرهەمهێنانی «ئینسانی تاکڕەهەندی» ناودەنێت، ئەویدیکەیان نووێنەری عەقڵانیەتێک بوو کە باسی لە «شۆڕشێکی ئیستاتیکی» دەکرد و بە زمانی عەقڵانیەتێکی کراوە و ڕەخنەیی دەدوا و دەیویست ئینسان و مۆراڵ و کۆمەڵگا لە تۆڕی دەزگاکان ئازادکات. بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگا ئەوروپیەکانی ساڵانی شەست، وەک کارل پۆپەر دەڵێت، «کۆمەڵگای کراوەبوون» دەبینین قەیرانی مەرجەعەکان بووە هۆی ئەوەی نەوەی شەستەکان گۆڕانی گەورە لە ڕەهەندە جیاجیاکانی ژیانی ئینسان و کۆمەڵگا و فیکر و داهێنان و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی و فەردیدا بهێنێتە کایەوە. بێگومان ئەم گۆڕانانە ئەوە ناگەیەنێت کە نەوەی شەستەکان، وەک هەر نەوەیەکی دیکە، کۆمەڵێک وەهم و پەرگیری و توندڕەوی تایبەتیان بەرهەمنەهێنا، بەپێچەوانەوە مێژووی هەشتاکان و نەوەدەکانی ئەوروپا، بە مانایەک لە ماناکان، مێژووی پیاچوونەوە و هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی ڕەخنەییانەی پرۆژە و خەون و فەوزا و مژدە و بەڵێنەکانی نەوەی شەستەکانە. ئەوەی بۆ مەبەستی ئەم نووسینە گرنگە، ئەو ڕاستییەیە کە کۆمەڵگا ئەوروپییەکان بەڕادەیەک کراوەبوون کە سەرزەمینی ئازادیان بۆ هەر نەوەیەک لە نەوەکان هەبوو کە تێیدا بتوانن ئیرادە و عەقڵانیەت و فانتازیاکانیان پیادەبکەن.

## ٤- بەریەککەوتنی مەرجەعەکان یان بەریەککەوتنی وێنەکان

بەڵام لە ووڵاتی ئێمە و زۆربەی دراوسێکانیشماندا فەزای بەردەمی قەیرانەکان کراوە نین و ئەوانەشی بەریەکدەکەون مەرجەعەکان نین ئەوەندەی

دید و وێنە و بۆچوونە جیاوازەکانی ناو یەک مەرجەعن. تا ئەم ساتە لەمێژووی هاوچەرخی ئێمەدا نەوەیەک نەهاتووە شەڕی مەرجەع لەگەڵ نەوەکانی بەر لەخۆی و لەگەڵ کۆمەڵگا وەک گشتێک، بکات. گەر بە زمانی زانستی سیاسی بدوێین دەکرێت بڵێین شەڕی نەوەکانی ئێمە تاڕادەیەکی زۆر شەڕە لەسەر تەکتیکە بچووکەکان نەک لەسەر ستراتیژە گەورەکان. شەڕە لەسەر سانتیمەترێک ئازادی لێرە و سانتیمەترێک کرانەوە لەوێ، نەک شەڕبێت لەسەر سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی ماناکانی ئازادی و ماناکانی کرانەوە. کە باس لە مەرجەع دەکەم مەبەستم کۆی ئەو پرنسیپ و بۆچوون و پێناس و دەزگایانەیە کە هەیمەنەیەکی فیکری و ئەخلاقی و سیاسی بە نەوەیەک لە نەوەکان دەبەخشن و نەوەکانی دیکەش دەبنە پابەست و پاشکۆی ئەو هەیمەنەیە. مەرجەع لێرەدا خاڵی تێکەڵبوونی دەسەڵات و پێناس و مانا و ڕەمز و ئەخلاقە پێکەوە. هەیمەنەش لێرەدا تا ئاستی داخران و بێدەنگکردنی مەرجەعەکانی دیکە هەیمەنەیەک نییە هێزەکان لە دوای ڕێککەوتنێکی کولتووریی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزی لەسەری ڕێککەوتبن، هەیمەنە نییە بە مانا گرامشییەکەی کە ڕەگەزی قبووڵکردن و خۆبەخۆیی زۆر گرنگە تیایدا، بەڵکو هەیمەنەیەکی یەکلایەنە و مۆنۆپۆڵخوازە کە دەرەنجامی قۆرغکردنێکی بەرفراوانی ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕەمزییە. واتە ئەو جۆرەیە لە هەیمەنە کە فۆکۆ لەزۆر نووسیندا وەک دژە دیوی «پەیوەندییەکانی دەسەڵات» باسیدەکات، واتە هەیمەنەیەک کە پەیوەندییەکانی دەسەڵات تیایدا داخراون و تیایدا هێزێک لەهێزەکان توانیویەتی ئیرادەی خۆی بەتەواوی بەسەر کۆی ئیرادەکانی دیەکدا بسەپێنێت.

مەرجەع بریتیە لەو ژێرخانە مەعریفی و سیاسی و ئەخلاقییەی دەستنیشانی ئەوە دەکات لە ساتێک لە ساتە مێژووییەکاندا چ مۆراڵێک و چ دەزگایەک و چ شێوەیەک لە شێوەکانی زمان و چ فۆرمێکی دەسەڵات و چ ئیشکالیەتێکی فیکری و سیاسی باڵادەستبێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بۆچوونە با سەرنج لەم دوو نموونەیە بدەین، یەکەمیان لەکایەی ئەدەبەوە وەریدەگرین و دووهەمیان لە کایەی سۆسیۆلۆژیاوە، یەکەمیان دەربارەی چۆنیەتی وێناکردنی واقیعە لە ئەدەبی ئێمەدا، دووهەمیان دەربارەی پەیوەندیی نێوان نێر و مێیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا.

هەمووومان دەزانین ئەدەب لە دنیای ئێمەدا بەردەوام لە پەیوەندیدا بە واقیعەوە قسەی لەسەر کراوە. هەندێکجار بە «ئاوێنەی واقیع» و هەندێکجار بە شوێنی

«ڕەنگدانەوەی واقیع» و هەندێجاری دیکەش لە پەیوەندییەکی هاوشێوەدا بە واقیعەوە، باسکراوە و ڕاقەکردنەکانیش هەر لە میانەی ئەم پیوەندیانەوە ئەنجامدراون. تا ئەوشوێنەی من ئاگاداربم ڕاقەکردن و تێگەیشتنی نەوە جیاجیاکانی ئێمە بۆ ئەدەب تا ئەم ساتەش لە «قسەکردنەوە لەسەر واقیع» نەگواستراوەتەوە بۆ «قسەکردن لەسەر ئینسان». واتە تێگەیشتنی نەوە جیاجیاکان بۆ ئەدەب هەر لە فەزای گرێدانەوەی ئەدەب بە واقیع و بوونی واقیع بە بابەتی سەرەکی ئەدەب بینراوە. تائێستاش «ئینسان» لە ئەدەبی ئێمەدا ئەو شوێنە گرنگەی لە واقیع نەسەندۆتەوە و بۆ ئەم ئەدەبە مەرجەعێکی نوێی دروستنەکردوە.

ئەگەر وردتر سەرنجی نمایشکردنی واقیعیش لە ئەدەبی ئێمەدا بدەین و لەو مانایانە ڕابمێنین کە نووسەرانی ئێمە بۆ واقیع هەیانە، دەبینین بەڕادیەکی زۆر باس لە ڕەهەندە سیاسییەکانی واقیع دەکرێت تا هەر ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی دیکەی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەمیشە لەپشتی تێگەیشتنی ئێمەوە بۆ واقیع سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی ئامادەیە هەموو ئەو مانایانەی لە چەمکی واقیع داماڵیوە کە دەکەونە دەرەوەی مانا سیاسییەکانەوە.

بە مانایەکی دیکە تێگەیشتنی باڵادەست بۆ ئەدەب سەرەتا لە قسەکردنەوە لەسەر ئینسان و ئاڵۆزییە ڕۆحی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانییەوە گواستراوەتەوە بۆ قسەکردن لەسەر واقیع و قسەکردنیش لەسەر واقیع کورتکراوەتەوە بۆ نیشاندان و باسکردنی ڕەهەندە سیاسییەکانی ئەو واقیعە. لەهەمانکاتدا واقیع لە ئەدبی ئێمەدا نەبۆتە کێشەیەکی فەلسەفی و سایکۆلۆژی و کولتووری و سۆسیۆلۆژی، نەبۆتە بەرهەمهێنەری کۆمەڵێک پرسیار لەودیوی پرسیارە سادەکانی سیاسەتەوە. لەڕاستیدا مانا سیاسییەکانی واقیعیش دابەشبوون بەسەر کۆمەڵێک دیدی ئایدیۆلۆژی جیاوازدا کە پێشوەخت و بەر لە پشکنینی وردی واقیع خۆی دەستنیشانیانکردوە ئەو واقیعە چییە و چۆنە و ئەگەرەکانی ناوی کامانەن. لێرەوە ئەدەبی ئێمە نەک لە ئینسانی ئێمە نەدواوە بەڵکو لەو پەیوەندییەشدا کە بە واقیعەوە دروستیکردوە بەردەوام لەناو تۆڕێک لە گریمانە و پێدراو و وێناکردنی ئایدیۆلۆژیدا ئامادەبووە کە نەیانهێشتوە ڕەهەندە جیاوازەکانی واقیع ببینرێت و لەپەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدابێت لەگەڵیدا و ئەو شتانەی تێدابدۆزێتەوە کە بەڕاستی تیایدا ئامادەن، نەک ئەو شتانەی کە

ئادیۆلۆژیاکان پێشوەخت بوونیان لەو واقیعەدا گریمان دەکەن. لێرەوە ئەدەبی ئێمە «بازارۆف» ێکی تێدا نییە هێما بۆ واقیعێکی دیاریکراو بکات، یان ڕاسیکۆلینکۆڤێک هێما بۆ کێشەیەکی ئەخلاقی بکات یان عەقید ئۆرلیانۆیەک توانای نیشاندانی خورافەکانی شۆڕشی هەبێت، یان ... مەبەستم لەم قسانە ئەوەیە کە ئەدەبی ئێمە کۆمەڵێک پاڵەوانی دروستنەکردوە کە ئەوان هێمابن بۆ ڕەهەندە ئەخلاقی و کولتووری و سایکۆلۆژییەکانی واقیع نەک واقیع هێمابێت بۆ ئەوان، لەڕێی ئەوانەوە بچینەوە سەر ڕووە جیاجیاکانی واقیع نەک لە ڕێی ناسینی واقیعەوە لەوان تێبگەین. لەڕاستیدا ئەدەبی ئێمە تا لەدایکبوونی پاڵەوانەکانی بەختیار عەلی، واتە تا لەدایکبوونی کەسانی وەک خەندانی بچکۆلە و سەریاسی سوبحدەم و یاقوبی سنەوبەر، بەدەست ئەم کێشە گەورەیەوە دەناڵێنێت. یەکێک لە دەسکەوتە گرنگەکانی ئەدەبی بەختیار عەلی تێکشکانی ئەو هاوکێشە تەقلیدییەیە کە ئەدەبی ئێمەی بە واقیعەوە گرێداوە. پاڵەوانەکانی بەختیار ئەم هاوکێشەیە تێکدەشکێنن و لەباتی ئەوەی واقیع ببێتە مەرجەعی ناسینی ئەوان، ئەوان دەبن بە مەرجەعی ناسینی واقیع: واتە ئەوانن دەتوانن ناونیشان و پێناسی ئەو واقیعەمان پێبڵێن کە بەرهەمی هێناون، نەک واقیع بێت و نهێنییەکانی ئەوانمان پێبڵێت. جیهانی ناوەکی و دەرەکی پاڵەوانەکانی بەختیار عەلی ئاستی جیاجیای واقیعمان نیشانئەدان، لە ئاستە ئەفسووناوی و سیحرییەکەیەوە بۆ ئاستە مێژووییەکەی، واتە ئەم پاڵەوانانە واقیع دەکەنە چەندان واقیع، دەریدەکەن لەوەی پێکهاتێکی سادە و ساکار و بێئاڵۆزیبێت. ئەمان واقیع دەگۆڕنە سەر دۆخێک کە بەپێی دیدگا و خیبرە و خەیاڵ و چاوەڕوانی پاڵەوانەکان مانا و دەلالەتەکانی دەگۆڕێت، ئەم پرۆسەی گۆڕانی واقیعە لە «یەک واقیعییەوە» بۆ «چەند واقیعی» ئەو هەنگاوە گرنگەیە کە ڕۆمانەکانی بەختیار عەلی دەینێن بۆ دەرچوون لە زەبری ئەو پارادایمە ئەدەبییەی ساڵەهای ساڵە لە کایەی ئەدەبیی ئێمەدا باڵادەستە. گرنگی ئەم گواستنەوەیە لەوەدایە کە هەمیشە شتێک لە قووڵایی ئەو پاڵەوانانەدا دەمێنێتەوە کە هی خۆیانە، نەک هی واقیعەکەیان بێت، شتێک ناچێتە ژێر کاریگەریی پێدراوە واقیعییەکانەوە و یاسکانی ئەو واقیعە دروستیاننەکردوە، شتێک ئینسانی و قووڵ و فەردی کە تەنها لە چوارچێوەی ئەو جیهانەدا قابیلی تێگەیشتن و ڕاڤەکردنە کە ڕۆمانەکان دروستیدەکەن، نەک لە چوارچێوەی ڕۆشنایی و تاریکییەکانی واقیعی دەرەوەی ڕۆمانەکاندا. ئەم دۆخە تازەیەش

لەسەرێکەوە بەرهەمی گۆڕانە لە پارادیمی ئەدەبیدا، واتە بەرهەمی گۆڕانە لە قسەکردنەوە لەسەر واقیع بۆ قسەکردن لەسەر ئینسان، لەسەرێکی دیکەوە بەرهەمی ئەو ڕاستییەن کە ئەو پاڵەوانانە ئینسانی ناو تێکستە ئەدەبییەکانن، نەک ئینسانی واقیع بەتەنها. ئەمەشیان دیسانەوە دەرەنجامی ئەو جێگۆڕکێیە لە مەرجەعی ئەدەبیدا کە باسمانکرد.

بێگومان ئەم حوکمە ڕەها نییە و ئەدەبی چەند نووسەرێکی ترمان هەیە کە پاڵەوانی زیندوویان دروستکردوە و دەکرێت ئەو پاڵەوانانە هێمابن بۆ سەردەم و ڕۆژگارێکی تایبەت لە مێژووی ئێمەدا، بەڵام ئەم بوونە لاوەکییە و لەڕاستیشدا لەوە ناگۆڕێت کە لەگەڵ لەدایکبوونی پاڵەوانەکانی بەختیاردا ئێمە لەڕێگای ناسینی ئینسانەکانەوە دەچینەوە سەرناسینی واقیع، نەک بەپێچەوانەوە.

لە ئەدەبی ئێمەدا ئەم باڵادەستییە هەمەلایەنەی چەمکی واقیع کۆمەڵێک دەرنجامی خراپی لێکەوتۆتەوە کە باسکردنیان دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینەوە، بەڵام دەکرێت، زۆر بە کورتی، هێما بە یەکێک لە گرنگترینی ئەو دەرنجامانە بدەین کە بریتییە لە لەبیرکردن و پشگوێخستنی بەها سەربەخۆکانی ئەدەب وەک کایەیەک لە کایە گرنگەکانی داهێنان و وەک هێزێک کە بکرێت لەدەرەوەڕا و بەسەربەخۆیی لەسەر واقیع دەەستبەکاربێت نەک هەمیشە وابەستە و ژێردەستەی واقیعبێت و لە ناو جەبرە ناوەکییەکانی ئەوەوە بێتەدەرەوە. لە کایەی ئەدەبیی ئێمەدا چەمکی واقیع بەجۆرێک ئاوساوە کە بەشێوەیەکی هەمەلایەن گەمارۆی خەیاڵ و گەمارۆی زمان و گەمارۆی نووسەریشی داوە، دەرچوون لەم گەمارۆدانە فرەلایەنەش وەک دەرچوون لە بەرپرسیاریەت و وەک خیانەتکردن لە واقیع و وەک ناپاکی نواندن بەرامبەر بە ئەدەب ناسراوە. بەمەش سنووری ئەو ئەگەرانە لاوازبوون کە دەتوانن بەتێکستێکی ئەدەبی سەربەخۆییەکی ئیستاتیکی و فیکری و دەلالی ببەخشن و لە بەیاننامەیەکی سیاسی جیابەکاتەوە.

بەبۆچوونی من نەوە جیاجیاکانی ئەدەبی ئێمە دەسکارییەکی ڕاستەقینەی ئەم تێگەیشتنە تایبەتەیان بۆ ئەدەب نەکردوە و هەر نەوەیەک لەشوێنی خۆیەوە ئەم تێگەیشتنەی سەرلەنوێ بەرهەمهێناوەتەوە. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان و بەدرێژایی چەند نەوەیەکی ئەدەبی گرنگ ئەم تێگەیشتنە

هەر ماوەتەوە و لە چەند ئەزموویێکی کەمدا نەبێت دەستێکی ئەوتۆی بۆ نەبراوە. بێگومان کۆمەڵێک هۆکاری تایبەت لە پشتی مانەوەی ئەم تێگەیشتنەوەیە کە ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە، مەبەستی من لەم دەستنیشانکردنە ئەوەیە نیشانیبدەم کە ململانێی نێوان نەوە ئەدەبییەکان لە دنیای ئێمەدا نەبۆتە ململانێی نێوان مەرجەعەکان.

نموونەی دووهەمیان پەیوەندی نێوان نێر و مێیە لە واقیعی ئێمەدا. هەموومان دەزانین ئەم پەیوەندییە لە کۆمەڵگای ئێمەدا پەیوەندییەکە تا ڕادەیەکی زۆر داخراوە. ئەم داخرانەش نەک تەنها نۆرم و بەها و ئەخلاقیاتی باڵادەست بەڵکو فەزای گشتی شارە گەورەکانی کوردستانیش لە داخستنیدا بەشدارن. لەڕاستیدا فەزای گشتی ئەم شارانە تاڕادەیەکی زۆر فەزای کوشتنی پەیوەندی ئازادی نێوان نێر و مێن. لە کۆمەڵگای ئێمەدا نێر و مێ لەدەرەوەی درووستکردنی خێزاندا هەلی بینین و ناسین و ئاڵوگۆڕی بیر و ووشیاری و سۆزیان لەگەڵ یەکدیدا زۆر کەمە و تاڕادەیەکی زۆر بە دیوارێک لە شەرم و ترس و بەهای سوونەتی لەیەکدی دابڕاون، ئەم دابڕانەش کێشەی گەورەی بۆ نەوە جیاجیاکان دروستکردوە، لە کێشەی ژنهێنان و شوکوردن و پەیوەندییەوە بۆ کێشەی ئاڵوگۆڕی ڕاو بۆچوون و تێگەیشتنی تایبەت. هەم نەوە نوێکان بەدەست ئەو کێشانەوە دەناڵێنن و هەم نەوە کۆنەکان، نەوە نوێکان لە سارایەکی گەورەی بێسۆزی و بێسێکسی و بێخۆشەویستیدا دەژین، نەوە کۆنەکانیش لە ترسێکی بەردەوامی دروستبوونی ئەو پەیوەندیانەدا و لەوێشەوە برینداربوون و لەکەداربوونی ئەوەی پێدەگوترێت ناوبانگ و سومعەی کۆمەڵایەتی تاکەکەس و خێزان و بنەماڵە. ئەگەر باوکان و دایکانی ئێمە لە پازدە و شازدە و هەڤدە ساڵیدا ژنیانهێنابێت و شوویانکردبێت، واتە لە تەمەنێکی بچووکەوە توانیبێتیان ژیانێکی جنسی و عاتیفی و کۆمەڵایەتی ڕێکخراو بژین، ئەوا نەوە تازەکان لە جیهانێکدا دەژین کە توانای ڕێکخستنی ئەو جۆرە ژیانەیان نییە و ئەم مەسەلانە زۆرجار دوادەکەون بۆ دوای سی ساڵی و هەندێکجار هەر ناشتوانن دابینبکرێن. بە مانایەکی دیکە نەوە نوێکان کەوتوونەتە «واقیع»ێکەوە تەواو جیاواز لە واقیعی باوکان و دایکانیان، کەچی ئەو سیستمە ئەخلاقییەی کە حوکمی ئەم نەوەیە دەکات نەک هەمان سیستمی ئەخلاقی باوکانە بەڵکو لەزۆر سەرەوە و بەهۆی بەهێزبوونی ئامادەگی دینەوە لە واقیعی ئێمەدا لە هی ئەوان داخراوترە.

ئەوەی شوێنی سەرنجە ئەوەیە ئەم کێشانە نەبوونەتە هۆی ئەوەی نەوە تازەکان شێوەیەکی دیکەی پەیوەندی نێوان نێر و مێ پێشنیاربکەن و داوای تازەکردنەوەی کۆمەڵایەتی و کولتووری ئەم پەیوەندییانە بکەن. نەبوونی داواکاری لەم بابەتە تاڕادەیەکی زۆر وابەستەی ئەو ڕاستییەیە کە هیچ نەوەیەک لە دنیای ئێمەدا، سەرەڕای گەورەیی و کوشندەیی کێشەکانی، هەوڵینەداوە ململانێ لەگەڵ مەرجەعە باڵادەستەکاندا بکات و مانای بوون و مانەوە و باڵادەستی ئەو مەرجەعانە بخاتە ژێر پرسیارەوە.

خاڵی هەرە لاوازی ململانێی نەوەکان لە وڵاتی ئێمەدا ئەم داخرانە مەرجەعییەیە. مەرجەع لای ئێمە شوێنێکی پیرۆزی پێدراوە و بەم پیرۆزکردنەشی دەرگای ڕەخنەکردن و لێپرسینەوە و دەسکاریکردنی داخستوە. لە کایەی ئەدەبدا سیاسەت بیرۆکەی واقیعی پیرۆزکردوە، لە کایەی پەیوەندی نێوان نێر و مێدا، دین ئەم مەسەلەیەی سەپاندووە. ڕەخنەکردنی سیاسەت و ڕەخنەکردنی دین لە دنیای ئێمەدا دووان لەو حەرامە گەورانەن کە زۆر بە زەحمەت نەبێت دەستیان بۆنەبراوە. لە ئێستاشدا هەرکەسێک دەست بۆ هەریەکێک لەم دوو لایەنە ببات بەکەمتر لە خائین و کافر و تێکدەر ناونابرێت. کەمنین ژمارەی ئەو نووسەر و ڕەخنەگر و ئەکادیمی و سیاسییانەی لە کوردستاندا بەختیار عەلی بە دز و خائین و شوێنی مەترسی ناودەبن و وەک ناپکێک بەرامبەر بە نەتەوە و مێژوو و شەهیدان ناونووسیدەکەن، کەمیشنین ژمارەی ئەو فەتواچی و مەلا و ئەکتیڤیستە دینیانەی کە هەموو کرانەوەیەکی پەیوەندی نێوان نێر و مێ وەک بەدڕەوشتی و لادان لە دین و دۆڕاندنی شووناسی ڕەسەنەی کوردی دەخوێننەوە.

ئاشکرایە دنیای ئێمە دنیای بێململانێ نییە، وەک هەموو کۆمەڵگاکانی دیکەی سەر زەوی لەم کۆمەڵگایەشدا ڕۆژانە ململانێ و پێکدادان دروستدەبن، بەڵام کاراکتەری سەرەکی ئەو ململانێ و پێکدادانە لەوەدایە کە هەموویان لە چوارچێوەی هەمان سیستمی بەها و نورم و ئەخلاقیەتی باڵادەستدا ڕوودەدەن. نەوە نوێکان تەحەدای مەرجەعیەتی بەها و ئەخلاق و شێوە ژیانی باڵادەست ناکەن، لەڕێگای پێشنیارکردنی مەرجەعی دیکەوە بۆ بەها و ئەخلاق و شێوە ژیانی تازەوە. ئەوان لەباشترین دۆخدا داوای کرانەوەیەکی شەرمنانەی سنووری هەندێک بەها و بۆچوون و مۆراڵی باڵادەست دەکەن. داوای ئەوە دەکەن لەنێوان

هەمان سیستم و مەرجەعدا بتوانن هەناسەبدەن و بژین، لەنێوان هەمان ڕست لە میکانیزمی چاودێری و دیسپلین و سزادا بژین، بەڵام کەمەکێک کراوەتر و هێمنتر و نەرمتر. بەمەش ئیرادەی ئەوان وەک ئیرادەیەکی گۆڕانخواز پەکیدەکەوێت و پرۆسەی گۆڕان لە دنیای ئێمەدا دەدرێتە دەست پرۆسە مێژووییە درێژخایەنەکان خۆیان، دەدرێت دەستی ئەو شەپۆلی گۆڕانانەی ناوچەکە وەک گشتێک دەگرێتەوە و بەشێکیشی بەسەر وڵاتی ئێمەدا تێدەپەڕێت. ئەمەش وادەکات شوێنپەنجەی نەوە تازەکان بەسەر ڕۆژگاری خۆیانەوە کەمبێت، بەهەندێک حیساباتی مێژوویی بێمێژوو بژین.

**٥- لەنێوان ئیمامی عەلی و مادۆنادا**

بێگومان پەنجەخستنە سەر ئەم ڕاستییانە مانای ئەوە نییە کە سیمبۆڵە کولتوورییەکانی دەرەوەی مەرجەعی باڵادەست لە کوردستاندا، ئامادە نین، واتە مەسەلەکە بەو جۆرە نییە گوایە ئەمڕۆکە لەدەرەوەی ئەخلاقیاتی دینی و بەهای سیاسی تەقلیدیدا، کوردستان بەتاڵە لەهەموو ڕەگەزێکی کولتووری دەرەکی. بۆنموونە ئەمڕۆ لەڕێگای جیهانگیری کولتووریی و ئینتەرنێت و ساتالایتەوە، لەڕێگای فشاری زۆری بەهاکانی مەرجەعی باڵدەستەوە، هەلومەرجێک دروستبووە کە وایکردوە چەندان ڕەگەزی کولتووری دەرەوەی مەرجەعی باڵادەست ئامادەبێت. بەڵام ئەوەی نائامادەیە ئەو مانا و مەرجەعانەن کە لەپشتی ئەو سیمبول و وێنە و ڕەگەزە کولتوورییانەوە ئامادەن کە ئەمڕۆ هاتوونەتە ناو جیهانی کولتووری و ڕەمزی و کۆمەڵایەتی ئێمەوە. ساتالایت و گۆڤار و ڕۆژنامە و فلیم و سەفەر و کتێب، دەرگای ناسینی مەرجەعەکانی دیکەیان کردۆتەوە، یان ڕاستر بدوێم دەرگای ناسینی سیمبۆڵەکانی ناو مەرجەعەکانی دیکەی کردۆتەوە، بەڵام کێشەکە لە چۆنیەتی تێگەیشتندایە لە مانای ئەو سیمبۆڵانە. بۆ نموونە وێنەکانی گۆرانیبێژێکی وەک مادۆنا لە کوردستانی ئێمەدا ئامادەیە، شێوازی سەماکردن و جلوبەرگ و قسەکردنی ئامادەیە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری ئەو مانایانەی ئەم گۆرانیبێژە لە سیاقی خۆی و لەنێو مەرجەعە ڕۆژئاوایی و ئەمریکییەکەیدا هەڵگریەتی ئامادەنین. بەبۆچوونی هەندێک فێمێنیستی ئەوروپی گرنگی مادۆنا لەوەدایە کە ئەم گۆرانیبێژە ئەو سنوورە ئەستوورەی لە نێوان تووخمی پیاو و تووخمی ئافرەتدا

دروستکراوە تێکدەشکێنێت. ئەم فێمینیستانە پێیان وایە مادۆنا زۆرجار گەمەی بەو سنووە تەقلیدییانە کردوە کە نێر و مێ لەیەکدی جیادەکەنەوە، زۆرجار سەری لە تەماشاکەرەکانی تێکداوە بەوەی کە نەیانزانیوە داخۆ تەماشای پیاوێک دەکەن یان خانمێک. واتە ئەو سنوورە سوونەتییەی کە پیاو لە ژن جیادەکاتەوە تێکشکاندوە، جگە لەمەش مادۆنا، لەم بۆچوونەدا، گەمەی بە ڕەنگی دەموچاو و قژ و ڕووکارە دەرەکییەکانی دیکەی جەستەی کردوە، هەندێکجار دەموچاوێکی سوور و هەندێکجار سپی و هەندێکجار ئەسمەری هەیە، هەموو ئەمانەشی وەک جۆرێک لە گەمەکردن بە شووناس و بە مانا و بە سنوورە تەقلیدییەکانی پۆلیکردن، پێشکەشکردوە. لەم بۆچوونەدا مادۆنا ئەو وێناکردنە تەقلیدییانە تێکدەشکێنێت کە دەڵێت ئەمە شووناسی پیاوە و ئەمەش هی ئافرەت، ئەمە کارەکتەر و ڕوخساری پیاوە و ئەمەش هی ئافرەت، ئەمە سیمبۆڵەکانی جیهانی پیاوانە و ئەمەش هی ئافرەت.

لە خوێندنەوەی ئەم فێمینیستانەدا مادۆنا تاقە کەسێک نییە ئەم گەمەیەی بە سنوورەکانی نێوان پیاوەتی و ژنایەتی کردبێت، بەشێکی زۆری گۆرانیبێژەکانی مۆسیقای پۆپ ئەم کارەیان کردوە و بەردەوامیش دەیکەن، مایکل جاکسۆن و پرینس لەم ڕووەوە باشترین دوو نموونەن کە باسدەکرێن. لەم خوێندنەوەیەدا مادۆنا بەردەوام گەمەی بەو شووناسە جێگیرانە کردوە کە دەدرێتە پاڵ کەسێک، جنسێک یان ڕەگەزێک. بەم گەمەیەشی نیشانئەدات ئەو شووناسانە دروستکراون، نەک سروشتی، جێگیرنین بەڵکو قابیلی گۆڕانن، کولتورین نەک بایۆلۆژی. لێرەوە هەموو ئەو نایەکسانیانەی لەپشتی ئەم شووناسانەوە ئامادەن، دەبنە نایەکسانی دروستکراو و ناسروشتی ، بۆیە نابنە شووناسی ئەبەدی و قابیلی مانەوەی بەردەوام و نەگۆڕان.

هەندێک لە فێمێنیستەکان گرنگیەکی دیکەی ئەم گۆرانیبێژە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە گوایە مادۆنا جەستەی ئافرەت لە کۆمەڵێک ترس و شەرم ئازاد دەکات کە دروستکراوی کۆمەڵگایەکن کە پیاو تێیدا ماناکانی شەرم و ترس بەرهەمدێنێت و پیاو بڵاویاندەکاتەوە و پیاو دەشیانسەپێنێت.

لێرەوە لە پشتی گەمەی مادۆناوە بەو سنوورە دەرەکیانەی پیاو لە ئافرەت جیادەکەنەوە گەمەیەکی دیکە پەنهانە کە قووڵتر و گرنگترە لە گەمەی یەکەمیان، یان لانیکەم بێ بوونی گەمەی یەکەمیان مەحاڵە، ئەویش گەمەکردنە بەو

دەسەڵاتەی دنیایەک نایەکسانی لە نێوان نێر و مێدا دەخولقێنێت و جەستە دەکاتە سەرزەمینی شەرم و ترس و شاردنەوە. مادۆنا بەم مانایە لەیەککاتدا شووناسە کۆن و ڕەقهەڵاتووەکانی ئافرەت و پیاو قەیراناویدەکات و داوای پێناسەکردنەوەیەکی دیموکراسیانەتر و یەکسانخوازانەتری ماناکانی پیاو و ئافرەت دەکات. بێگومان ئەم خوێندنەوەیەی لێرەدا نیشانماندا تاقە خوێندنەوەیەک نییە بۆ ئەم دیاردەی گەمەکردنە بە شووناس کرابێت، کۆمەڵێک خوێندنەوەی دتریش هەن کە لێرەدا مەودای باسکردنیانمان نییە.

بەڵام ئەم سیمبوڵەی مادۆنا لە گواستنەوەیدا بۆ دنیای ئێمە هەموو ئەو مانایانە لەدەستئەدات و دەبێتە مۆدێل بۆ شێوازێکی دیاریکراوی جلوبەرگ و قژبڕین و جولانەوە. ئەم گواستنەوە میکانیکییەی سیمبولەکان، وەک گواستنەوەی زۆربەی شتەکانی دیکەش، هەمان میکانیزم بەڕێوەی دەبات، میکانیزمی دابڕین و قرتاندنی سیمبولەکان لە مەرجەعەکانی خۆیان، لە واقیعێکدا کە خۆی ناوێرێت شەڕ لەگەڵ مەرجەعەکانیدا بکات.

بێگومان بەشێکی گرنگی ئەم کێشەیە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕۆشنبیریی کوردیی مەسەلەی تیور و تیوریزەکردنی بەتەواوی پشتگوێخستوە و نەوەنوێکان لەبەردەم مێژوویەکی درێژیی تیوریزەکردنی واقیعی کۆمەڵایەتی و کولتووریی و هونەریی خۆیاندا نین تا بتوانن لەڕێیەوە دەرک بە ماناکانی ئەو دنیا و سیمبۆڵانە بکەن کە لەناویدا دەژین، واقیعی ڕۆشنبیریی ئێمە واقیعێکە دراوەتە دەست ڕەحمی دروشمە سیاسیە سادەگۆ و نەخشە ئایدیۆلۆژییە سادەکان و نوخبەیەکی ڕۆشنبیریی تەقلیدیش ئامادەیە کە دژ بە فیکر و مەعریفەی ڕاستەقینە کاردەکات. ئەم نوخبەیە زۆربەی زۆر دەزگا و ناوەند و دامەزراوە کولتووریی و مەعریفییەکانی کوردستانی لەبەردەستدایە و کۆی ئەم دەزگایانەش بە ئاراستەیەکدا دەبات کە نەک گۆڕانی لێناکەوێتەوە، بەڵکو بەر بە هەر هەوڵێکی ڕاستەقینەی گۆڕانیش بگرێت. ئەمە جگە لەوەی کە فیکری سیاسی لە دنیای ئێمەدا بەشێکی زۆری فۆرمەکانی تری فیکری کووشتوە یان ناهێڵێت دروستبن و پێبگەن. لەم ڕووەوە یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی نەوەی نوێ لە دنیای ئێمەدا بریتیە لە ئیشکردن لە دەرەوەی ئەو نەخشە فیکرییانەدا کە فیکری سیاسی کوردی بەسەر واقیعی ئێمەدا سەپاندویەتی، ئەمەش، لەڕووی فیکرییەوە، مانای ڕزگارکردنی ئەم واقیعە، لە دەست خوتبەی سیاسیەکان و

خوتبەی پیاوە ئاینییەکان و خوتبەی ڕۆشنبیرە چلەگێرەکان کە بەسەریەکەوە کۆی تواناکانی بیرکردنەوەی هێمن و ڕەخنەیی و قووڵ دەکوژن و دەنگەدەنگێک دروستدەکەن کە یەکەمین کوژراو تێیدا بیرکردنەوەیە.

خاڵێکی زۆرگرنگ کە لێرەدا پێویستە هێمایەکی خێرای پێبکەین ئەوەیە مادامەکی ململانێکان لە دنیای ئێمەدا ململانێی مەرجەعەکان نین و ئەوانەی بەیەکدادەدەن خەیاڵ و دید و کەرەستەی ناو مەرجەعەکان نین، بۆیە ئاساییە لە بازارەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکدا لەپاڵ وێنەکانی ئیمامی عەلیدا وێنەی مادۆنا و لەپاڵ ئایەتەکانی قورئاندا وێنەکانی ئۆلیا ئەفشەر و لەپاڵ وێنەکانی مامەڕیشەدا وێنەی ئیبراهیم داتلّساز بەتەنیشت یەکەوە ببینین. کە نەوەکان شەڕی مەرجەعیان لەگەڵ یەکدا نەکرد، ئەوکات تێکەڵبوونی وێنەی ناو ساتالایتەکان و ئایەتەکانی قورئان مەسەلەیەک نییە. قەیناکات با سەید قوتب و هابرماز، کۆمەڵگای مەدەنی و فەتوای ئاینی، شیعری کلاسیک و پەخشانە شیعر بەیەکدی تێکەڵبن. کە شەڕ شەڕی مەرجەع نەبوو چ زەرەرێک دەکەین شەوان دەرەنگ ساتالایتەکان خەڵک داوەت بکەن بۆ ناو دنیای سەما و سەفا و ئیرۆتیکی جۆربەجۆر، کەچی لەهەمانکاتدا لەو دیو دەرگاکانەوە تەپڵی ئەو شەوگەڕانە ببیسترێن کە خەڵکان بۆ گرتنی ڕۆژوو بانگێشەدەکەن. کە شەڕی مەرجەع نەکرا هەموو شەڕەکانی دیکە جگە لە مارشێکی نائومێد شتێکی دیکە نین.

# ڕەهەندە سایکۆلۆژی و کولتووری و ڕەمزییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی

**١. سەرەتا**

یەکێک لەو چەمکە سەرەکییانەی ئەمڕۆکە فیکری سیاسی لە کوردستاندا بەکاریدەهێنێت چەمکی «کۆمەڵگای مەدەنییە». کەم هێزی سیاسی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا ئەدۆزینەوە باس لە گرنگی کۆمەڵگای مەدەنی نەکەن، وای نیشانەدەن کە ڕێزگر و گەشەپێدەر و گوێگریی کۆمەڵگای مەدەنین و پاراستن وبەهێزکردن و بەرەوپێشبردنیشی وەک یەکێک لە ئەرکە سیاسییە گرنگەکانی خۆیان بەیان نەکەن. ئەگەر لە قۆناغەکانی پێشتردا چەمکی دیکە، بۆ نموونە چەمکی سۆسیالیزم، چەمکی باڵادەستی ناو کایەی سیاسەت و فیکر و ڕۆشنبیریی ئێمە بووبێت و زۆربەی کۆڕ و کۆمەڵ و نووسین و هەوڵە فیکریی و ڕۆشنبیرییەکان لە دەوری ئەم چەمکە سووڕابنەوە، ئەوا لە ئێستادا چەمکی «کۆمەڵگای مەدەنی» ئەو ڕۆڵە باڵادەستەی وەرگرتووە و بۆتە سێنتەری مشتومڕ و باسکردن و قسەلەسەرکردن.

بەڵام وەکچۆن زۆربەی چەمکەکانی ناو کایەی سیاسی کوردیی لەڕووی تیۆرییەوە هیچی ئەوتۆیان لەسەر نەگوتراوە و هەوڵی فیکریی ڕاستەقینە لەئارادا نەبوون بۆ تیۆریزەکردنیان، ئاواش شیکردنەوەی بنەما فیکری و کولتووری و سایکۆلۆژییەکانی چەمکی «کۆمەڵگای مەدەنی»ش بێتیۆریزەکردن ماونەتەوە. ئەو دەنگە دەنگە گەورەیەی ئەمڕۆکە لەسەر گرنگی کۆمەڵگای مەدەنی دەیبیستین هاوڕێ نییە بە خوێندنەوەیەکی وردی ماناکانی ئەم چەمکە و بە دەستنیشانکردنی مەرجەعە فیکرییەکانی و بەچۆنیەتی تیوریزەکردنی لە واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی ئێمەدا کە هەڵگری تایبەتمەندێتی و پێدراوی مێژوویی و ڕەمزی و بەهایی و سایکۆلۆژیی تایبەتە. زۆربەی هەرەزۆری ئەو ووتار و نووسین و سەرنجانەی لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی نووسراون و دەنووسرێن جگە لە دووبارەکردنەوەیەکی بێزارکەر و بێلەزەتی پێناسە میکانیکییەکانی ئەم چەمکە و نیشاندانێکی نیوەوناچڵی بۆچوونی چەند

ـەیلەسوفێکی سیاسی، تێپەڕی نەکردوە. لەهەندێک ئاستیشدا ئەوەی سەبارەت ـەم چەمکە دەگوترێت و دەنووسرێت گواستنەوەیەکی نارەخنەیی و کۆپیئاسای ـەندێک بۆچوونی ناو ڕۆشنبیریی عەرەبییە، بەبێ حیسابکردن بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئەم ڕۆشنبیرییە هەڵگری کێشە و قەیران و دنیابینی تایبەتە و لە کۆمەڵێک گرفتی سیاسی و ئەخلاقی و کولتووریدا دەژی کە لە کوردستاندا ـەهەمان ماناوە لەئارادانین.

به لەبەرچاوگرتنی ئەم ڕاستیيانە ئەم نووسینە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ ـەستنیشانکردنی چەند تەوەرەیەکی تایبەت بۆ تیوریزەکردنی چەمکی «کۆمەڵگای مەدەنی» لە کوردستاندا. ئەو تەوەرانەش من لەم نووسینەدا ـەستنیشانیان دەکەم بۆ قسەکرن لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی، لە دیدی منەوە، گرنگترینی ئەو تەوەرە فیکری و سیاسی و کولتوورییانەن کە گفتوگۆکانمان لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی دەبێت گرنگیان پێبدات و تیایاندا ماناکانی ئەم چەمکە و چۆنیەتی کارپێکردن و پاراستن و گەشەپێدانی دەستنیشان بکرێن.

یەکەمین خاڵێک لێوەی دەستپێبکەین پێداگرتنە لەسەر ئەو سەرەتا تیورییەی کە پێیوایە کۆمەڵگای مەدەنی بەتەنها ئەو دەزگا و ئۆرگان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییانە نییە کە لە دەرەوەی دەوڵەت و لەدەرەوەی «کۆمەڵگای سیاسیدا» ئامادەن و ڕۆڵی چاودێریکردنی دەوڵەت و چاودێریکردنی دەسەڵاتی سیاسی ـەبینن. ڕاستە ئەم دەزگایانە زۆر گرنگن، بەڵام بەتەنها هەموو ماناکانی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی ناگرنەخۆیان. واتە کۆمەڵگای مەدەنی بەتەنها دەزگاکانی خێزان و قوتابخانە و مزگەوت و میدیا و سەندیکا و گروهە هونەری و ئەدەبی و وەرزشییەکان و گروهی ژنان و منالان و لاوان و پیران نین. ئەگەر بکرێت لە هەندێک هەلومەرجی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووریدا ماناکانی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ئەم ڕەهەندە دەزگاییە کورتبکەینەوە، ئەوا لە کوردستاندا ناتوانین ئەم کارە بکەین. هەر کەسێک ئاگاداری هەلومەرجی ناوەکی کوردستان بێت، ـەزانێت کۆی ئەو دەزگایانەی کە دەشێت کۆمەڵگای مەدەنیان لێدروستدەبێت ئامادەن، بۆ نموونە لە کوردستاندا چەندان گروپ و یانە و ڕێکخراو و کۆڕ و کۆمەڵەی خوێندکاران و ئافرەتان و منالان و هتد.. ئامادەن، کۆڕ و کۆمەڵی هونەری و وەرزشی و ئەدەبی هەن. بەڵام ئەم ئامادەگییە دەزگاییە نەیتوانیوە ئەوەی لە کوردستاندا هەیە، بکاتە کۆمەڵگای مەدەنی بە مانا ڕاستەقینەکەی ئەم

چەمکە، دەزگاکان هەن بەڵام «ڕۆحی» کۆمەڵگای مەدەنییان تیا نییە، واتە ئە
ڕۆحە ڕەخنەیی و چاودێریکەر و گفتوگۆخواز و لێبووردوو و هاریکارەیا
تێدانییە کە بە دەزگاکان کاراکتەرێکی مەدەنی دەبەخشن و دەیانکەنە دەزگا
مەدەنی ڕاستەقینە.

شتێکی نوێ و نەبیستراو ناڵێین گەر ووتمان ژمارەیەکی زۆری ئەو دەزگایانە
لە کوردستاندا بە دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی ناودەبرێن دەزگای حیزبین
بەچەندان شێوە بەشێکن لەو تۆڕە دەزگاییەی حیزب بەهۆیانەوە دادەبەزێتە نا
ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. بە مانایەکی دیکە ئەم دەزگایا
ئەوەندەی دەبنە درێژکراوەی جەستەی حیزب لەناو جەستەی کۆمەڵگای کوردیدا
ئەوەندە دەزگای کۆنترۆڵ و چاودێریکردنی کۆمەڵگا نین بەسەر دەسەڵات
حیزبەوە. واتە ئەم دەزگیانە دەزگای مەدەنی نین، بەڵکو دەزگای سیاسی
سەربەخۆ نین بەڵکو مڵکی حیزبن و ڕۆڵی چاودێریکەر نابینن بەڵکو ڕۆڵ
پیادەکردنی ئەمر و نەهییەکانی حیزب دەگێڕن. بەشێکی گرنگی کارەکانیشیا
لەپاڵ کۆکردنەوەی خەڵکدا لە دەوری حیزب، بریتییە لە چاودێریکردن
دیسپلینکردنی ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی کۆیاندەکەنەوە لەژێر چاویلکە
حیزبدا. ئەم واقیعە تایبەتەیە وادەکات بۆ تیوریزەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی ل
کوردستاندا ناچاربین تەماشای ڕەهەندێکی تری کۆمەڵگای مەدەنی بکەین ک
دەکەوێتە دەرەوەی ڕەهەندە دەزگاییەکەوە. مەبەستم لەو ڕەهەندەش «ڕەهەند
مەعنەوی» یان «ڕەهەندی ڕەمزیی» کۆمەڵگای مەدەنییە. مەبەستم لە ڕەهەند
ڕەمزیش کۆی ئەو بەها و نۆرم و بیر و بۆچون و ڕەمز و پێکهاتی سایکۆلۆژی
کێشە ڕۆشنبیرییانەن کە لە فۆرمی هێزێکی ئەخلاقیی و ڕۆشنبیریی و ویژدان
و سایکۆلۆژییدا لە جومگە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا ئامادەن. بە مانایەک
دیکە ڕەهەندی ڕەمزی کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لەو ڕۆح و ویژدان و ووز
مەدەنییەی بە دەزگا جیاوازەکان کاراکتەرێکی مەدەنی دەبەخشن، لەبوونەوەر
بێڕۆح و بێجوڵە و بێئیرادەوە دەیانکەن بە دەزگای زیندو و بڕیاردەر و خاوەن
ئیرادە. بەبۆچوونی من بۆ قسەکردن لەسەر کۆمەڵگایەکی مەدەنی ڕاستەقین
ئەم ڕەهەندە ڕەمزییەی کۆمەڵگای مەدەنی بەهەمانئەندازەی ڕەهەند
دەزگاییەکەی گرنگە، ئەگەر گرنگتر و کاریگەرتریش نەبێت. ئەم ڕەهەند
ڕەمزییەیە ڕۆح دەکات بە بەری دەزگاکاندا و وایانلێدەکات ببنە بوونەوەرێک

ڕۆحلەبەر نەک ڕستێک دەزگای مردوو. بێگومان ئەم ڕەهەندە ڕەمزییەی کۆمەڵگای مەدەنی دەشێت هەم بەئاراستەی چەسپاندن و بەهێزکردن و پایەدارکردنی کۆمەڵگای مەدەنی کاربکات، هەم بە ئاراستەی زیانپێگەیاندن و لاوازکردن و ڕێگرتن لە گەشەکردنی ئەم کۆمەڵگایە، تا ئەندازەی لەناوبردنیشی.

بۆ ناسینی ڕەهەندە ڕەمزییەکەی کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا دەشێت ئەم تەوەرانەی خوارەوە لە یەکدی جیابکەینەوە:

**٢- کۆمەڵگای مەدەنی و ترس**

لە فەزایەکدا ترس ڕەنگڕێژی کردبێت، ترس پاڵنەری سەرەکی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ بێت، ترس کار و کاردانەوەکان دەستنیشانکات و ترس سەروەر و پایەداربێت، لەو جۆرە فەزایەدا ناتوانین قسە لە بوون و ئامادەگی چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی بکەین. ترس دوژمنی هەرسەرەکی کۆمەڵگای مەدەنییە، چونکە ترس هێزێکە سەرکوتکەر و چەپێنەری ئازادی قسەکردن و ئازادی دەسپێشخەریکردن و ئازادی بڕیاردانی ئاشکراو سەربەخۆ. کە ترس سەروەربوو ئازادی کۆیلەیە، ترس هەمیشە هاوماڵی ناچارکردنە و پێکیشەوە دێن و بەیەکیشەوە دژ بە ئازادی کاردەکەن. کە ئازادیش چەپێنرا و بە ترس و تۆقاندن گەمارۆدرا ئەوکات کۆمەڵگای مەدەنی، بە مانای کۆمەڵگایەکی ئازاد و سەربەخۆ، ناتوانێت ئامادەبێت. ترس وادەکات تاک و گروپەکان نەتوانن بەڕاشکاوی و بە ئاشکرا و بە ئازادی ڕاو بۆچوون، دید و جیهانبینی، ویست و ئارەزوو، مژدە و چاوەڕوانییەکانی خۆیان دەربڕن و لە فۆرمی ڕێکخراو و دەزگا و کۆڕو کۆمەڵی تایبەتدا ڕێکیانخەن. بۆئەوەی بتوانیت دەستپێشخەر بیت بۆ دامەزراندنی دەزگا و بۆ بەخشینی فۆرمێکی ڕێکخراو بە کۆمەڵێک پەیوەندی و قازانج و داواکاری کۆیی، دەبێت هەلومەرجێک ئامادەبێت تێیدا ئەو هێزانە لە کۆبوونەوە و دروستکردنی دەزگا و پێکهێنانی ڕێکخراو نەترسن. دەبێت بوێرن بیر لە دروستکردنی ئەو فۆرمانە بکەنەوە کە دەخوازن بە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی خۆیانی بدەن، دەبێت مرۆڤ لەناو خۆیدا ئەو باوەڕەی تێدا دروستبووبێت کە بوونەوەرێکی خاوەن ئیرادەیە و دەتوانێت خۆی بڕیار بۆخۆی بدات. کە ترس ئامادەبوو ئەم پرنسیپە سەرەتاییانەی دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی نائامادە دەبێت، کە ترس سەروەربوو کەس ناوێرێت خۆی ڕێکخات و

کەس ناوێرێت دەستپێشخەری بکات و کەس ناوێرێت ڕاستییەکانی خۆی ئاشکراکات.

ترس هێزێکی سایکۆلۆژییە بەڵام دەرەنجامی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری سەختی لێدەکەوێتەوە. سیاسەتێک ترساندن ئامرازی سەرەکی کارکردنیبێت سیاسەتێکە پرۆژەی بێدەنگرکردنی پێیە، هێزی کۆمەلایەتی ترسیاویش هێزی ئیفلیجە و کولتوورێکیش ترس بەڕێوەیببات بەشێوەیەکی پەرگیر بەسەر خۆیدا دەچەمێتەوە و دادەخرێت. هەر یەکێکیش لەمانە، واتە هەم بێدەنگکردنی سیاسی و هەم ئیفلیجبوونی کۆمەلایەتی و هەم داخرانی کولتووریی هەنگاوی سەرەکی لەناوبردنی کۆمەڵگای مەدەنین. گواستنەوەی سیاسەت لە پانتاییەکەوە بۆ دیالۆگ و پەیوەندی ئاشکراو کراوە بۆ پانتاییەک ترس بەرهەمبهێنێت، ئەو هەنگاوەیە کە ناهێڵێت کۆمەڵگای مەدەنی دروستببێت، گەر لە ئاستی دەزگایشدا دروستبوو، واتە کۆمەڵێک دەزگا بەناوی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دامەزرێنران، ئەوکات ناتوانێت هەڵگری ئەو ڕۆحە مەدەنییە سەربەخۆیەبێت کە دەزگا ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستیان پێیەتی. ترس بەشێکی دانەبڕاوی ئەو پرۆژە سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوورییانەیە کە دەخوازن ئینسانی چکۆلە و گوێڕایەڵ و بێکاراکتەر و گرووپی بێنیاز و تەسلیمبوو و بێئیرادە دروستبکەن. ترس دێت بۆئەوەی هەمووان لە بێدەنگبووندا وەک یەک لێبکات، بە قرقەپێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری مەحکومان بکات، سنووری نێوان تاک و گروهەکان بسڕێتەوە بەزۆری زۆرداری هەمووان ناچارکات ئەو بەو زمانە بدوێن و ئەو خەیاڵە وەگەڕخەن و ئەو فۆرمەش وەرگرن کە هێزە ترسێنەرەکان دەیانەوێت بیسەپێنن. بەڵام خۆشحاڵانە ئینسان ناتوانێت تاسەر بوونەوەرێکی ترساو و بێئیرادە و بێزمانبێت، بۆیە بۆ وەگەڕخستنی ئیرادە و بەکارهێنانی زمانی تایبەت و خستنەگەڕی خەیاڵی سیاسی و کۆمەلایەتی تایبەت بەخۆی بەدوای کەناڵی دیکەی تەعبیرکردندا دەگەڕێت. لە دنیایەکیشدا ترس گەمارۆی دابێت ئەو کەناڵانە کەناڵی نهێنی و شاراوە و ژێرزەمینی دەبن. ترس وادەکات نهێنیکاری ببێتە تاقە دەروازەی تەعبیرکردنی هێزە سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتییە جیاجیاکان لەخۆیان. بە پەڕینەوە لەکاری ئاشکراوە بۆ کاری نهێنی، ترس وادەکات کۆمەڵگا هەمیشە هەڵگری پرۆژەی دروستکردنی دنیایەکی ژێرزەمینی و یاساغ و تاریکبێت هاوشان بەو

دنیا ئاشکراو بەرچاوەی ڕۆژانە لە هەناویدا دەژین. ئەوانەی کە ترس ناهێڵێت بە ئاشکرایی بدوێن و بژین و ببزوێن، ئەگەر نەیانەوێت بێدەنگبن، ئەوکات ناچارن بەنهێنی و لە تاریکیدا بدوێن و بژین و بنووسن. ئەمەش ڕێک پێچەوانەی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنییە کە ئاشکرابوون یەکێکە لە مەرجە هەرە سەرەکییەکانی.

کۆمەڵگای مەدەنی «کۆمەڵگایەکی ژێرزەمینیی» نییە، لە تاریکیدا کارناکات و بۆ هیچ مەبەستێکیش خۆی ناشارێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵگای ئاشکراییە، دەربڕی ئامادەگییەکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگا و کولتوور و سیاسەتە بۆ ئاشکرابوون. لەڕاستیدا فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنی فەلسەفەی ڕێگرتنە لە دروستبوونی نهێنی، لە دروستبوونی ئەو دنیا یاساغ و نەدیتراو و ژێرزەمینییەی ئینسان و گروپەکان بە دزییەوە بنیادیدەنێن بۆ دەربڕینی ویست و ئارەزوو و خەونە یاساغکراوەکانیان. کۆمەڵگای مەدەنی مانای ڕێگرتن لە دروستبوونی دوو دنیا یەکێکیان بەرچاو و ئاشکرا و ئەویدیکەیان شاراوە و یاساغ، یەکێکیان گوونجاو لەگەڵ فۆرم و میکانیزمەکانی یاساغکردن و چەپاندندا، ئەویدیکەیان شوێنی هەڵاتن لەو چەپاندن و یاساغکردنانە، یەکێکیان تێدا ئینسان ببێتە بوونەوەرێکی چەپڵەلێدەر و سەرلەقێنەر و بەڵێ گوتەر، ئەویدیکەیان هەمان ئینسان بکاتە بوونەوەرێکی نەفیکەر و «نا» گوتەر و یاخیگەر. بەم مانایە کۆمەڵگای مەدەنی لەڕووی سایکۆلۆژیای کۆییەوە کۆمەڵگای کۆتاییهێنانە بەو «شیزۆفرینیا کۆمەڵایەتییەی» کە بەشێوەیەکی شاقوڵی کۆمەڵگا بۆ دوو جیهانی ناکۆک و ناتەبا و دژ بەیەک دابەشدەکات، دیوێکیان ئاشکرا و بینراو قبووڵکراو ئەویدیکەیان نەدیتراو و نهێنی و یاساغکراو. کۆمەڵگای مەدەنی ئینسانیش لەو دابەشبوونە شاقوڵییە ئازاددەکات کە قاچێکی لەنێو گەمەکانی تەسلیمبوون و قاچەکەی دیکەی لەناو ئیستاتیکای یاخیبووندایە، بەشێکی لەسەر درۆکردن بەندە و بەشەکەی دی لەسەر هەقیقەتێکی قبووڵنەکراو.

بێگومان لەهەر شوێنێکدا سیاسەت بە زمانی ترس قسەیکرد، ئیدی ترس لەوە دەردەچێت کە تەنها وەک هێزێکی سایکۆلۆژی بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێتە هێزێکی دەزگاییش. کەم نین ژمارەی ئەو دەزگایانەی کاریان بەرهەمهێنان و نیشاندان و بە سیمبوڵکردنی ترسە. دەزگاکانی ئەمن و موخابەرات، سوپا و هێزی تایبەت، پۆلیسی نهێنی و پۆلیسی ئاشکرا و زۆرانی تریش دەشێت ڕاستەوخۆ و

ناڕاستەوخۆ ببنە ئامێری بەرهەمهێنانی ئەو ترسەی دەسەڵاتداران دەیانەوێت لە کۆمەڵگادا بیچێنن. ترسێک کە ڕووی لە کوشتنی هەر دینامیکیەتێکی کۆمەلایەتی بێت و بەر بە هەر گۆڕان و بەرەوپێشەوەچوون و کرانەوەیەکی ڕاستەقینە بگرێت. ئاخر هیچ هێزێکی ترساو یان ترسێنراو ناتوانێت هەڵگری پرۆژەیەکی کۆمەلایەتی ڕاستەقینەبێت بۆ گۆڕان، بەتایبەتی گۆڕانێک کە کارەکتەرێکی ڕۆژانە و هێمن و ئاشکرای هەبێت و فۆرمی پەلامار و هێرشی نهێنی و توندوتیژ نەگرێتەخۆی. لە ڕاستیدا بە دەزگاییبوونی ترس وادەکات هەندێک لە دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنیش ڕۆڵی بەرهەمهێنەر و پارێزەر و بلاوکەرەوەی ترس ببینن. کەی ئەم دەزگایانەش بەم دۆخە تایبەتە گەیشتن، ئەوکات ڕۆڵی ئەو دەزگا تۆقێنەرانە دەبینن کە دێن بۆ کوشتن و بێدەنگکردن و ئیفلیجکردنی کۆمەڵگای مەدەنی، نەک بەشێکبن لەدەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی. نموونەی ئەم دەزگایانە لەسەردەمی بەعسدا زۆربوون، لەوانە یەکێتییەکانی قوتابیان و ژنان و لاوان و منالان و چەندانی دی، کە ڕووکارە ئەمنییەکانیان سەدان جار بەهێزتربوو لە ڕووکارە مەدەنییەکانیان.

ئەم ڕاستییانەن ناچارمان دەکەن بۆ بیرکردنەوە لە کۆمەڵگای مەدەنی بیر لە بنەبڕکردن و لابردن و نەفیکردنی کۆی ئەو هۆکارە سیاسی و ئەمنی و کولتوورییانە بکەینەوە کە هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوەی ئینساندا ترس دروستدەکەن. ترس لەوە دەرکەین کە وەک هێزێکی سیاسی ئامادەبێت و بەدەزگاییبکرێت و لەهەموو شوێنێکدا ئامادەبێت. فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنی ترس لە مانا سیاسییەکانی دادەبڕێت و تەنها وەک دیاردیەکی سایکۆلۆژیی تایبەت بە تاکەکەس دەیناسێنێت. بەکورتی ترس و سیاسەتی ترساندن دژەدیوی کۆمەڵگای مەدەنی و ئەو ڕۆحیەتە کراوەیەن کە کۆمەڵگای مەدەنی خوازیاریەتی.

### ٣- کۆمەڵگای مەدەنی و توندوتیژیی

دوژمنێکی دیکەی کۆمەڵگای مەدەنی فەلسەفەی پۆزەتیڤ نرخاندنی توندوتیژیی و بەکارهێنانی توندوتیژییە. هیچ شتێک نییە ئەوەندەی توندوتیژی زیان بە بنەماکانی دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی بگەیەنێت، لەهەر شوێنێک توندوتیژی زمانی قسەکردنی هێزە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان بوو لەگەڵ یەکدا، لەوێدا لۆژیکی میلیشیای چەکدار حوکمدەکات، نەک لۆژیکی کۆمەڵگای مەدەنی.

توندوتیژی دەشێت فۆرمێکی مادی هەبێت و لە شێوەی شەڕ و پێکدادان و قێزەونکردنی یەکدیدا بەرجەستەبێت، دەشێت فۆرمێکی ڕەمزی هەبێت و لە پەیوەندی و بەها و نۆرم و وێناکردندا بەرجەستەبێت و فۆرمی یەکدی شکاندن و بێنرخکردن و سووکایەتیکردن بگرێتەخۆی. کۆمەڵگای مەدەنی لەباتی قامچی و فیشەک و سێدارە، پێویستی بە میکرۆفۆن و هۆڵی گفتوگۆ و ڕۆژنامەی ئازاد هەیە. لەباتی ئەو بەها و بۆچوونە ئەخلاقییانەی کە ئینسان دەکەنە بوونەوەرێکی بێدەنگ و بچووک و گرگن، پێویستی بە فەلسەفەیەکی ئەخلاقی هەیە لە ئازادییەوە دەستپێبکات و ئینسان وەک بەهایەکی گەورە بنرخێنێت و لەڕێزگرتنەوە هەنگاوبنێت. هەموو ئەمانەش دژ بە پرۆسەی قەدەغەکردن و چەپاندن و بێدەنگکردنن و لەودیو توندوتیژی مادی و ڕەمزییەوە دەستپێدەکەن.

لەم فەلسەفەیەدا ئازادی وەک ماف پێناسدەکرێت، وەک ئەگەرێکی واقیعی هەمیشە ئامادە و وەک پرۆژەیەکی بێکۆتایی، نەک وەک دیاری حیزب و سەرکردە و دەسەڵاتداران بۆ تاکەکەس و گروە و کۆمەڵگا. ئازادی دەبێت ببێتە ئەو زەمینە سیاسی و کولتووری و ئەخلاقییەی کە هەمووان تێیدا ئامادەن و بەهەمووان هەمان مافی بوون و گەشەکردن و ڕێز و قسەکردن دەبەخشێت. بوونی کەناڵی تەعبیرکردنی ئازد، بوونی فەلسەفەیەکی ئەخلاقی بارگاویکراو بە بیرۆکەی لیبووردن و قبووڵکردنی جیاوازی، بوونی دیالۆگ لەشوێنی سوکایەتیکردن زەبر و زەنگ، بوونی ڕێز لە شوێنی قێزەونکردن، بوونی ئامادەگی بەردەوام بۆ ڕاپرسی وازهێنان لە فەلسەفەی بەزۆر سەپاندن مەرجی سەرەکی گۆڕینی تووندوتیژییەکانی ناو کۆمەڵگان بە چالاکیی مەدەنییانە. ئەگەر فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنی فەلسەفەی کردنی کۆمەڵگا خۆی بێت بە بکەری کۆمەڵایەتی پلە یەک و بەو هێزەی شەرعیەت بە هێزەکانی دیکە ببەخشێت، ئەوکات تێدەگەین ئامادەگی تووندوتیژی چ پرۆژەیەکی ترسناک و کوشندەیە بۆ بە کۆیلەکردنی کۆمەڵگا و سڕینەوەی ئەو سەرچاوانەی شەرعیەت کە بە کۆمەڵگا هێزێکی مەعنەوی گرنگ و قورساییەکی ڕەمزی گەورە دەبەخشن.

یەکێک لە میکانیزمە ترسناکەکانی بەکارهێنانی تووندوتیژی لەوەدایە کە لەهەر چاودێری و کۆنترۆڵکردن و لێپرسینەوەیەکی یاسایی دەربازبێت و ببێتە خولقێنەری ئیستاتیکایەکی تایبەت، ڕەهەندێکی شیعری و ڕەمزی بگرێتەخۆی کە وایلێبکات کۆمەڵێک مانا ببەخشێت لەدەرەوەی کردەی وێرانکردن و

لەناوبردندا. واتە بەکارهێنانی توندوتیژی لە جۆرێک ناچاری یاساییەوە بگوازرێتەوە بۆ جۆرێک لە خۆشەویستی سایکۆلۆژی، لە ئامرازی سەپاندن و پارێزگاریکردن لە شەرعیەتی یاساوە بگۆڕێت بۆجۆرێک لە توندوتیژی دۆستی. دەبێت لە لێکدانەوەی توندوتیژیدا هەمیشە ئەو ڕاستییەمان لەبەرچاوبێت کە توندوتیژی تەنها ئامرازێک نییە بۆ بەدەستهێنانی شتێک، سەرکەوتنێک یان مەبەستێکی دیاریکراو. بەڵکو جۆرە ئیستاتیکایەکیشە کە دەشێت بە «ئیستاتیکای ئەتککردن» ناوی ببەین. واتە توندوتیژی دەتوانێت خۆی وەک جۆرێک لە جوانی نمایشبکات و بوونەوەر و سیستمی عاشق بە توندوتیژی دروستبکات. ئەم ڕەهەندە ئیستاتیکیە کۆمەڵێک مانا بە توندوتیژی دەبەخشێت دەکەوێتە دەرەوەی بوونە فیزیایی و وێرانکەرەکەیەوە، ئەو مانایانەی کە سەرنجمان لەسەر کردەی کوشتن و دەستدرێژیکردنی فیزیاییەوە دەگوازنەوە بۆ مانا ڕەمزییەکانی توندوتیژی. کاری «ئیستاتیکای ئەتککردن» ئەوەیە شتەکان لە زەمینە واقیعییەکانیانەوە بگوازێتەوە بۆ زەمینەیەکی ڕەمزی و لەوێدا کۆمەڵێک مانا بە کارە توندوتیژەکان بدات کە دەکەونە ئەودیوی هەقیقەتی فیزیایی توندوتیژیەکە خۆیەوە. بۆ نمونە دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەتێک لەدۆخی شەڕ یان دیلکردندا، تاوانێکی ئاشکرایە و ڕووداوێکە ئامادەگییەکی فیزیایی ناشیرین و نائینسانی هەیە. بەڵام کاتێک ئەم دەستدرێژیکردنە دەکرێتە کارێکی ڕەمزی و ڕەهەندێکی ئیستاتیکی پێدەبەخشرێت ئیدی لە تەعەداکردن لە ئافرەتێکەوە دەگواسترێتەوە بۆ تەعەداکردن یان ئەتککردنی نەتەوە یان تایەفە یان ئاینی ئەو ئافرەتە، واتە کارە واقیعییەکەی ئەتککردن بەهەموو ناشیرینییەکانییەوە بارگاوی دەکرێت بە ڕەهەندێکی ڕەمزی کە مەبەستیەتی جەوهەری قێزەونی کارە واقیعییەکە دابپۆشێت. یاخود ماناکانی کوشتنی مناڵێک لە ئاستە ڕەمزیەکەیدا دەبێتە مانای کوشتنی ئایندەی ئەو مەسەلەیەی کە ئەو مناڵە دەبێتە ڕەمز و سیمبوڵی، یان کوشتنی پیرێک وەک ڕەمزی کوشتنی مێژوو و ڕابووردوو یان کوشتنی ڕۆشنبیرێک وەک ڕەمزی لێدانی قوتابخانە و ڕێبازێکی فیکری.

ئەمجۆرە لۆژیکە تایبەتەی بەکارهێنانی توندوتیژی لەسەرێکەوە تاوانە فیزیاییەکان دەشارێتەوە، یان لانیکەم دەیانکاتە ڕووداوێکی پلە دوو، لەسەرێکی دیکەوە ڕەهەندێکی ڕەمزی دەگرێتە خۆی، کە بە توندوتیژی مانای دیکە

دەبەخشێت. چەند ئەم مانایانەی توندوتیژی زاڵبن و چەندە عەقڵیەتی توندوتیژیی دۆست باڵادەستبێت، ئەوەندە شانسی ئامادەگی کۆمەڵگای مەدەنی کەمدەبێتەوە. ئەوەشمان لەیادنەچێت کە بەکارهێنانی توندوتیژی ماشێنی سەرەکی بەرهەمهێنانی ترسە، وەک پێشتریش باسمانکرد ترس و کۆمەڵگای مەدەنی دووانەیەکن ناکرێت پێکەوە کۆببنەوە.

### ٤ـ کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسەت

یەکێک لە کاراکتەرە گرنگەکانی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆبوونە، بەتایبەتی سەربەخۆبوونی فیکری و مەعریفی و ڕۆشنبیریی کە بەسەریەکەوە سەرزەمینی سەربەخۆبوون لە بیرکردنەوە و بڕیارداندا دروستدەکەن. لە ئاستێک لە ئاستەکاندا ئەم سەربەخۆبوونە مانای دوور ڕاگرتنی دەوڵەت و حیزب لە دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ و مۆنۆپۆڵکردنی فیکر و مەعریفە و ڕۆشنبیریی. لە ڕاستیدا سەربەخۆبوون لەو کایانەدا مانای ئەوەیە کە نابێت دەوڵەت و حیزب ببنە خاوەنی ئەو کایانە. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا فیکر و ڕۆشنبیریی و مەعریفە و کەناڵەکانی تەعبیر و دەربڕین لێیان ئازادن، دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی شوێنی گۆڕینەوەی بیر و بۆچوون و ئەرگومێنتی هەمەجۆر و جیاواز و ناکۆکن، لەم کایانەدا کۆمەڵگا لەوە تێدەگات کە لەهەناویدا هێز و دید و پرۆژە و مژدە و چاوەڕوانی جیاواز هەن و بەم تێگەیشتنەشی هەم خۆی وەک گشتێک و هەم هەر یەکێک لە هێزەکانی ناو هەناوی خۆی وەک هێزی سەربەخۆ، دەناسێت. بێگومان ئەم ئازدبوونە مانای ئەوەی نییە کە حیزب ڕۆشنبیر و کەناڵی تەعبیر و میدیای سەربەخۆی خۆی نەبێت، بەڵکو مانای ئەوەی کۆمەڵگا خاوەنی کەناڵی تەعبیر و ڕۆشنبیر و دەزگای سەربەخۆی خۆی بێت و بتوانێت لە گەروی جیاوازەوە و بە دەنگی جیاواز لە کێشە جیاوازەکانی بدوێت.

کۆمەڵگای مەدەنی کاتێک دەتوانێت هەم دەوڵەت و هەم هەموو ناوەندەکانی دیکەی دەسەڵات بە گۆڕانی بنەڕەتی ناچاربکات، کە ئازادبێت و کەناڵی خۆدەربڕینی ئازادیشی هەبێت. بەم مانایە کۆمەڵگای مەدەنی مانای دەرەنجامی ئیمزاکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگایەکی دیاریکراوە بۆ پەیمانێک کە تێیدا هەرهێزێک ئازادی و شەرعیەتی بوون و مافی گەشەکردن و مافی

هەڵبژاردنی شێوە ژیان و ئاکار و چێژی کۆمەڵایەتی و ئیستاتیکی هێزەکانی دیکە بسەلمێنێت.

لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هیچ هێزێک ناتوانێت بەناوی هەمووانەوە و لەباتی هەمووان بدوێت، کەسێک ناتوانێت وەک وەکیلی هەموو نەتەوە و هەموو کۆمەڵگا قسەبکات. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەر هێزێک لەچوارچێوەی ئەو پەیمانەدا کە دەبەسترێت، بەناوی خۆی و قازانج و داواکارییەکانی خۆیەوە دەدوێت. لەم چواچێوەیەدا یاسا و بەها و پێدراوەکانی ململانێ و کێبەرکێی کۆمەڵایەتی ئارام بە ئاشکرایی دەستنیشاندەکرێن و ئەو سنوورانەش دەکێشرێن کە هیچ کەس و هێزو لایەنێک بۆی نییە بیانبەزێنێت، چونکە بەبەزاندنیان ئیدی هەم ئاسایشی کۆمەڵایەتی و هەم بنەماکانی ئازادی و هەم چوارچێوەی پێکەوەبوونی ئارامی هێزەکان تێکدەچێت. کۆمەڵگای مەدەنی بەم مانایە کۆمەڵگای دروستکردنی لانیکەمی ئیجماعی کۆمەڵایەتییە لەسەر بنەمای ڕێکەوتنی بەرفراوانی هێزەکان لەگەڵ یەکدا. ئەمەش مانای دروستکردنی چوارچێوەیەکی یاسایی و سیاسی گونجاو بۆ کێبەرکێی کۆمەڵایەتی و دەستنیشانکردنی ئەو حەرامانەی کە هەمووان دەبێت ڕێزیبگرن، بۆنموونە ڕێزگرتنی پرنسیپی لانەدان لە یاسا و یەکسانبوونی هەمووان لەبەردمیدا.

لە دۆخێکی لەو بابەتەدا سیاسەت بریتییە لە دواهەمین دەرەنجامی گفتوگۆ و ململانێ و ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی نێوان بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا، نەک نەخشە و پلانی شاراوەی ناو ژوورە داخراوەکان، سیاسەت دەبێتە کارێکی گشتی و ئاشکرا و بەشێکی گەورەی کارەکتەری نهێنیکاری لەدەستئەدات، لە کار و پیشەی کەسێک یان چەند کەسێکی تایبەتەوە دەگۆڕێت بۆ کار و پیشەی هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان، لەبڕیاری سەرکردەیەوە دەگۆڕێت بۆ بڕیاری کۆمەڵگا. بەم مانایە فەلسەفەی سیاسی کۆمەڵگای مەدەنی خوازیاری تێگەیشتنێکی نوێییە بۆ کاری سیاسی کە سیاسەت تیایدا لە تاریکییەوە بگوازێتەوە بۆ ڕووناکی و لەناو ژوورە داخراوەکانەوە بۆ سەرجادە و لە سایکۆلۆژیای داخراوی سەرکردەکانەوە بۆناو گفتوگۆی کراوە و ئاشکرای کۆمەڵگا. ئەمەش خوازیاری شەفافیەتێکی بەرفراوانە کە تیایدا دیاربێت هێزە سیاسییەکان چۆن بیردەکەنەوە و چ پرۆگرامێکیان هەیە و چی ڕێکدەخەن و چۆن دەیکەن. ئەم فەلسەفە سیاسییە کە شەفافیەت بناغەکەیەتی بە کۆمەڵگای

مەدەنی هەلی چاودێریکردن و لێپرسینەوە و ڕەخنەکردنی سیاسەت و کاری سیاسی ئەدات، بەم کارەش کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هێزێکی گرنگ کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر چۆنیەتی بڕیاردانی سیاسی دەبێت. کەوابوو کە قسەمان لە کۆمەڵگای مەدەنی کرد مانای قسە لە شێوازێکی نوێی سیاسەت دەکەین، گەر ئەم شێوازە نوێییەی سیاسەتیش ئامادەنەبوو هەموو قسەکردنێک لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی دیماگۆگیەتێکی ئاشکرایە.

## ٥. کۆمەڵگای مەدەنی و حیزب

پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و حیزب پەیوەندییەکی ئاڵۆزە. حیزب بوونەوەرێکی سیاسییە و دەیەوێت دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست، لەکاتێکدا کۆمەڵگای مەدەنی هێزێکی دەزگایی و مەعنەوییە کە دەخوازێت چاودێری دەسەڵاتی سیاسی بکات. هەر لەسەرەتاوە لەنێوان ئەم دووانەدا پەیوەندییەکی ململانێئامێز هەیە. یەکێک لەو بیرۆکانەی کە مەترسی گەورەی لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی هەیە بیرۆکەی «تاکە حیزب» یان «حیزبی سەرکردە» یان حیزبێکە بیەوێت ئەوەندە گەورەببێت هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە و گەر بۆشیکرا بچێتە شوێنیشی. زۆرجاریش بیرۆکەی تاکەحیزب، یان بیرۆکەی حیزبی سەرکردە لەدایکبووی فەلسەفەییەکە نەیەوێت دەسەڵات بەشبکات، فەلسەفەیەک کە تۆتالیتاریزم دەخاتەوە و لەشوێنی جیاوازدا فۆرمی جیاوازی تۆتالیتاریانە دەگرێتە خۆی. بەبێ کەوتن و کۆتاییهاتنی ئەم بیرۆکانە، واتە بەبێ کەوتنی بیرۆکەی حیزبی سەرکردە و بیرۆکەی تاکە حیزب و بیرۆکەی حیزبێک بیەوێت هەموو کۆمەڵگا قووتبدات، زەحمەتە بتوانین قسە لە بوونی ڕاستەقینەی کۆمەڵگای مەدەنی بکەین.

«حیزبی سەرکردە» حیزبێکە لەسەر ژێردەستەیی حیزب و هێزەکانی دیکە دەژی، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە هێزەکانی دەرەوەی خۆی بکاتە بوونەوەری لاواز و بێرۆح و کاریکاتێری، بێمانا و بێکاراکتەر و بێدەسەڵاتیان بکات، خۆی بەسەرکردەی کۆمەڵگا بزانێت و ئەم سەرۆکایەتییەش بەهەموو شێوەیەک بسەپێنێت. ئەزموونی پارتە کۆمۆنیستەکانی جیهانی سۆسیالیستی و ئەزموونی بەعس لە عێراقدا ڕووە کارەساتاوی و کوشندەکانی ئەم مەسەلەیەمان نیشانئەدات. لەکوێدا حیزبێک بەناوی حیزبی سەرکردەوە ئامادەبوو لەوێدا هەلی

ئامادەگی ڕاستەقینەی هیچ هێزێکی دیکە لەئارادانییە، حیزبی سەرکردە نایەوێت و ناهێڵێت هیچ هێزێکی دەرەوەی خۆی بەو ڕادەیە گەشە بکات کە سەرکردایەتی ئەو بخاتە مەترسییەوە، بۆئەمەش ئامادەیە هەموو ڕێگایەک بگرێتە بەر، لەفشاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزییەوە بۆ دەستدرێژیکردنی سەربازی و گرتن و کوشتن و تیرۆر. ئەمەش لە جەوهەردا مانای قوفڵکردنی ئەو میکانیزمە سیاسی و کۆمەڵایتییانەی کە دەشێت گۆڕانی ڕاستەقینە بخەنەوە.

بیرۆکەی «تاکە حیزب»یش بیرۆکەیەکە بنەماکانی سیستمێکی دیکتاتۆری پایەداردەکات و دەیپارێزێت، لەپشتی بیرۆکەی تاکە حیزبەوە بیرۆکەی «تاکە سەرکردە» ئامادەیە، چەمکی «تاکە سەرکردەش» ڕەچەتەی دروستبوونی سیستمێکی دەسەڵاتگەر و دیکتاتۆری و ستەمگەرە. تاکە حیزب و تاکە سەرکردە نەک ناهێڵن دیموکراسیەت و کۆمەڵگای مەدەنی دروستبین، بەڵکو بنەماکانی سیستمێکی سیاسی دادەڕێژن کە ئەرکی یەکەم و هەرە گرنگی بێدەنگکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و بێدەنگکردنی هەموو دەنگێکی دەرەوەی حیزب و دەرەوەی سەرکردەکەیەتی.

حیزبێکیش بیەوێت هەموو کۆمەڵگا بخاتە ناو سنوورەکانی خۆیەوە حیزبێکە نە ڕێزی جیاوازییەکانی ناو هەناوی خۆی دەگرێت و نە ڕێزی جیاوازیی ئەو هێزانەش کە ئەو بە نوێنەری خۆیان نازانن و لەو ناچن و لە دەرەوەی ئەودا ئامادەن. تاکە حیزب چونکە تەماحی ئەوەی هەیە بەناوی هەموو کۆمەڵگا و کۆی هێزی جیاوازەکانییەوە قسەبکات، بۆیە حیزبێکی بێشووناسە. شووناس مانای دەستنیشانکردنی جیاوازییەکانی خۆت بەرامبەر بە جیاوازییەکانی ئەوانیدی، دەستنیشانکردنی هەڵوێست و بۆچوونی کۆمەڵایەتی خۆت بەرامبەر بە هەڵوێست و بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە. جا ئەگەر حیزبێک لە هەوڵی ئەوەدابوو هەموو هەڵوێستەکان و هەموو بۆچوونەکان لە هەناوی خۆیدا کۆبکاتەوە و هەمووشیان بە ئامادەگی سەرکردەیەکەوە ببەستێتەوە، ئەوکات نابێتە هەڵگری هیچ شوناسێک و لەڕاستیدا هیچ پرۆژەیەکیش. ئەمەیە وادەکات حیزبێک لەیکە کاتدا سۆسیالیست بێت و سەرمایەدار، عەلمانی و دینی، دیموکرات و ستەمگەر، ناسیۆنالیست و چینایەتی، هتد... ئەمەش لووتکەی بێشووناسی و بێپرۆگرامییە. ئەم بێشووناسییەش وا لەو حیزبە دەکات ببێتە دوژمنی هەر جۆرە شووناسێک کە لەگەڵ بێشووناسی ئەودا یەکنەگرێتەوە.

هەمــوو ئەمانەش بەسـەریەکـەوە دەیکەنە دوژمـنی کۆمـەڵگای مـەدەنـی و ڕێگر لەبەردەم دروسـتـبـوون و بەهێـزبوونیدا، چونکە هێزەکـانی کۆمەڵگای مـەدەنی هێـزگەلێکن لەسـەر بنەمـای شـووناسـی تایبـەتـی خۆیان دروسـتـدەبن و لـەسـەر بنەمای ئەم شووناسەش خۆیان ڕێکدەخەن و دەجوڵێن و دەدوێن.

بە کورتی کۆمـەڵگای مەدەنی تەنها لە غیابی بیرۆکەی تاکە حیزب و حیزبی سـەرکردەوە حـیزبێک هەمـوو کۆمـەڵگا قووتـبدات، دەتوانێت ڕێبـازە ئایدیۆلۆژی و فیکری و سیاسـییە جـیاوازەکـانی ناو هەناوی خۆی بناسـێت و سـەرزەمـینی خۆدەربڕینـی سـیـاسـی و فـەرهـەنگی و ئەخـلاقـیـشـیـان بۆ سـازکـات. حـیـزبی سـەرکردە مـانای نـاچارکردنی هەمـوو کۆمـەڵگا بە قـبوولکردنی هێڵـی گشـتیی ڕاڤەکردنەکـانی ئەو حیزبە بۆ دنیا و دیاردەکـان و تەسلیمبوون بە پێناسە و مانا و چاوەڕوانییەکـانی ئەو. ئەمەش لە پراکتیکدا مـانای ناچارکـردنی هەمو هێزێکی دیکە بـەوازهێنان لە دیدی خـۆی، یان لانیکەم لەو دیدانەی لـەگـەڵ بـۆچوونەکـانی حیزبی خۆ ـ بەسەرکردە ـ زاندا ناگونجێت. هەر بزاوتێکی سیاسی، کە هـەڵگری پرۆژەی کـۆمـەڵگای مـەدەنی بێت، دەبـێت بەردەوام لە هـەوڵی ئەوەدابێـت نەبێت بە هێـزێکی تۆتالیـتـێـر، لەپاڵ زۆر شـتـی تریشـدا دەەبێت لە هـەوڵی ئەوەدابـێت قەبارەکەی نە ئاوسێت و بچووکی خۆی لە بەرامبەر کۆمەڵگادا وەک هـەقیقەتێکی سۆسیـۆلۆژی قبووڵبکات. بێگومـان پاراستنی قەبارەی بچووکی حیزب و ڕێگرتن لە گـەشـەی سـەرەتانیـیـانەی و ڕێپـێـنەدان بە داگـیـرکـردنی کـۆمـەڵگا، هەم لە قـازانجی حـیـزب خـۆی و هـەم لە قـازانجی هێـزەکـانی دیکە و هـەم لە قـازانجی کـۆمـەڵگاشـدایە وەک گـشـتـێک. حـیـزب بەم کـارەی دەتوانێت بەرپرسـیـاریی کـۆمـەڵایەتی بەسـەر هەمـوو کـۆمـەڵگا و بەسـەر هەمـوو هێـزە جـیـاوازەکـاندا دابەشکـات، ئەو ئەرکـە لە کۆڵـی خۆی بکاتەوە کـە دەیکاتە تاقـە بەرپرسـیـارێک بەرامـبـەر بە ورد و درشـتـی ژیانی سـیـاسـی و کـۆمـەڵایەتی و کـولتـووری کۆمـەڵگایەک. یەکێک لە پێگە فەلسەفییە گرنگەکـانی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی دابەشکردنی بەرپرسـیـاریەت و دابەشکردنی دەسـەڵات و دابـەشکردنی تـوانای بڕیاردانە، هـەرهـێـزێکیش توانـای بڕیاردانی پێبـەخـشـرا بەرپرسـیـاردەبێت بەرامـبـەر بەو بڕیارانەی ئەیدات. دابەشکردنی بەرپرسـیـاریەت دەبێـتـە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆئەوەی کۆمەڵگا ئەو ئازادییەی دەستکەوێت کە بتوانێت خـۆی هـەڵبـژاردنەکـانی خـۆی دیاریبکات، نـەک حـیـزب یان سـەرکـردەیەک

لەسەرەوەڕا بەسەریدا بسەپێنێت، خۆی بڕیارەکانی خۆی بدات و بەرامبەریشیان بەرپرسیاربێت، نەک گروهێکی حیزبی بچووک بەرپرسیارکات. بێگومان پاراستنی بچووکی قەبارەی حیزب لە بەرامبەر کۆمەڵگادا کارێک نییە خۆبەخۆ ڕوودات، شتێک نییە حیزب لە ساتەوەختێکی ووشیارییدا بڕیاری لەسەربدات، جێبەجێکردنی ئەم داخوازییە پێویستی بە ستراتیژ و بەرنامە و خەباتێکی بەردەوام هەیە کە تێیدا گووتاری کۆمەڵگای مەدەنی بچێتە شوێنی گوتاری تاک حیزبی و گوتاری حیزبی سەرکردە و گوتاری حیزبێک بەناوی هەموو کۆمەڵگاوە بدوێت. دەسەڵات بۆ ئەوەی بە تەنها لە دەستی کەسێک، حیزبێک یان گروهێکدا کۆنەبێتەوە پێویستی بە دروستکردنی چەندان هێزی سەربەخۆ و چەندان میکانیزمی تایبەت هەیە کە نەهێڵن ئەم کارە ڕوودات. بەم مانایە گوتاری کۆمەڵگای مەدەنی خوازیاری ئەوەیە لە حیزب کە لە خەمی ئەوەدابێت لەدەرەوەی خۆیدا هێزی سەربەخۆ و ڕەخنەیی و جیاواز دروستببێت کە بتوانێت حیزب و سەرکردەکانی حیزب لەلادان و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و هەنگاونان بەرە و دیکتاتۆریەت بپارێزێت. لە هەلومەرجێکدا حیزب نەیهێشت و ڕێگربوو لەبەردەم دروستبوونی هێزی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ لەدەرەوەی خۆیدا، ناتوانین قسە لە پرۆژەی دیموکراسییەت و لەپێش هەمووشیانەوە لە پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی، بکەین. کۆمەڵگای مەدەنی شێوازێکی تایبەتی حیزبی سیاسی دەوێت کە بتوانێت کایەیەکی سیاسی دروستکات بەو مەرجانەوە کە باسمکردن.

## ٦. کۆمەڵگای مەدەنی و هەقیقەت

کۆمەڵگای مەدەنی ناتوانێت لە کۆمەڵگایەدا دروستببێت کە یەک پێناسی بۆ هەقیقەت هەبێت، یان یەک هەقیقەتی هەبێت بۆ دەستنیشانکردنی باش و خراپ، ڕاست و هەڵە، جوان و ناشیرین، دڵسۆز و خائین. هەر کەسێک، هەر لایەنێک، هەر حیزبێک گەر کەمەکێ ڕێزی خۆی و ڕێزی کۆمەڵگا و ڕێزی تاک و گروپەکان بگرێت، دەبێت ئەو ڕاستییە بسەلمێنێت کە هەڵگری بەشێک لە هەقیقەتە، نە خۆی و نە هیچ کەس و لایەن و نەهیچ هێزێکی دیکە هەموو هەقیقەتەکانی پێنییە. سەلماندنی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە گۆڕانی دید و وێناکردن و تێگەیشتنمان هەیە بۆ هەقیقەت. لێرەدا یەکەمین شتێک ناچارین وازیلێبهێنین

تێکەیشتنمانە بۆ هەقیقەت وەک پێدراوێکی بابەتی وەک شتێک لەدەرەوەی پەیوەندی ڕۆژانەی نێوان ئینسانەکان لەگەڵ یەک و لەگەڵ جیهاندا. هەقیقەت لە کۆمەڵگای مەدەنیدا «هەقیقەتێکی بابەتی» نییە، بەڵکو «هەقیقەتێکی دیالۆگییە»، شتێک نییە لەدەرەوەی بوونی ئینسان و کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی «بابەتی» ئامادەبێت و ئێمە بچین «بیدۆزینەوە»، بەڵکو شتێکە وەک دەرەنجامی دیالۆگی کۆمەڵایەتیی دێتەکایەوە. هەقیقەت نادۆزرێتەوە، بەڵکو «بەرهەمدەهێنرێت». لەم دیدەدا هەقیقەت لەدایکبووی پەیوەندی ڕۆژانە و کراوەی نێوان ئینسان و هێز و گروپە کۆمەڵایەتییەکانە، هەمیشە کاراکتەرێکی ناوکۆیی هەیە. بەم مانایە هەقیقەتی موڵکی نوخبەیەکی هەڵبژێردراوی دەسەڵاتگەری ئاینی و نائاینی نییە، موعجیزەیەک نییە تەنها سەرکردەیەک بیزانێت بەڵکو موڵکی هەموو هێز و تاکەکانی ناو کۆمەڵگایە. ئەم دیدە بۆ هەقیقەت یەکێکە لە پێداویستییە هەرە گرنگەکانی هاتنەکایەی کۆمەڵگای مەدەنی.

لەڕاستیدا ئاسایشی کۆمەڵایەتی و سیاسیش بە پلەی یەکەم وابەستەی سیاسەتی «بەرهەمهنان و دابەشکردنی هەقیقەتە». هەر کۆمەڵگایەک بخوازێت لانیکەمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی دابینکات و بەشە جیاوازەکانی لە پەیوەندییەکی هارمۆنیدابن لەگەڵ یەکدا، پێویستی بەوەیە بە بەشە جیاوازەکانی مافی بەرهەمهێنانی هەقیقەتی تایبەت ببەخشێت، یان سیاسەتی بەرهەمهێنانی هەقیقەت تێیدا بەڕادەیەک کراوەبێت کە بە خەیاڵ و ئیرادە و عەقڵیەتی هەر هێزێک لەو هێزانە پانتایی تایبەت ببەخشێت بۆ بەرهەمهێانی هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان کە دواتر لە پەیوەندییەکی دیالۆگئامێز و عەقڵانی و کراوەدا لەگەڵ هەقیقەتی هێزەکانی دیکەدا ئاڵوگۆڕیبکات، بەجۆرێک هەقیەتی کۆمەڵایەتی بالادەست هی هەمووان هی کەس نەبێت بەتەنها.

وەکچۆن سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سامانی نەتەوەیی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بنەمای مادییانەی ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی دادەڕێژێت، ئاواش سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی ماناکانی هەقیقەت بەسەر هێزە جیاجیاکاندا بنەما ویژدانی و ئەخلاقی و ڕەمزییەکانی هەمان ئاسایش مەیسەردەکات. ئەو پرسیارەی لێرەدا دەبێت لە خۆمانی بکەین ئەوەیە: هەقیقەت چۆن بەرهەمدەهێنرێت، ئایا نوخبەیەکی بچووک بەرهەمیدەهێنێت و بەسەر هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا دەیسەپێنێت، یاخود وەک ئەنجامی دیالۆگێکی گەورە و

کراوە و عەقڵانی نێوان ئەو هێزانە لەدایکدەبێت؟ شێوازی بەرهەمهێنانی کراوەی هەقیقەت شێوازێکی کراوەی دابەشکردنی هەقیقەتیش دێنێتەکایەوە کە تیایدا هەرهێزێک بڕێک لە عەقڵانیەتی دیالۆگئامێزی خۆی دەدۆزێتەوە و بڕێک لە ڕەگەزەکانی ئەو هەقیقەتەی بەرهەمهاتووە، بەردەکەوێت. ئەم دابەشکردنە دەبێتە سەرەتای دەرککردنی هەر لایەن و هێز و کەسێک بەو ڕاستییە سۆسیۆلۆژییە گرنگە کە هەرهێزێک هەڵگری جۆر و بەشێکی هەقیقەتە و دواهەمین هەقیقەتیش، واتە هەقیقەتی دەرەوەی بەشداربوونی ئینسان لەبەرهەمهێنانیدا، یاخود هەقیقەتی دەرەوەی دیالۆگ و ڕێککەوتن و ڕاگۆڕکێ، بوونی نییە.

بیرۆکەی دواهەمین هەقیقەت بیرۆکەیەکی مەترسیدارە، چونکە مەودایەک بۆ تازەبوونەوە و گۆڕان و پێداچوونەوەی شتەکان ناهێڵێتەوە،هەمیشە لەپشتی بیرۆکەی دواهەمین هەقیقەتیشەوە کۆمەڵە هێز و لایەن و کەسانێک هەن کە دەخوازن کۆی شتەکان مۆنۆپۆلبکەن. ئەوەی گوتی من هەڵگری دواهەمین هەقیقەتم هیچ مەودایەک بۆ ڕەخنە و گومان و پرسیارکردن ناهێڵێتەوە، ئەو بەم لافە تایبەتە داوای ئەوەمان لێدەکات هەموومان گوێڕایەڵی بین و ئەمر و نەهی و حوکمەکانی ئەو وەک شتێکی پیرۆز و بێپرسیار قبووڵ و پیادەبکەین. بۆیە یەکێک لە سەرەتا هەرە گرنگەکانی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە ڕەخنەکردنی ئەم سیاسەتە تایبەتەی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی هەقیقەت و گۆڕانی بنەما فیکری و سیاسی و ڕەمزییەکانی بەشێوەیەکی ڕیشەیی. گەر کەس و هێز و لایەنێکیش ویستی بەزۆر هەقیقەتێکی دیاریکراو وەک دواهەمین هەقیقەت بسەپێنێ، ئەوکات دەبێت لەو ڕاستییە سادەیە ئاگاداربین کە ئێمە لەبەردەم سەرەتاکانی بنیادنانی تۆتالیتاریزمداین و لە لە سادەترین پرنسیپەکانی دیموکراسیەت وفرەدەنگی و ڕێزگرتنی جیاوازی بەدوورین. لە فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنیدا هەقیقەتی باڵادەست بەرەنجامی گفتوگۆی مەعریفی و کۆمەڵایەتی و ئاڵوگۆڕی دید و ئەرگومێنت و ئاشکراکردنی بۆچوونە جیاوازەکانە، هەقیقەت لێرەدا جۆرێک لە ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی لەپشتەوەیە، شتێکی بەرهەمهێنراوە نەک دۆزراوە، لە گۆڕینەوەی ئەرگومێنتەکانەوە لەدایکدەبێت نەک مەسەلەیەکی سەپێنراو جارێک بە ناوی ئاینەوە و جارێک بە ناوی ئایدیۆلۆژیاوە و جارێکی دیکەش بە ناوی کاریزمای سەرۆکێکی دیاریکراوەوە. نەبوونی ئەم دیدە بۆ هەقیقەت مانای ئامادەگی بەردەوامی

ئەگەری شەڕی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەزهەبی، مانای ڕێگرتن لەهەموو گۆڕان و تازەبوونەوەیەکی مەعریفی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، مانای وێرانکردنێکی یەکجارەکی پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی.

هەموو ئەوانەی باوەڕیان وایە کە دواهەمین هەقیقەتیان پێیە، ئەوەی لەسەر ئەو خەیاڵەیە کە هەگبەکەی جگە لە هەقیقەت هیچی دی تیا نییە، ئەوەی پێمان دەڵێت ئێوە هەمووتان هەڵەن و من کە دەمم کردەوە دواهەمین هەقیقەت باسدەکەم، هێزێکە لە فاشیزمەوە نزیکە تا لە هەر شتێکی دیکە، هێزێکیشە ئامادەیە هەموو جۆرە ناشیرینییەک ئەنجامبدات بۆ سەپاندنی ئەو دواهەمین هەقیقەتانەی ئەو خۆی بەهەڵگریان دەزانێت. لەڕاستیدا هەموو ئەزموونە تۆتالیتێرەکانی جیهان لەو خاڵەوە دەستپێدەکەن کە هەڵگری دواهەمین ڕاستین و لەپێناوی پاراستن و پیادەکردنی ئەو ڕاستییەشدا هەمووشتێک حەڵاڵ دەکەن. نازییەکان و تاڵەبان لەم خاڵەدا وەک یەکن، بەعس و پۆڵ پۆت هەمان لۆژیکیان هەبوو.

کێشەی ئەو کەس و لایەن و هێزانەی پێیانوایە دواهەمین هەقیقەتیان پێیە، تەنها بەوەوە ناوەستێت کە هەڵگری ئەو هەقیقەتەبن بۆ کەسی خۆیان، واتە ئەم دواهەمین هەقیقەتە وەک دۆخێکی سایکۆلۆژی و ڕۆحی تاکەکەسی ئەزموون بکەن و بەرە و بێدەنگی و ئارامییەکی ڕۆحییان بەرێت. زۆرجار ئەم جۆرە عەقڵیەتە دەقریشکێنێ و دەم لە حەساسترین مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانەوە وەرئەدات و نەخشەی دادەنێت بۆ چۆنیەتی داڕشتنەوە و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو شتانە. ئەم جۆرە عەقڵیەتە پێیوایە کە چارەسەری یەکجاری و هەمیشەیی و هەتاهەتایی هەموو کێشەکانیشی پێییە، هەمووان دەبێت گوێ لەوان بگرن و فەرمایشتەکانیان جێبەجێبکەن. ئەم «هەقیقەت هەڵگرانە» کۆمەڵگا وەک پێکەوەبوونی کۆمەڵێک هێزی جیاواز و ناتەبا و ململانێکەر نابینن کە سود و قازانج و ویستی جیاوازیان هەیە، کە ڕابوورد و ئێستا و چاوەڕوانی ئایندەیی جیاوازیان هەیە، کە دیدی جیاجیایان بۆ هەقیقەت و جیهان و بوون هەیە. ئەم هەقیقەتدارانە ئینسانیش وەک بوونەوەرێکی هێرمۆنۆتیکی نابینن کە بەبەردەوامی شتەکان بەشێوازی جیاواز ڕاڤەدەکات. مرۆڤ لەم دیدەدا ماشێنێکی سەیری گوێڕایەڵییە بۆ ئەو هەقیقەتە گومان هەڵنەگرانەی ئەو بەڕێزانە هەڵگرین. لەڕاستیدا ئەم دیدە بۆ هەقیقەت ئینسان

بەتاڵ دەکاتەوە لە هێزی گومان و پرسیار و ڕەخنەکردن، کە جوانترین و شیعریترین و گرنگترین ڕەهەندەکانی ڕۆحی ئینسانن.

مێژووی سەدەی بیستەم نیشانیداین هەقیقەتگەراکان، ئەوانەی پێیان وایە دواهەمین هەقیقەتی ژیان و مێژوو و جیهانیان پێیە و لەڕێی پیادەکردنی ئەم هەقیقەتانەوە بەهەشت بۆسەر زەوی دادەبەزێنن، بەرپرسیارن لە دروستکردنی ئەو جەهەنەمانەدا کە ژینای دەیان ملیۆن ئینسانییان وێرانکرد.

## ٧- کۆمەڵگای مەدەنی و ڕۆشنبیران

کۆمەڵگای مەدەنی بەبێ جۆرێکی تایبەت لە زانیاریی و ڕۆشنبیریی و مەعریفە مەحاڵە دروستببێت، دەکرێت دوو ئاکاری سەرەکی ئەو شێوە زانیاری و مەعریفە و ڕۆشنبیرییە جیابکەینەوە کە بۆ هاتنەکایە و بەرقەراربوونی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستن: ڕەخنەییبوون و ڕێژەییبوون. ڕەخنەییبوون بەو مانایەی لە بەرامبەر ستراتیژەکانی بێدەنگکردن و دیسپلینکردن و بێمافیدا بێدەنگ نابێت، ڕێژەیبوونیش بەو مانایەی بە ناوی هەقیقەتێکی موتڵەقەوە نادوێت و بەناوی ئەو هەقیقەتەوە کەس بێدەنگناکات و دنیا و دیاردەکان بەشێوەیەکی سادە بۆ ڕەش و سپی و دۆست و دوژمن دابەشناکات. بێگومان ئەم سیستەمی زانیارییە سەرباری ڕەخنەیی و ڕێژەیی بوونی، زانیاری ناسینی هەر کەس و گروەو و دەستەو تاقمێکی فەرهەنگی و سیاسی و ئابووریشە بۆ ماف و ئەرک و ئازادی و بەرپرسیاری و سنوورەکانی خۆی و ئەوانیدیش. زانیاریی بەخشینی شووناسی جیاوازە بە هێزی جیاواز، زانیاریی پێناسی جیاوازە بۆ مەسەلەی جیاواز، زانیاریی کایەی جیاوازە بۆ کێشەی جیاواز. ئەوەشی ئەم گشتە ئاڵۆزە بەسەریەکەوە دەپارێزێت و بناغەکانی ئاشتییەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان گەمەکەرە جیاوازەکاندا فەراهەم دەکات، بوونی گووتارێکی سیاسی و حقوقی و ڕۆشنبیرییە کە جیاوازییەکان بسەلمێنێت و پانتاییەکی ئاشکرای تەعبیرکردن بەهەریەکێکیشیان ببەخشێت و یاسای دیموکراسییانە و کراوە بۆ ململانێی کۆمەڵایەتی فەراهەمبکات. لە دۆخێکی لەو بابەتەدا گەورەیی و بچوکی پانتایی تەعبیری هەر هێزێک لە هێزەکان وابەستەی بڕی ئامادەگی عەمەلی و عەقڵانیەتی کارکردن و توانای ئیدارەدانی ململانێکانی ئەو هێزە خۆیەتی لەناو

کۆمەڵگادا، نەک وابەستەی دەسەلات و زەبروزەنگی هێزێکی دەرەکی کە خۆی لە چوارچێوەی پاراستنی جیاوازیەکان بە گەورەتیر و گرنگتر و پیرۆزتر بزانێت.

کۆمەڵگای مەدەنی بەبێ بوونی ووشیارییەکی پتەو بە جیاوازی و مافی جیاوازبوون مەحاڵە. جیاوازیی ئەو ژێرخانە فیکری و ئەخلاقی و سیاسیەیە کە بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر دروستدەبێت. لەو کاتەدا کە تاکەکان و گروپەکان بەرامبەر بە جیاوازییەکانی خۆیان وشیاردەبن و دەشخوازن وەک شووناسی تایبەت بیانناسێنن و بیانپارێزن، مانای ئەوەیە ووشیاریشن بە جیاوازی هێزەکانی دیکە و سیتی ئەوانیش بۆ پاراستنی شووناس و ویست و چاوەڕوانییەکانی خۆیان. ووشیاریی بە جیاوازی ئەوانیدیکە ووشیاریە بە جیاوازی خود خۆی، شووناسی خود لە ڕێی شووناسی ئەویدییەوە دەستنیشاندەکرێت و ئەم هاوکێشەیەشە کە ژینگەیەکی ئارام بۆ پێکەوەهەڵکردنی شووناسەکان مەیسەردەکات. لێرەوە هەر گروهێکی کۆمەلایەتی و هەر تاکێک بۆ ئەوەی جیاوازییەکانی خۆی بسەلمێنێت و لەچوارچێوەیەکی یاسایی دیاریکراودا پیادەیانبکات، ناچارە پێشوەخت جیاوازییەکانی ئەوانیدیش بسەلمێنێت و ئەو مافانەیان بۆ بسەلمێنێت کە خۆی داوایان دەکات. بۆیە بوونی ڕۆشنبیری و کولتوورێک جیاوازی تیوریزە بکات و بەرگری لە ئیستاتیکا و چێژ و شێوەژیان و ئەخلاقیاتی جیاوازبکات، مەرجێکی سەرەکی دروستبوون و پتەوبوونی پایەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە.

ئەمجۆرە لە ڕۆشنبیر و کولتووریش پێویستی بەجۆرێک لە ڕۆشنبیر هەیە کە بەناوی موقەدەس و ڕاستی ڕەهاوە نەدوێت، پێویستی بە ڕۆشنبیرێک هەیە بەرگریکردن لە جیاوازیی بوبێت بە بەشێک لە جیهانبینی و بەشێکی گرنگی ئەو دەزگا فیکرییەشی پێبێت کە لە بیرۆکەی جیاوازییەوە لە کۆمەڵگا و سیاسەت دەڕوانێت.ئەم قسانە پروپاگەندەکردن بۆ ڕێژەگەرایی ڕەها نییە، بەڵکو بەگژاچوونەوەی ئەو ڕەهاگەرییەیە کە بەناوی هەقیقەت و سیاسەت و کولتووریی ڕەهاوە هەموو شێوەیەک لە شێوەکانی جیاوازی دەکوژێت. بەرگریکردن لە جیاوازیی مەرج نییە بمانکات بە ڕێژەگەرا، بەلام دەمانکات بە دوژمنێکی سەرسەختی موتڵەقگەرایی.

## ٨- کۆمەڵگای مەدەنی و کوفر

هەرگیز پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی پرۆژەی دروستکردن و بنیادنانی بەهەشت نییە لەسەر زەوی، بەڵکو پرۆژەی ڕێگرتنە لە دروستبوونی جەهەنەم. لەڕاستیدا پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی پرۆژەی وازهێنانە لە بنیادنانی بەهەشت و جەهەنەم لەسەر زەوی لەیەک کاتدا. بەبێ وازهێنان لە چەمکی بە بەهەشتکردنی کۆمەڵگا ناتوانین قسە لە کۆمەڵگای مەدەنی بکەین. پڕمەترسیترین دەسەڵات ئەو دەسەڵاتەیە کە بانگێشەی بنیادنانی بەهەشت دەکات و مژدەی ئەوەمان ئەداتێ کە لە جەهەنەمەوە بەرەو بەهەشت بمانگوێزێتەوە. هەموو مژدە و بانگێشەیەکی لەمجۆرە بەناو دەریایەک خوێنی ڕژاوی دوای تەکفیری ئاینی و تەکفیری ئایدیۆلۆژی و تەکفیری ئەخلاقیدا تێدەپەڕێت. مێژووی هاوچەرخ شایەتێکی ڕاستەقینەی ئەم مەسەلەیەیە.

ئەگەر هەقیقەت لە پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنیدا بەرهەمی دیالۆگ و ڕێکەوتنی کۆمەلایەتیی بێت، پێدراوێکی بابەتی پێشین نەبێت ئێمە تەنها بەدوایدا بگەڕێین و بیدۆزینەوە، بەهیچ جۆرێکیش ڕەها نەبێت، ئەوکات کێشەی گەورەمان لەگەڵ چەمکی «کوفر» دا بۆ دروستدەبێت. کوفر هێما بۆ بوونی هەقیقەتێکی ڕەها دەکات، کوفر مانای لادان لە هەقیقەتێکی بە موتڵەقکراو، لادان لە ڕاستییەک کە هێزێک لە هێزەکان وەک تاقە ڕاستیی مامەڵەی لەگەڵدادەکات و دەرەوەی ئەو ڕاستییەش بە سەرزەمینی کوفری تێدەگات. کولتووری کوفر کولتووری دروستکردنی سنووری گەورە گەورەیە کە بێدەنگکردن و بەندکردنی ئازادی دەخاتەوە. کوفر دێت بۆ کوشتنی هەموو ئەو فۆرم و مانا و لێکدانەوە و خەیاڵ و عەقلانیەتانەی، کە لەگەڵ خەیاڵ و مانا و عەقلانیەتی تەکفیرکەردا یەکناگرنەوە. کولتووری کوفر کولتوورێکی بەرفراوانە. هەم فۆرمی دینی هەیە و هەم فۆرمی عەلمانی، کوفر هەیە ئایدیۆلۆژییە و کوفری دی هەیە کۆمەلایەتیی و بەهائامێزە. بۆیە چۆن تەکفیریی دینی هەیە ئاواش تەکفیری عەلمانی هەیە، کەمنین، بۆ نموونە، ژمارەی ئەو نووسەرە مارکسیانەی لە ڕۆژگاری بالادەستی مارکسیزمی سۆڤێتی و سوونەتیدا تەکفیرکرابوون، یان ئەو دیدە ناسیۆنالیستانەی بەهۆی نەگونجانیان لەگەڵ دیدی بالادەستدا تەکفیر کرابوون. چەند زۆرن ژمارەی ئەو کوفرە ئەخلاقییانەی ئەمڕۆکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەم دینییەکان و هەم عەلمانییەکان لەسەری تەبان. ئوسولییەک چۆن نامەیەکی

دڵداری بە نامەی بێئەخلاقی یەکساندەکات، ئاواش عەلمانییەکانی لای ئێمە هەمان کار دووبارە دەکەنەوە. هەرجۆرێک لە جۆرەکانی تەکفیرکردن هێزێک یان چەند هێزێکی کۆمەڵایەتی لەپشتە، هەر یەکێکیش لەم هێزانە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی ژیان و مانایەک لە ماناکان و چاوەڕوانییەک لە چاوەڕوانییەکان حەرام دەکات.

لە ڕاستیدا لە کوێ باسی کوفر کرا لەوێدا هەقیقەتێکی بە ڕەها کراو هەیە حوکمدەکات یان تەماحی حوکمکردنی هەیە، بۆیە هەموو ئەوانەی ئامادەنین ئەو هەقیقەتە لەو فۆرمە موتڵەقەدا قبووڵبکەن بە کافر ناونووسدەکرێن. پەیوەندی نێوان کوفر و هەقیقەتی ڕەها پەیوەندییەکی سەبەبیە، واتە یەکێکیان سەبەبی بوونی ئەویدیکەیانە. مادامەکی شتێک هەیە ناوی هەقیقەتی ڕەهایە کەواتە لادان لەو هەقیقەتە هەڵە، تاوان یان کوفرە. لێرەوە کوفر و ڕەهایی هەقیقەت لەیەکدی جیاناکرێنەوە. کێشەکانی دروستکردنی ئەم پەیوەندییە سەبەبییە هێجگار زۆر و فرەڕەنگن، لەهەموویان ترسناکتر ڕووە دینی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کێشەیە. لە فەرهەنگی ئێمەدا کافربوون یەکسانە بە مافی نوخبەیەکی دینی بۆ سەندنەوەی مافی ئینسانبوون لە ئینسان، مامەڵەکردنی کەسی بە کافرکراوە وەک بوونەوەرێکی هەڵە تا سنووری سەندنەوەی مافی ژیان و کوشتن و لەناوبردن. کوشتنی ئینسانیش لەسەر قبووڵنەکردنی هەقیقەت و ئەخلاق و بەها باڵادەستەکان، جگە لەوەی دەستدرێژیەکی ناشیرین و سووکایەتییەکی گەورەیە بە ژیان، لەهەمانکاتاد ئیمزاکردنی مەرگی پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی و بانگێشەکردنی مەرگی دیموکراسییەتە. کۆمەڵگای مەدەنی قسە لە کۆمەڵگایەکی عەقڵانی ئازاد دەکات کە تێیدا تاک و گروهەکان خاوەنی هەڵبژاردنی ئازادن، سەربەخۆن لە باوەڕ و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنیاندا، بەپێی تێگەیشتنی خۆیان ماناکانی دنیا و سیاسەت و ئاین و ئەخلاق، لێکدەدەنەوە.

عەقڵییەتی تەکفیرکردن عەقڵیەتی کەسان و گروهگەلێکن بەناوی خوداوەند و دەق و موقەدەسەوە قسەئەکەن، لەکاتێکدا پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی پرۆژەی قسەکردنی ئینسانە بەناوی خۆیەوە بەتەنها، تەکفیرکەران توانا و عەقڵ و خەیاڵی خوداوەند دەبەخشن بەخۆیان لەکاتێکدا ئینسانی مەدەنی لە سنووری توانا و عەقڵ و خەیاڵی خۆیدا کاردەکات. هەربۆیە پرۆژەی هەموو ئەوانەی دەیانەوێت ڕۆڵی خوداوەند بەخۆیان ببەخشن و بەناوی یەزادانەوە و لەبری ئەو

تاوانباران و ناحەزان و کافران دەستنیشانبکەن، پرۆژەیەکە تا دواهەمین خەت دژ بە پرۆژەی بە مەدەنیکردنی ژیان و کۆمەڵگای مەدەنییە. لە فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنیدا جێیەک بۆ چەمکی کوفر و تەکفیرکردن نییە و ئەوەشی بەم چەمکانە بەرخوردبکات و بدوێت دەکەوێتە دەرەوەی ئەم پرۆژەیەوە.

### ٩- کۆمەڵگای مەدەنی و قوربانی

بیرۆکەی قوربانی لەڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە هاورێیە بە بیرۆکەی پیرۆزی و قسە لە بوونی موقەدەسێکی گەورەتر و گرنگتر لە کۆمەڵگا و گروە و ئینسانەکان دەکات. بیرۆکەی قوربانی، بەتایبەتی قوربانیدان بە ئینسان، هەمیشە چیرۆکی جۆرێک لە موقەدەس دەگێڕێتەوە کە گرنگتر و پیرۆزترە لە ژیان. هەمیشە لە پشتی فەلسەفەی قوربانییەوە باس لە موقەدەسێک دەکرێت کە بەهەر نرخێک بووە دەبێت بپارێزرێت، تێکەڵبوونی بەرفراوانەی موقەدەس و قوربانی و زەرورەتی پاراستن هەمیشە ماشێنێکی گەورەی بەرهەمهێنانی توندوتیژی دروستدەکات و کولتوور و جیهانێکی ڕەمزی دەخولقێنێت کە پێویستیان بە خوێنە بۆ مانەوە. قوربانی باس لە مەسەلەیەک دەکات گرنگتر لە ژیانی تاک و گروهەکان، مەسەلەیەک گرنگتر لە کۆمەڵگا و گرنگتر لە ژیان خۆی. هەموو ئەمانەش قبوولکردنێکی خۆبەخۆ و شادومانی مەرگ دەکەن و بەڕادەیەکی پڕ مەترسیش بەهاکانی ژیان بێرخ دەکەن.

بیرۆکەی قوربانی تا لەسنووری کۆمەڵێک سیمبۆل و سروت و کەشی ئاینی و بۆنەی جەماعی ڕەمزیدا بمێنێتەوە مەترسییەکانی کەمترە تا لەوەی ببێتە بەشێک لە چۆنیەتی قسەکردن و ئیشکردنی سیاسەت لەسەر کۆمەڵگا و ژیان و دنیا. لەڕاستیدا بیرۆکەی قوربانی تا وەک بیرۆکەیەکی ڕەمزی ئیشدەکات و لە قۆناغی سروتێکی کۆمەڵایەتی ناچێتەدەر مەترسیدار نییە، بەڵام کە بوو بە یەکێک لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی کاری سیاسی ئەوکات دەبێتە هێزی کوشتن و بەتاڵکردنەوەی ژیان لەهەر مانایەک و هێزی دروستکردنی جەهەنەمێکی سەرزەمینی. کاتێک ئەتیک و کولتووری سیاسی دەبنە ئەتیک و کولتوورێک بە زمانی قوربانیدان بدوێن، کاتێک سیاسەت داوامان لێدەکات بمرین، پایەکانی ئەخلاقی سیاسی لەسەر داواکردنی بەردەوامی خوێنی قوربانییدان دروستدەبن، ئەوکات لەبەردەم مەترسیەکی هەمەلایە و کوشندەداین. قسەکردنی سیاسەت بە

زمانی داواکردنی قوربانی بەردەوام مانای دروستکردنی مەسەلەیەکی پیرۆز کە هەم ئینسانەکان خۆیان و هەم کۆمەڵگا و هەم ژیان خۆشی دەکرێنە خزمەتکاری ئەو مەسەلەیە.

قوربانیش هەمیشە ناوی جیاجیای لێدەنرێت: قوربانی لە پێناوی قازانجی نەتەوەییدا، قوربانی لە پێناوی قازانجی کۆمەڵگادا، قوربانی لەپێناوی ئاسایشی کۆمەلایەتیدا، قوربانی لەپێناوی نیشتیمان و حیزب و سەرۆکدا، قوربانی لە پێناوی پاراستنی دیندا، قوربانی لەپێناوی بەها ڕەسەنەکەندا، قوربانی لە پێناوی سەروەرکردنی قسە و پەیامەکانی خودادا. ئەمانە و چەندەها ناوی دیکەی لەم بابەتە لەو قوربانیانە دەنرێن کە هەرجارە و بەشێوەیەک لە شێوەکان هەڵدەبژێردرێن. بێگومان هیچ سیاسەتێک نییە بێ تێگەیشتنێکی دیاریکراو بۆ قوربانی و بەبێ بەکارهێنانی چەمکی قوربانی بوونی هەبێت، تەنانەت بیرۆکەی «پەیمانی کۆمەلایەتی» خۆشی دەشێت بە زاراوەگەلی قووربانیدان و لەڕێی چەمکی قوربانییەوە بیخوێنینەوە، بۆ نموونە دەکرێت بڵێین لە «پەیمانی کۆمەلایەتیدا» تاکەکەس قوربانی بە بەشێک لە مافەکانی ئەدات لە پێناوی مسۆگەرکردن و بردنەوەی کۆمەڵێک مافی دیکەدا، یاخود قوربانی بە بەشێک لە ئازادییەکانی خۆی دەدات بۆ بەدەستهێنانی ئاسایش و سەلامەتی کۆمەلایەتی و بردنەوەی بەشەکانی دیکەی ئازدی. کەوابوو کێشەکە لە بوون یان نەبوونی چەمکی قوربانیدا نییە، کێشە لەوەدایە قوربانی ببێتە زمانی سەرەکی قسەکردنی سیاسەت لەگەڵ کۆمەڵگادا، سیاسەت وایلێبێت بەردەوام داوای قوربانیدان بکات و قوربانی بکاتە ستراتیژێک لە ستراتیژەکانی مانەوەوە و بەردەوامی خۆی.

ئەزموونی داواکردنی بەردەوامی قوربانیدان ئەوەمان فێردەکات لە کوێدا ئەم داواکارییە بوو بە زمانی سەرەکی قسەکردنی سیاسەت، لەوێدا شتێک دەپەرسترێت کە لە قازانج و ویستی نوخبەیەکی سیاسی بەرتەسک تێپەڕناکات. لە داواکارییەکانی سەرۆک و هاوڕێ و هاودەسەلاتەکانی ناچێت بەودیودا. ئەمەش لەزۆر ڕووەوە دووبارەبوونەوەی ئەو سیناریۆ دینییەیە کە تێیدا داوای قوربانیدان بە ئینسان یان بە ژیان دەکرێت لە پێناوی هێزێکی بان ئینسانیدا. بۆیە ناکرێت ئێمە بە زمانی قوربانی قسەبکەین و باس لە کۆمەڵگای مەدەنیش بکەین، ناکرێت حیزبێک یان کۆمەڵگایەک بە زمانی قووربانیدان لەگەڵ

ئینسانەکانیدا بدوێت، کەچی بشلێت من هەڵگری پرۆژەی بە مەدەنیکردنی ژیان و بە مەدەنیکردنی کۆمەڵگا و بە مەدەنیکردنی ئینسانم.

ئەگەر پیرۆزییەک هەبێت بشێت شایستەی کۆمەڵگای مەدەنی بێت، پیرۆزی ئینسانە وەک بوونەوەرێکی سەربەخۆی خاوەن ئیرادە و ڕێز و ماف، پیرۆزی ئەوەی کەس نەچێتە شوێنی خوداوەند و کەس بەناوی ئەوەوە حوکم بەسەر ئینسان و کۆمەڵگا و جیهاندا نەدات، پێویستی بە پیرۆزکردنی ژیان خۆی و دەستدرێژینەکردنە سەری.

# ئوسوڵیەت و ماناکانی

## ١- مانا گشتیەکانی ئوسوڵیەت

بەشێوەیەکی گشتی ئوسولیەت مانای گەڕانەوە بۆ ئەسڵێک کە لەسەرەتای سەرەتاکاندا ئامادەیە و بانگێشەی هەقیقەتێکی ڕەها و پیرۆز دەکات. ئەم ئەسڵە سەرەتای مێژوویەکی نوێیە و جەوهەری دەستپێکردنێکی تازە و پیرۆزە کە بەبێ گۆڕان سنووری سەدەکان و دنیاکان و مێژووە جیاجیاکان دەبەزێنێت و لە ڕابووردووەوە بازدەداتە ناو ئێستاوە و لە ئێستاشەوە باز ئەداتە ناو ئایندەوە. خەیاڵی ئوسوڵیەت خەیاڵی گێڕانەوەی حیکایەتی ڕۆژگارێکە کە سەرەتای هاتنەکایەی سەردەمێکی نوێیە، حیکایەتی کۆتاییهێنانی نورە بە جاهیلیەت، کۆتاییهێنانی زانینە بە نەزانین و کۆتاییهێنانی هەقیقەتە بە گومڕایی. ئوسلیەت بە ئایدیالکردنی ساتەوەختێکی تایبەتی مێژووە کە بەر لە هاتنەکایەی ئەو جیهان لە تاریکستانێکی نووتەک و پڕ گووناه و جەهلدا نووقم بووە. ئوسوڵیەت پێماندەڵێت سیفەتی سەرەکی ئەسڵەکان نەگۆڕی و پیرۆزی و بەردەوامبوونیانە، بەتوانابوونیانە لە تێکشکانی لۆژیکی کات و شوێن و هەلومەرجە جیاجیاکان و پەڕاندنەوەی مانا و پێانس و حوکمەکانیان بۆ هەموو سەردەم و قۆناغ و ساتەوەختە مەعریفییەکان. ئوسولیەت تەلاقدانی زەمەن و مێژوو و ڕەوتە کۆمەڵایەتی و کولتووری و شارستانییە جیاوازەکانە.

لە نەخشەکانی ئوسوڵیەتدا ژیانێک مانا و بەها و شوێنی ڕێزگرتن بێت هیچ ئەگەرێکی لەبەردەمدا نییە جگە لە تەسلیمبوون بەو ئەسڵانە و بە قبووڵکردنی یاسا و نرخ و حوکمەکانیان. پرسیارگەلی ئەوەی ئینسان چۆن بژی؟ کۆمەڵگا چۆن ڕێکبخرێت؟ ئەخلاق لەسەر چی بنیادبنرێت؟ پەیوەندی نێوان نێر و مێ چۆنبێت؟ دەوڵەمەند و هەژار چۆن لەگەڵیەکدا بجوڵێنەوە؟ دەوڵەت کێ بیبات بەڕێوە؟ دەسەڵاتداران چۆن هەڵبژێردرێن؟ هتد.. چەندان پرسیاری دیکەش، هەموویان لەلایەن ئەو ئەسڵانەوە یەکجار و بۆ هەتاهەتایە وەڵامدراونەتەوە. ئوسولیەت مانای بوونی وەڵامی حازربەدەست بۆ هەموو ئەو پرسیارانەی

ئینسان لە مێژوودا کردونی و هەموو ئەو پرسیارانەش ئینسان لە ئایندەدا دەیانکات.

ئینسانی ئوسوڵی ئینسانێکی مژدەبەخشە و یەکێک لە کاراکتەرە سەرەکییەکانی ئوسولیەت مژدەبەخشینە. هیچ دیدێکی ئوسوڵی نادۆزینەوە، چەند خەمبار و مەرگدۆست و ڕەشبینیش بێت، هەڵگری کۆمەڵێک مژدەی بەهەشتی نەبێت. ئوسوڵییەکان بەردەوام مژدەیەک دەدات بەگوێماندا و دەڵێن: گەر ئێوە گۆڕایەڵبن بۆ ئەسڵەکان و ژیانی خۆتان تەسلیم بە حوکم و یاسا و بەهای ئەسڵەکان بکەن، ئەوکات بە بەختەوەری هەمیشەیی دەگەن و ئارامییەکی نەمر دەبەنەوە.

لەپاڵ مژدەبەخشیندا ئوسولییەت بەردەوام هەڵگری هەڕەشەیەکی توندیشە. نوێنەرانی ئوسولیەت پێامن دەڵێن گەر ئەسڵەکانتان فەرامۆش کرد، گەر بەدەم داواکاری ئەسڵەکانەوە نەچوون، گەر پەیڕەوی ئەمر و نەژییەکانی ئەسڵە پیرۆزەکانتان نەکرد، ئەوکات جەهەنەم ئارامگەتانە. هیچ بزوتنەوەیەکی ئوسوڵی نادۆزینەوە هەڵگری سیاسەتی هەڕەشە و ترساندنێکی قووڵ نەبێت. ئوسولەیت لە چاپە عەلمانییەکەیدا هەڕەشەی لە بابەتی « یان سۆسیالیزم یان بەربەریەت دەکات.

ئەو خاڵەی سەرەوە بەرەو ئەوەم ئەبات پێ لەسەر ئەو خاڵە داگرم کە هەڵەیەکی گەورەیە پێمان وابێت ئوسوڵیەت تەنها دیاردەیەکی ئاینییە و تەنها هێزە دینییەکان دەتوانن ئوسوڵی بن. بەپێچەوانەوە ئوسوڵیەت لە دین فراوانترە و زۆر ئایدۆلۆژیا و دیدی عەلمانیش هەن کە دەشێن ئوسوڵی بن. بەم مانایە ئوسولیەت شێوازێکی دیاریکراوی بیرکردنەوەیە، جۆرێکی تایبەتی بەرخورد و تەماشاکردنی واقیع و ئینسان و کۆمەڵگا و مەعریفە و مێژووە، لەم بەرخوردەدا یاسای سەرەکی کارکردن گەڕانەوەیەکی بەردەوامە بۆ هەقیقەتێکی موتڵەق کە لە ڕابووردودا نیشتەجێیە، بۆ تێکستێک یان چەند تێکستێک کە هەموو زانیارییەکانیان تێدایە، بۆ هەقیقەتێک کە بووە بەژێر تەپوتۆزی مێژووەوە و جوڵەی زەمەن ئێمەی لەو دوورخستۆتەوە و گومڕای کردووین.

لەم ئاستەدا ئینسانی ئوسوڵی کەسێکە خۆی بە دۆزەرەوە و زیندووکەرەوەی ئەو تێکست و هەقیقەت و یاسایانە دەزانێت، خۆی بە بەرجەستەکەری ئەو

مەعریفە پیرۆزە دەزانێت کەلەو تێکستانەدا ئامادەن، ئەو ڕاستییەکانی ناو ئەو گەنجینە پیرۆزانە فێربووە و دەشیەوێت بە هەمووانی بگەیەنێت. بەم مانایە وەک چۆن ئوسوڵیەکی دینی ماناکانی ژیان و کۆمەڵگا و بوون بۆ ئەسڵە ئاینیەکان دەگەڕێنێتەوە، ئاواش، بۆ نموونە، مارکسییەکی ئوسوڵی هەموو ڕاڤەکردنەکانی دنیا لە کتێبی سەرمایەی مارکس و مانیفێستی کۆمۆنیستدا بەندئەکات و بەعسییەک هەموو مەعریفە کورتدەکاتەوە بۆ کتێبەکانی میشیل عەفلەق و ئەلیاس فەرەح و خوتبەکانی سەدام حوسەین. لەڕاستیدا ئوسوڵی ئەو پیاوەیە کە هەرگیز ناتوانێت تەماشای پێشەوە بکات و لەئاینده ڕابمێنێت، ئەو کەسێکە بەردەوام ئاوڕ لەدواوە ئەداتەوە، ئاوڕ لە کەس و تێکست و ڕووداوەکانی ڕابووردو و هەرئەوانیش دەکات بە پێوەری شتەکانی ئەمڕۆ و سبەینێ. لەم ئاستەشدا ئوسوڵیەت ترسە لە ئاینده و ئارەزوکوردنێکی عوسابیانەی گەڕاندنەوەیە بۆ ڕابووردوو.

**٢. ئوسڵیەت و هەقیقەت**

ئوسولیەت لەو خاڵەوە دەستپێدەکات کە دەڵێت دەبێت هەموومان یەک هەقیقەت قبووڵبکەین، هەقیقەت یەکە و نابێت بە چەند بەش وکەرت و ئاراستەیەکەوە. کەرتکەرتبوونی هەقیقەت ترسی هەرە گەورەی ئوسولیەتە، لەباتی فرە هەقیقەتی یان لەباتی تێگەیشتنی جیاواز بۆ یەک هەقیقەت ئەو باس لە یەک هەقیقەتی موتڵەقی بان کات و بان شوێن و میتافیزیکی دەکات. هەقیقەتێکە دەکرێت تەنها یەک شێوە و یەک مانای هەبێت کە شێوە و مانای کەسی ئوسولی خۆیەتی. بۆ سەلامدنی ئەم هەقیقەتەش نابێت لەدەرەوەی خۆیدا بەدوای سەلماندن و ڕاڤەکردنی گریمان و پێشداوەریەکانیدا بگەڕێین، ئەم هەقیقەتە پێویستی بە دنیای دەرەوە نییە بۆ سەلماندنی شەرعیەتی بوون و شەرعیەتی پەیڕەویکردنی، ئەزموونی مرۆڤی پێویست نییە بۆ پاسادانکردن. ئەم هەقیقەتە دەبێت وەک چۆنە وا وەریگرین و بێ پرسیار و بێ گوومان و بێ هیچ موحاکەمەیەکی عەقڵی قبووڵیکەین. ئەم هەقیقەتە لەباتی بیرلێکردنەوە و بەرخوردکردن لەگەڵیدا دەبێت ئیمانی پێبهێنین و تەواو.

ئاشکرایە ئەم سیاسەتی بەرهەمهێنانی هەقیقەتە بەتەواوی دژ بە سیاسەتی بەرهەمهێنانی هەقیقەتە لە سیستمێکی دیموکراسیدا، چونکە یەکێک لە گریمانە

گرنگەکانی سیستمی دیموکراسی ئەوەیە کە هەقیقەت پارچە پارچەیە و موتڵەق نییە، هەقیقەت شتێک نییە لە ئاسمانەوە دابەزیبێت، بەڵکو شتێکە سەرزەمینی و لەڕێگای عەقڵ و ئیدراک و هەستی ئینسانەوە ئەدۆزرێتەوە. هەقیقەت شتێکە ئینسان دەبێت لە گەڵ ئەوانیدیکەدا لەسەری ڕێکبەکەوێت، دیالۆگی لەسەربکات و وەک دەرەنجامی گفتوگۆیەکی زانستی و کۆمەلایەتی و سیاسی بێتەکایەوە. لەم دیدەدا هەقیقەت هەرچییەک بێت ڕاستییەکی ئەبەدی دەرەوەی ئینسان و دەرەوەی مێژوو و دەرەوەی کۆمەڵگا نییە.

ئوسوڵیەت لەسەر سەندنەوەی هەقیقەت ە ئینسان دەژی، باوەڕی بەوە نییە ئینسان بەرهەمهێنەر و بەکارهێنەری هەقیقەت بێت، سەرچاوەکەی لەناو عەقڵ و خەیاڵ و توانای بەرخوردی ئینساندا بێت. هەقیقەت لێرە و لەسەرزەوی و لەناو ململانێ و پێکدادانە زانستی و کۆمەلایەتی و سیاسییەکاندا بەرهەمنایەت، هەقیقەت بەرهەمی پەیوەندییەکانی دەسەلات و پەیوەندییەکانی مانا و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان نییە، هەقیقەت پێدراوێکی پیرۆزە و لە ڕابوردوودا بۆ یەکجار و هەتا هەتایە بەرهەماتووە. ئەوەشی لەم تێڕوانینە بۆ هەقیقەت لایدا، گومڕایە.

## ٣. ئوسوڵیەت و دەسەلات

ئوسوڵی کەسێکە پێمان ئەڵێت دەسەلات هی خەڵک نییە بەڵکو هی خودایە، هی کۆمەڵگا نییە بەڵکو هی ئەوانەیە کە نوێنەرایەتی خودا دەکەن، هی یاساکانی ئینسان نییە بەڵکو هی ئەوانەیە کە پێیانوایە یاساکانی خوداوەند پیادە ئەکەن، هی پەیوەندی نێوان ئیرادەی ئینسان و کۆمەڵگا نییە بەڵکو یاسای بابەتی گەشەکردنی مێژوو خۆین. لەم دیدەدا ئینسان مافی هەڵبژاردنی نییە چونکە شتەکان هەر لەسەرەتای سەرەتاکانەوە لەلایەن خوداوەندەوە دەستنیشانکراون. ئوسوڵی پیاوێکە دەسەلات لە مەسەلەیەکی ئینسانی و مێژووییەوە دەکاتە مەسەلەیەکی خودایی، لەدیاردەیەکی مێژووییەوە دەیکاتە دیاردەیەکی پیرۆز، لە باتی بە بوونەوەرێکی سەرزەمینی دابنێت دەیکاتە ڕۆحلەبەرێکی ئاسمانی. ئەم بە خوداییکردنەی دەسەلات وا لە ئوسوڵی ئەکات ببێتە هەڵگری پڕمەترسیترین پرۆژەی سیاسی و کۆمەلایەتی، وایلێدەکات بەدەیان سەرەداوەوە بە فاشیزم و تۆتالیتاریزمەوە ببەسترێتەوە. ئاشکرایە

دەسەڵات دیاردەیەکی ئینسانییە و هیچ پەیوەندییەکی بە خودا و بە ئیرادەی یەزدانەوە نییە. هەموو ئەوانەش کە باس لەدەسەڵاتی خودایی دەکەن خۆیان ئینسانن و لەڕاستیدا بەناوی خوداو دەقە پیرۆزەکانەوە بۆ مەسڵەحەت و سود و قازانجی تایبەتی خۆیان ئەدوێن. بەم مانایە ئەوەی لای پیاوێکی ئوسولی ئامادەیە پیرۆزڕاگرتنی خوداوەند نییە ئەوەندەی پیرۆزڕاگرتنی ئەو دەسەڵاتەیە کە ئەو بەناوی خوداوەندەوە داوای ئەکات.

لێرەدا دەسەڵات مەسەلەی سەردانەواندنێکی ڕۆحی بۆ خوداوەند و قبوولکردنی ڕۆحانیەتێکی یەزدانی نییە، بەڵکو مەسەلەی سەردانەواندنێکی سیاسیە بۆ ئەوانەی بەناوی خوداوە ئەدوێن. ئوسوڵیەت دەسەڵاتی خوداوەند، کە دەسەڵتێکی ڕۆحی و مەعنەوییە، دەگۆڕێتە سەر دەسەڵاتێکی سیاسی و دەیبەستێتەوە بە ئیرادەی سیاسی ئەو هێزە ئوسوڵیەوە کە ستراتیژیەتە سیاسیەکانی خۆی بەناوی پیادەکردنی فەرمایشتەکانی خوداوە پیادەدەکات. گۆڕینی ڕۆحانیەت بۆ سیاسەت یەکێک لە کاراکتەرە هەرە سەرەکییەکانی ئوسولیەتی سیاسییە.

مەترسی هەرە سەرەکی دەسەڵاتی ئوسولی لەوەدایە کە هەڵگری پرۆژەی سەپاندنی هەندەسەیەکی کۆمەڵایەتیە کە لەسەر لەناوبردنی جیاوازییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی و ئاینییەکان دەژی. لەناوبردنی ئەم جیاوازییانەش بۆئەوە نییە ئینسانەکان لەڕووی بەختەوەری و چێژوەرگرتن لە ژیانەوە یەکسانبن، چونکە ئەمەیان مەحاڵە، بەڵکو بۆئەوەیە لە ڕووی پیادەکردنی فەرمان و ویستەکانی ئوسوڵیەتدا یەکسان بن. ئوسولیەت گەر نەیتوانی جیاوازییەکان لەناوببات ئەوکات هەرەمێکی نایەکسان بۆ نرخاندنی ئەو جیاوازییانە پێشنیار دەکات. ئەم هەرەمە لەسەر بنەمای نایەکسانی ماف و نابەرابەری نرخەکان کاردەکات، موسڵمان لە ئەهلی زیمە لەپێشتر و پیاو لە ئافرەت گرنگتر و ئەهلی بەیت و پیاوانی دین لە خەڵکی سادە گرنگتر. بێدین و بێبڕواکانیش بۆ دەرەوەی کۆمەڵگا و گەر کرا بۆناو قەبرسانەکان. ئەم هەندەسە کۆمەڵایەتییە هەندەسەیەکی گشتگیرە و باز ئەدات بەسەر ئەو ڕاستییانەدا کە کۆمەڵگا شوێنگەیەکی فرە جیاوازی و فرە دەنگ و فرە باوەڕ و فرە کولتوورە و بە زەبری تەور و چەقۆ و تێزابیش ناکرێت ئەو جیاوازیانە بسڕدرێنەوە و بکرێن بەیەک.

**٤- ئوسوڵیەت و مێژوو**

تێزەی سەرەکی ئوسوڵیەت سەبارەت بە مێژوو تێزەی کۆتاییهاتنی مێژووە. مێژوو لە دیدی ئوسوڵیەتدا سەفەرێکە لە خاڵێکدا دەستپێدەکات و لە خاڵێکدا کۆتاییپێدێت، ئەو خاڵەی دەستپێدەکات خاڵی ڕەسەن و سەرەتای هەموو سەرەتاکانە و ئەو خاڵی کۆتاییەش کۆتاییەکی ڕەهایە. لەم دیدەدا جوڵەی مێژوو جوڵەی دوورکەوتنەوەیەکی بەردەوامە لە لە ئەسڵە ڕەسەنەکان، جوڵەی دورکەوتنەوەیە لەو کانگای یەکەمی ئیمان و ڕووناکی و درەوشانەوەیە. چەند لەم سەرەتایەش دوورکەوینەوە، چەند زەمەن بەرەوپێشەوەمان ببات ئەوەندە لەو موقەدەسە سەرەتاییە دووردەکەوینەوە کە لە جەوهەری ئەسڵەکاندا جێگیرە. ژیان تەنها لەسەرەتای سەرەتاکانا پاک و بێگەرد بووە، ئینسان تەنها لەوێدا ساتە زێڕین و ڕاستەقینەکانی خۆی ژیاوە، بۆیە لەدوای ئەم ساتەوە ژیان بریتیە لە پیسبوونێکی بەردوامی شتەکان، گۆڕان بریتیە لە بۆگەنبوونێکی بەردەوامی ئەخلاق، سبەینێ بریتییە لە کەمبوونەوەی پانتایی شتە جوانەکان، تێپەڕینی کات بریتیە لە نزیکبوونەوەی بەردەوام لە کۆتاییەکان. بە مانایەکی دیکە مێژوو لەدیدی ئوسوڵیدا بریتییە لە مێژووی هەڵە و لادان و خیانەتکردنی ئینسان لەو ئەسڵانەی لە دووری هەزاران ساڵەوە تەماشامان دەکەن، بریتییە لە دوورکەوتنەوە لەو سەرچاوە ڕەسەنە کە کانگای مانا و هەقیقەت و پیرۆزییە. مێژوو چەند درێژببێتەوە ئەوەندە زیاتر لە ڕاستی و هەقیقەت و پیرۆزیی دووردەکەوێتەوە، جوڵەی مێژوو جوڵەی هەقیقەت دوو ئاراستەی پێچەوانە و ناتەبا و ناکۆکیان هەیە. لەڕاستیدا دنیای ڕۆحی ئینسانی ئوسوڵی جەهەنەمێکی گەورەیە، ئەو بەچاوی خۆی جوڵەی مێژوو گۆڕانکارییەکان دەبینێت، دەبینێت دوێنێ لەمڕۆ ناچێت و سبەینیش لەمڕۆ جیاوازدەبێت، دەبینێت ژیان چۆن یاساکانی ئەو ئەسڵانە بەجێدێڵێت، دەبینێت ژیان لەناو ئایەت و سوورەت و فەتواکاندا بەندنییە. ئەو دەبینێت ئەو شارە ئاڵتوونییەی ئاین دەیەوێت دروستیکات دروستنابێت و ئینسان بەردەوام خیانەت لەسەرەتاگە و بەها و یاسای ئەسڵە پیرۆزەکان دەکات. ئەو هەموو ئەم شتانە ئەبینێت و بێتوانایە لە ڕاگرتنی جوڵە و ئاراستە و ناوەڕۆکەکانیان، ووشیارییەکی بریندار دەژی و وەک پیاوێکی تووڕە و نائومێد ژیانی خۆی بەسەردەبات، لەوکاتانەشدا کە دەیەوێت چالاکانە لەناو کۆی جوڵە مێژووییەکاندا دەستبەکاربێت، شتێک

لەدەرەوەی توندوتیژیدا نابینێت بۆ چاککردنەوە و ڕێکخستنەوەی شتەکان، یەکەمین شتێکیش لەم کارەیدا لەناوبردنی ژیانی خۆی و ژیانی کەسانی دەوروبەریەتی. لەم ڕووەوە ئینسانی ئوسوڵی تراژیدیاترین جۆری ئینسانە و زیندەگی ئوسوڵییانە زیندگیەکی پڕ مەراق و بێئۆقرەییە.

بەباوەڕی ئینسانی ئوسوڵی مێژوو یەک جەوهەری نەگۆڕی هەیە، یەک بازنەی داخرواى عەقیدە و باوەڕ بەڕێوەیدەبات، یەک هەندەسەی ئاینی کۆی جوڵە و ئاراستەکانی بەڕێوەدەبات. مێژوو دەبێت سەرزەمینی کووتومت بەرهەمهێنانەوەی جەوهەر و وێناکردنەکانی ئاین بێت بۆ دنیا. ئەم جەوهەرە ئاینیەیەش بەردەوام بە چەمکەکانی «ڕەسەنایەتی» و «خۆماڵیبوو» و شتی دیکەی لەم بابەتە ناودەبرێت. هەرچیەک بکەوێتە ئەو دیوی ئەو ئەسڵەوە، ناڕەسەن و خواستراو و بێگانەیە و بەجەوهەریش خراپە و خراپەش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، هەر ئەو ئەسڵە گریمانکراوە بناغەی هەموو شێوە جیاوازەکانی کولتوور و بەها و شارساتانیەتیشە، سەد دەر سەدیش جیاوازە لە «ئەسڵی» گریمانکراوی شارستانیەتەکانی دیکە و بۆ ماناوە و پاراستنی ئەم ئەسڵە یان دەبێت لەشەڕ و پێکدادانی بەردەوامدابێت لەگەڵ ئەو شارستانیەتە نامۆیانەدا، یان دەبێت سنوورەکانی خۆی وا دابخات کە لەهیچ کون و قوژبنێکلەوە بچوکترین توانای کارلێکردن نەتوانێت دزە بکاتە ژوورەوە. بەم مانایە ئوسوڵیەت دیدێکی کولتوورگەرایە، کولتوور دەکاتە بناغەی هەموو شتەکان. ئەو پێیوایە کولتوور بەرهەمهێنەری مێژوو و ڕووداو و دیاردەکانە، نەک بە پێچەوانەوە مێژوو بە بەرهەمهێنەری شێوە جیاوازەکانی کولتوور بێت. لای کولتوورگەراکان ئەوەی هەقیقەت و دیدی ئینسان و ناوەرۆکی ڕووداوەکان دەستنیشاندەکات ئەو پرنسیپە کولتووریانەن کە ئاین جەوهەرەکەیانە، ئەم پرنسیپانەش شتێک نین کۆمەڵگا بەرهەمینابهێنێت بەڵکو شتگەلێکن دەکەونە دەرەوەی کۆمەڵگا و دەرەوەی مێژوو و پەیوەندی ئاڵۆزی ئینسانەکان لەگەڵ یەکدا. کوولتوور لێرەدا دەبێتە سەرچاوەیەکی پێشین، سەرچاوەی یەکەم یان سەرچاوەی سەرچاوەکان، ئاین دەبێتە بوونێکی ئاسمانی پێشوەخت پێدراو، ئینسان و کۆمەڵگا جگە لە لەبەرکردنی ئەم جلوبەرگە پێشوەخت دووراوە هیچ دەربەستێکی دیکەیان لەبەردەمدا نییە. هەر هێزێکیش بخوازێت لەم پێدراوە کولتووریە پێشینە دەربازبێت ئەوکات مێژوویەکی ناڕەسەن و نامۆ و خواستراو بەرهەمدەهێنێت کە

پرنسیپە موقەدەسەکان دەکوژێت. کاری ئوسوڵی ئەوەیە ئەم کولتوورە بپارێزێت، نەهێڵێت کەس لە پرنسیپەپاکنی لابدات، سەرلەنوێ مێژووی کۆمەڵگا و پێکهاتە کولتوورییەکەی بهێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاست.

دۆخی سروشتی لای ئینسانی ئوسوڵی دۆخی پەیوەندی «برا دینییەکانە» لەگەڵ یەکدا، دۆخی بەهەشتێکی ونبووە کە تیایدا ئینسان و خوداوەند لە پەیوەندیەکی هارمۆنیدابوون لەگەڵیەکدا. لە دۆخی سروشتی ئینسانی ئوسوڵیدا سیاسەت و ئەخلاق غائیبن، چونکە ئینسان لە دۆخی تەسلیمبوونێکی سەرتاسەریدایە بە خوداوەندا و زیندەگی ئەو جگە لە پیادەکردنی ئارەزووەکانی خودوەندا شتێکی دیکە نییە. ئەم دیدە بۆ دۆخی سروشتی وادەکات ئوسوڵیەت بەردەوام ڕووی لە دواوەبێت و تەماشای بەهەشتێکی ونبوو بکات، بەردەوام هەڵگری پرۆژەیەک بێت کە کۆڵەکەکانی لەڕابووردودا چەقێندرابن.

بەم مانایە ئوسوڵیەت مانای پەرستنی مێژوو، بەڵام مێژوویەک کە لە سەرەتاکاندا دروستدەبێت و دوای ئەوە هێدی هێدی بزردەبێت. ئوسولەیت مێژوویەک دەپەرستێت کە نەماوە، غەیب بووە و لەناوچووە.

**٥. ئوسوڵیەت و ژیان**

وەک گوتمان لەدیدی ئوسولیدا مێژوو بریتیە لەجوڵەی دوورکەوتنەوەیەکی بەردەوام لە لە ئەسڵە ڕەسەنەکان، گۆڕان بریتیە لە بۆگەنبوونێکی بەردەوامی ئەخلاق، زەمەن مانای گەورەبوونی بەردەوامی سنوورەکانی خراپەکاری، بۆیە ژیان خۆشی بریتیە لە پیسبوونێکی بەردوامی ئینسان و کۆمەڵگا و ماناکان.

ئینسانی ئوسوڵی بۆئەوەی بتوانێت ئاسودەبێت، دەبێت هەوڵبدات ئەسڵەکان ببنەوە بە جەوهەری مێژوو و جەوهەری ژیان و جەوهەری هەقیقەت. بەلای کەسی ئوسوڵیەوە تا ئەو ئەسلانە حەرف بە حەرف پیادەنەکرێن ژیان جگە لە ونبوون و عەدەمیەت و بێمانایییەکی گەورە هیچیدی نییە. ئەو کە پێیوایە ئەو ئەسلانە سەرەتا و کۆتایی ژیانن، سەرچاوەی هەقیقەت و ماناکان و کۆتایی هەموو مەعریفەیەکن، غیابی ئەو ئەسلانە مانای ژیان لە غیابی هەر ڕاستییەک و هەر مانایەک و هەر مەعریفەیەکدا. ئەمەش بۆ خۆی جەهەنەمێکی سەرزەمینیە و لەڕووی ڕۆحییەوە عەزابێکی بێوێنەیە، بۆیە بەم مانایە ئینسانی ئوسوڵی

ئینسانێکی عەزابچێژە، عەزابچێژە چونکە هیچ هێزێک ناتوانێت دەستکاری ئەو ئەسڵانەبکات و جەوهەرە گریمانکراوەکەیان بگۆڕێت، چونکە ئەو ئەسڵانە بۆ هەموو سەردەم و ڕۆژگارێک دروستکراون و ئەبەدین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەشێک نین لەو جیهانەی ئەو تێیدا دەژی. غائیب بوونی ئەسڵە پیرۆزەکان لەدیدی ئینسانی ئوسوڵییەوە مانای ئەوەی ئەم ئینسانە لەناو هیچ زەمەنێکی مێژوویی ڕاستەقینە و بەرجەستەدا ناژی، لە ناو واقیعێکدا ناژی چوارچێوەیەکی بداتێ بۆ بەرهەمهێنانی مانا و شوناس، ئەو لە جیهانی نا ئامادەیی پرنسیپە مەزنەکاندا دەژی، ئەو لەناو ساتەوەختێکدا دەژی پڕە لە هەڵە و خیانەتی بەردەوام لە ئەسڵەکان. تەماشای هەر لەیەک دەکات لادان لەو ئەسڵانە ئەبینێت. ئەمەش دەیکاتە بوونەوەرێکی بێقەرار.

ئینسانی ئوسوڵی کاتێک دەتوانێت ئاسودەبێت کە مێژووی ئەمڕۆ جیاواز نەبێت لە مێژووی دوێنێ و هی دوێنێش لە مێژووی سەرەتای سەرەتاکان، کاتێک مێژوو ببێتە بەردەوامیەکی هەمەلایەنەی ساتەوەختی ئامادەگی ئەسڵەکان. لەو ساتەدا مێژوو لەوە دەرئەچێت کە بەردەوامی و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ڕابووردوبێت، ئیدی دەبێتە مێژووی بەرهەمهێنای جەهل و زیندوبوونەوەی جاهیلیەت، لەهەمانکاتیشدا دەبێتە مێژووی نارەحەتییەکی لەڕادەبەدەری ڕۆحی بۆ هەموو ئەوانەی بەتەنگی ئامادەگی هەمەلایەنی ئەسڵەکانەوەن. بەبۆچوونی من بەشێکی گەورەی بنەما سایکۆلۆژیەکانی توندوتیژی ئوسوڵی لەم نائومێدی و خاڵیبوونە ڕۆحیەدایە. ئینسانی ئوسوڵی هەست بەوە دەکاتە لە جیهانێکی بێرۆحدا دەژی، هیچ شتێک ڕۆح و بەها ڕۆحییەکانی تێدا نەماوە و جیهان لە عەدەمیەتێکی ڕەهادا نووقمە. لە هەلومەرجێکی ڕۆحی وادایە گووتاری سیاسی و کولتووری ئوسوڵی فۆرمی گووتاری ڕزگارکردنی مێژوو و ڕزگارکردنی کۆمەڵگا و ڕزگرکردنی ئینسان دەگرێتە خۆی. بێگومان ڕزگارکردن لە مێژوویەک کە نارەسەنە، لە کولتوورێک کە نامۆیە و لە ئەخلاقێک کە هێلانەی بەدئەخلاقییە. ئەم گووتاری ڕزگارییە چوونکە گووتاری گەڕاندنەوەیە بۆ ئەسڵێکی ڕەها دەبێتە گووتاری پەرستنی یەک هەقیقەتی ڕەها کە لەو ئەسڵە ڕەهایەدا بەرجەستەیە، ئەمەش مانای سڕینەوەی کۆی جیاوازییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئەخلاقییەکان و سەپاندنی یەک ڕەنگ بەسەر هەمووواندا. ئەمەش پرۆژەیەکی تۆتالیتارییە کە بە ناچاری دەبێتە پرۆژەی

بەکارهێنانێکی بەرفراوانی توندوتیژیی بۆ سەپاندنی ئەو ڕەنگەی دەبێت ببێتە تاقە ڕەنگ. بەم مانایە ئوسوڵیەت مانای تەلبەندکردنی ژیان لەو سنوورانەدا کە دەقەکان و فەتواکان و ئەسڵەکان دەستنیشانیدەکەن و کوشتن و شاربەدەرکردنی هەر شتێک لەگەڵ ئەوانەدا یەکنەگرێتەوە.

# ئایا جوندول ئیسلام کۆمەڵێک ڕێبوار و کۆچبەری ئاینی و ئایدیۆلۆژین؟

## ١- لۆژیکی هەڵبژاردن لەنێوان دوو تاریکیدا

یەکێک لە تراژیدیاکانی دوای یازدەی سێپتێمبەر لەوەدایە کە هەوڵدانێکی بەردەوام لە ئارادایە بۆ دروستکردنی جۆرێک لە ووشیاری کە ناچاربێت لەنێوان ئوسامە بن لادن و جورج بوش دا، لەنێوان ڕژێمی تاڵەبان و سیاسەتی ئەمریکیدا، لەنێوان توندڕەوییەکي سەربازی و توندڕەوییەکی ئاینیدا یەکێکیان هەڵبژێرین. بوش داوامان لێدەکات وەک درێژکراوەی ڕۆشنگەری و پارێزەری شارستانیەت و مەهدی مونتەزەری دیموکراسیەت ببینین، ئوسامە بن لادنیش دەخوازێت وەک درێژکراوەی عەدالەتی ئیسلامی و ڕۆحانیەتی ڕۆژهەڵاتی و مانا قووڵەکانی ئیمان وێنابکەین. ئەگەر خۆمان بە ڕۆشنگەر بزانین، وا چاوەڕوان دەکرێت دڵمان بە هێرشی ئەمریکی بۆسەر تالەبان و کەمپەکانی ئوسامە بن لادن خۆشبێت و ئەوە لەیادبکەین کە ئەمریکا خۆی بە ئەندازەیەکی زۆر دروستکەر و گەورەکەر و بەهێزکەری ئەم پیاوە و ڕژێمی تالەبان و چەندان گروپی تیرۆریستی و ڕژێمی دیکتاتۆریی لەم بابەتەیە. ئەگەر خۆشمان بە ئوسوڵی و ئیسلامگەر و ئیماندار بزانین واچاوەڕوان دەکرێت بەدەنگی داواکارییەکانی بن لادنەوە بچین و ئەم پیاوە ترسناکە بە نوێنەری ئاینێک بزانین کە زیاد لە ملیارێک ئینسان باوەڕیان پێیەتی. ئەم لۆژیکی هەڵبژاردنە لەنێوان دوو هێزی تاریکی دژ بەیەکدا لۆژیکێکی ناڕاست و پڕمەترسییە و ناهێڵێت لە سەرچاوە و هۆکار و مانای ڕووداوەکانی ئەم دواییە تێبگەین. یەکێک لە کارە هەرە گرنگەکانی ڕۆشنبیران بەرگریکردنە لە دروستبوون و سەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئەم لۆژیکە دوو لایەنە.

من خۆم پڕبەدڵ حەز بە کۆتایی ڕژێمی تاڵەبان و کۆتایی ئوسامە بن لادن و کۆتایی هەموو ئەو هێزە ئوسولیانەی دیکەش دەکەم کە لەسەر هەمان مۆدێل و هەمان نەزم و هەمان شێواز بیر لە ئینسان و کۆمەڵگا و سیاسەت دەکەنەوە،

تەواو لەو باوەڕەشدام هەنگاوی یەکەمی هەر گۆڕانێکی ڕاستەقینە و ئینساندۆستانە لە جیهانی ئیسلامدا بەسەر گۆڕی ئەو ئەزموونە تاریەکەی تاڵەبان و هاوشێوەکانیدا تێدەپەڕێت. بەبێ کۆتاییهاتنی تاڵەبان و کۆتاییهاتنی ئەو وەحشیگەریەتەی ئەم مۆدێلە تایبەتەی ئیسلامی سیاسی پیادەی دەکات، ناکرێت بیر لە هیچ ئەلتەرناتیڤێکی ماقوڵ بکەینەوە. بەڵام هەموو ئەم ئارەزو و ویست و تێڕوانیانە ئەو ڕاستییانە ناشارنەوە کە جیهانی ئەمڕۆ لەزۆر ڕووەوە جیهانێکی تاریک و نا ئینسانی و نایەکسانە و هێلانەیەکی لەبارە بۆ دروستبوونی هێزی تاریکی وەک تاڵەبان و هاوشێوەکانی. لێرەوە ڕەخنەگرتن لە تاڵەبان و لەو تاریکییەی ئەم ئەزموونە توندڕەوە دەیخاتەوە، بە ڕەخنەکردنی ئەو جیهانە دەستپێدەکات کە هێزی وا دروستدەکات. لەباتی قسە وتن بە ئاین دەبێت قسە بەو واقیعە بڵێین کە ئەم شێوازە لە ئاین بەرهەمدەهێنێت.

ئەگەر لە ئاستی نێودەوڵەتیدا ئیشکالیەتی هەڵبژاردن لەنێوان بوش و ئوسامە بن لادندا هەلومەرجێکی تراژیدی بۆ هێزە دیموکراس و ئینساندۆست و گۆڕانخوازە ڕاستەقینەکان دروستکردبێت، ئەوا ڕووداوەکانی ناو کوردستانیش هەمان دوو ڕیان و تەڵەزگەی مێژووییان بۆ خەڵکی کوردستان دروستکردوە. لە کوردستاندا هەلومەرجێک بەرهەمهاتوە دەبێت لەنێوان جوندول ئیسلام و ئەو هێزانەی کە بەگژیاندا دەچنەوە لایەنێکیان هەڵبژێرین. خەڵک بە لۆژیکێکی دوو لایەنە گەمارۆدراون و ناچارکراون یەکێک لە جەمسەرەکانی ئەو دوو لایەنە هەڵبژێرن. بێگومان مەسەلەی هەڵبژاردنی لایەنەکان لە کوردستاندا زەحمەت نییە، جوندول ئیسلام کۆپییەکی کوردییانەی هێجگار خراپی ئەزموونی تاڵەبانە و یەکەمین خۆناسندیشیان لەڕێگای دروستکردنی قەسابخانەیەکی ترسناکەوە بوو. ئەوەی کەمەکێک ڕێزی خۆی و ڕێزی ئەویدی و ڕێزی ئەو پرنسیپە سادەیە بگرێت کە ژیان وەک پیرۆزترین پێدراوێکی سەر زەمینی دەبینێت، نەفرەت لەو کارە دەکات جوندول ئیسلام ئەنجامیدا. بەڵام سەرەڕای ئەم ڕاستییانە ئەو مەسەلەیەی کە نابێت لەیادیبکەین ئەو ڕاستییەیە کە کێشەکان بەم هەڵبژاردنە کۆتاییان نایەت. جوندول ئیسلام کۆمەڵێک ڕێبوار و کۆچبەری ئاینی و ئایدیۆلۆژی نین و بەهەڵە ڕێیان نەکەوتۆتە شاخەکانی هەورامانەوە، بە پلەی یەکەم جوندول ئیسلام منداڵی ئەو هەلومەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەن کە لە دەساڵی ڕابووردودا لە کوردوستاندا بەرهەمهاتووە. لەمەشدا

بەتەنها سیاسەتی پڕ هەڵەی حیزبە سیاسییە باڵادەستەکان و حیزبە بچووکە کارتۆنی و نیمچە کارتۆنییەکان بەرپرسیار نین، بەڵکو کۆی ئەو تەپڵژەن و ئیعلامی و نیمچە خوێندەوار و نیمچە ڕۆشنبیرانەش بەرپرسیارن کە بە ئاراستەی لاوازکردن و بەگژاچوونەوە و سوککردنی هەر جۆرە ووشیارییەکی ڕەخنەیی ڕاستەقینە کاریانکردوە و لەنێوان فیکر و واقیعی ئێمەدا دیوارێکی گەورەیان دروستکردوە.

تەواو وەکچۆن هەڵگرانی ووشیاری ڕەخنەیی لە ڕۆژئاوادا بە تەبریر و حیکایەتەکانی بوش و ئوسامە بن لادن ڕازینین، ئاواش ووشیاری ڕەخنەیی لە کوردستاندا نابێت بە حیکایەتەکانی جوندول ئیسلام و حیکایەتی ئەو هێزانەی بەگژیاندا دەچنەوە ڕازیبن. ئەمڕۆ زیاد لەهەمووکات پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی ورد و ڕەخنەیی ئەو هەلومەرجە سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوورییەیە کە جوندول ئیسلامی دروستکردوە، پێویستمان بە دەربڕینی نارەزاییەکی کۆمەلایەتی و مەدەنیانەش هەیە بەرامبەر بەو هەلومەرجەی هێزی لەبابەتی جوندول ئیسلام هەڵدەهێنێ.

**٢- سێ ڕاستی مەنهەجی**

بەر لەوەی بەشێک لە کارەکتەری ئەو جیهانە دەستنیشانکەم کە جندول ئیسلام دروسدەکات، دەمەوێت سێ ڕاستی مەنهەجی دەستنیشانکەم بۆ دیاریکردنی ئەو چوارچێوەیەی لەناویدا مەسەلەکان لێکبدەینەوە:

١- وەکچۆن ئوسامە بن لادن و تاڵەبان لەنێو دێڕەکانی قورئانەوە نەهاتوون و لەوێوە بە قەڵەم بازێک نەپەڕیونەتەوە بۆ ناو ڕووداوەکانی سەدەی بیست و یەکەم، ئاواش جوندول ئیسلام لەناو دێڕ و پەرەگراف و نوقتە و فاریزەکانی قورئانەوە نەهاتوون تا لە هەورامانا نیشتەجێبن. ئەگەر ئوسامە بن لادن و ڕژێمی تاڵەبان و ئوسولیەتی ئاینی بەرهەمی هەلومەرجی کۆمەلایەتی و سیاسی کولتووریی نالەباری سەردەمانی جەنگی سارد و ململانێی نێوان زلهێزەکان و هەلومەرجی دەوڵەتە دیکتاتۆری و مشەخۆر و خێڵەکییەکانی دنیای عەرەبی بن، ئاواش جوندول ئیسلام بەرهەمی هەلومەرجی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووری

ناوچەیی ئەم دە ساڵەی دوایی کوردستان و ئەو هێزانەن لە کوردستاندا دەسەڵاتداربوون.

٢ـ جوندول ئیسلام نێردراوێکی ئەفغانی و عەرەبی و نازانم کوێیی دیکە نین و لەدەرەوەڕا بۆ کوردستان نێردرابن، وەک گوتاری بێفیکر و کەمخوێنی ڕاگەیاندنی حیزبی لە کوردستاندا پێشنیاریدەکەن. جوندول ئیسلام بەرهەمی کۆمەڵگای کوردی و ئەو شێوازی سیاسەت و ئیدارە و حوکمکردنەیە کە دەساڵە لەو کۆمەڵگایەدا دەستبەکارە. بۆ تێگەیشتن لە پەیدابوون و بەهێزبوون و تەشەنەکردنی ئیسلامی سیاسی بەگشتی و جوندول ئیسلام، وەک توندڕەوترین دەرکەوتی، لە کوردستاندا دەبێت تەماشای ئەو مێژووە ناشیرینە بکەین کە هێزە سیاسییەکانی ئێمە لە دە ساڵی ڕابووردودا بەرهەمیان هێناوە.

٣ـ وەکچۆن لەڕەگوریشە هەڵکەندنی تیرۆر لە ئاستی نێودەوڵەتیدا پێویستی بە دەسکاریکردنێکی ڕادیکاڵ و ڕیشەیی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و ئەخلاقییە هەیە کە بەشە جیاوازەکانی جیهان بەیەکەوە گرێدەدات و پێویستی بە کۆتایهێنانە بەو نایەکسانی و ناعەدالەتییە گەورەیەی لەنێوان بەشە جیاوازەکانی جیهاندا ئامادەیە، ئاواش کۆتاییهێنان بە توندڕەوی ئاینی و تیرۆری هێزە دینی و نادینییەکان لە کوردستاندا پێویستی بە دەسکاریکردنێکی گشتی و ڕیشەیی کۆی ئەو عەقڵیەتە سیاسی و ئیعلامی و ئیداری و ڕۆشنبیرییەیە کە دەساڵە واقیعێک بەرهەمدەهێنێت کە یەکێک لە ناشیرینترین بەرهەمەکانی جوندول ئیسلامە.

### جوندول ئیسلام و دنیای کوردی دوای ڕاپەڕین

بەڵام داخۆ کارەکتەرەکانی ئەو دنیایە چین کە جوندول ئیسلام دروسدەکات؟ جوندول ئیسلام لە چ هەلومەرجێکی تایبەتیدا دروستبوون و بەم ئاستەی ئەمڕۆیان گەیشتوون؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەوڵئەدەم لێرەدا ئەم چەند تەورە سەرەکییە دەستنیشانکەم. ئەم دەستنیشانکردنە سەرەتاییەش پێویستی بە پەرەپێدان و خوێنەنەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە:

١ـ یەکێک لە کاراکتەرە سەرەکییەکانی ئەو جیهانەی حیزبە کوردییەکان لە دە ساڵی ڕابووردودا دروستیانکردوە زاڵکردنی لۆژیکی حیزبە بەسەر هەر

لۆژیکێکی دیکەی بان حیزبیدا. ئەم لۆژیکەش لەباتی ئەوەی لۆژیکێکی کۆمەڵایەتی کراوە و نەتەوەیی و چەندڕەهەند بێت، لۆژیکێکی گروپگەری و داخراوە و جیهان و کوردستان و ڕووداوەکانی کۆمەڵگای ئێمە لە دیدێکی ناوچەیی و بەرتەسکی حیزبییەوە دەبینێت و مامەڵە دەکات. شەڕی ناوخۆ و ئەو ئاشتییە نیوە مردو و نیوە زیندووەی دوای ئەو هەموو ساڵە لە ئازادی و تەنانەت دوای شەڕەکانی جوندول ئیسلامیش لەئارادایە گەورەترین بەڵگەی سەلماندنی ئەو ڕایەیە کە ئەم حیزبانە کوردوستان وەک ماڵێکی حیزبی تەماشادەکەن و ئامادەنین هیچ ڕەهەندێکی نەتەوەیی بەم ماڵە بدەن و لەسەر بنەمای قازانج و دەسکەوتی گشتی لەناوەوەڕا ڕێکیبخەنەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە بۆ هەمووان ئاشکرایە کۆمەڵگای ئێمە لەبەردەم سیاسەتی دوو هێزدایە کە شەڕ بەشێکی گرنگی ئەو پەیوەندیانەن بەیەکیانەوە گرێدەدات و بەشێکی گەورەی ئەو مێژووە تاریکەشە کە ڕۆژگارێکی درێژە لە کوردستاندا بەیەکەوە کۆیکردونەتەوە. هیچ کاتێک ئەم دوو هێزە ئاشتیەکی مەحکەم و شوێنی باوەڕ و متمانەپێکراویان پێکەوە نەبووە و لەم دە ساڵەی دواییشدا ژمارەی ئەو کەسانەی ئەم دوو هێزە لەشەڕی ناوخۆدا بە کوشتیان داوە، دەیان و سەدان جار گەورەترە لەوەی جوندول ئیسلام کوشتوونی. ئەم دوو هێزە خاوەنی کولتوورێکی سیاسی توندوتیژ و خوێنین، خاوەنی کەلەپوورێکن لە ئەککردن و سوکایەتیکردن بە یەکدی و هیچ جۆرە شەڕێک نەماوە لەگەڵ یەکدا نەیانکردبێت. لەهەمووشی کوشندەتر ئەوەیە ئەم دوو هێزە تا ئێستاش پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەیانەی بەم مێژووە تاریک و کولتوورە سیاسییە خوێناویەدا نییە و هەوڵی دامەزراندنی بنەمایەکی یاسایی و دەزگایی و بان حیزبیان نەداوە بۆ کۆتاییهێنان بەم دۆخە. ئەمڕۆ بەهیچ مانایەک بناغەکانی داڕشتنی ئاشتییەکی پتەو و جێی متمانە لە کوردستانە ئامادە نییە. ئەم دوو هێزە لەم دە ساڵەی ڕابووردودا یەک هەڵبژاردنی پەرلەمانیان ئەنجامداوە، بەڵام خاوەنی شەش حەوت شەڕی ناوخۆیی گەورەن و لە ئێستاشدا هیچ ڕێگرێکی یاسایی و دەزگایی و دەستوری لە ئارادانییە ڕێ لەوە بگرێت لە وەرزی داهاتوودا شەڕی خوێنینی دیکە نەکەنەوە. ئەم دۆخەش نەک داڕشتنی بناغەیەکی پتەو نییە بۆ ئاشتی، کە دەبێت بە دەیان و سەدان کۆبوونەوە بکرێت بۆئەوەی دوو خێزانی ڕاونراو لە سلێمانیەوە بۆ هەولێر و دوو خێزانی

ڕاونراویش لە هەولێرەوە بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە، بەڵکو گاڵتەکردنە بە ویست و ئارەزو و خەونەکانی خەڵکی کوردستان و بێماناکردنی ئێستا و ئایندەی میللەتی ئێمەیە. لە جیهانێکی ئاوادا کە ناعەقڵانیەتی سیاسی و توندوتیژی و جەنگ و کورتبینی و مونافەسەیەکی حیزبی بێمانا و غیابی هەر ڕەهەندێکی نەتەوەیی شێلگیر و گاڵتەکردن بە ئیرادەی کۆیی بەڕێوەی ببات سەیر نییە هێزی وەک جوندول ئیسلام دروستببێت، لەڕاستیدا سەیر ئەوەیە دروستنەبێت.

٢ـ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کۆمەڵگای ئێمە لەناو بێمافی و ناعەدالەتییەکی گەورە و کوشندەدا دەژی. کام ڕووکار لە ڕووکارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ماوە حیزب لە کوردستاندا مۆنۆپۆڵی نەکردبێت، لە مۆنۆپۆڵکردنی ئابوورییەوە بیگرە بۆ مۆنۆپۆڵکردنی دەزگا و دامەزراوە حوکومییە گشتییەکان. یەکەم دەرەنجامی ئەم مۆنۆپۆڵکردنەش بێبەشکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردییە لە هەر دەسکەوتێک بە کەناڵەکانی حیزبدا تێنەپەڕێت. بەستنەوەی ئەگەرەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و میهەنی و وەزیفی بە مەرجی ئینتیمای حیزبی بەرتەسکەوە بۆتە هۆی بێبەشکردنی بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان لە هەر هەلێکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە. ئەم دۆخەش لەسەرێکەوە بێهودەییەکی گەورە بەرهەمدەهێنێت و لەسەرێکی دیکەوە وێرانکردنی ئیرادەی سیاسی و کۆمەڵایەتی چەندان گرووپی ئەم کۆمەڵگایە، ئەمە جگە لە پەروەردەکردنی هەستێکی قووڵ بە قوربانیبوون. بەهێزبوونی سایکۆلۆژیا و خەیاڵ و عەقڵیەتی قوربانی لە هۆکارە گرنگەکانی دروستبوونی توندڕەوییە. هەرهێزێک هەستیکرد بەردوام قوربانی بە ویست و داخوازی و داواکارییەکانی ئەدرێت ناچارە ببێتە هێزێکی توندڕەوە، یان لانیکەم توندڕەوی ببێتە یەکێک لە ستراتیژەکانی کارکردنی.

٣ـ یەکێک لەو شتە گرنگانەی کە پرۆسەی بەحیزبیکردنی کۆمەڵگا لەناویدەبات مەسەلەی «هاریکاری کۆمەڵایەتی» و «بەشکردنی هەقیقەتە» لەگەڵ ئەوانیدیکەدا. ئەمەش ڕێک ئەو بونیادە دروسدەکات کە توندڕەوی بەرهەمدەهێنێت. بونیادی کۆمەڵایەتی توندڕەوی بونیادێکی داخراوە، بونیادێکە هێزەکان تێیدا ئامادەنین بەیەکدی هاریکاربن. هەرکەسە و بە خۆی و هەقیقەتی خۆیەوە و هەر هێزە بە خۆی و وێناکردنەکانی خۆیەوە سەرقاڵە. کێشەکەش لەوەدایە لە کۆمەڵگای ئێمەدا کۆی ئەم پەیوەندییانە چونکە لەسەر بونیادێکی نایەکسان و بێداد و

نایەکسان دروستبووە، ناتوانن جگە لە پەیوەندییەکی ڕق ئامێز و توندوتیژ هیچیدی بەرهەمبهێنن. هاریکاری کۆمەڵایەتی هێزی جیاجیا لەیەک نزیکدەخاتەوە و لەدەوری کۆمەڵێک بەها و ویست و ئارەزووی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە، کاتێک بونیادێک دروستدەبێت کە تێیدا لەڕێگای بە حیزبیکردنی هەموو دەرکەوتەکانی ژیانەوە ڕێ بە دروستبوونی ئەم هاریکارییە کراوەیە دەگیرێت، ئیدی توندڕەوی دەبێتە دەرنجامێکی حەتمی. هەرهێزێک هێزەکەی دیکە وەک دوژمن و نەیارێک دەبینێت و هەوڵی لاوازکردن و زەلیلکردنی ئەدات. هاریکاری کۆمەڵایەتی دروستنابێت لەکاتێکدا بۆ هەموو بەرەوپێشەوەچوونێکی کۆمەڵایەتی پێویستت بە ئینتیمایەکی کوێرانە هەبێت بۆ یەکێک لە حیزبە سیاسییەکانی کوردستان. لە کوردستاندا ئەم گەمەیە بەجۆرێک بۆگەن و ناخۆش و بێمانەبووە وایلێهاتوە پارتی چەند مامۆستای سەرەتایی هەیە یەکێتیش دەبێت ئەوەندەی هەبێت و یەکێتی چەند ئەرزەوحاڵ نووسی هەیە پارتیش دەبێت ئەوەندەی هەبێت، ئەمیان چەند چایچی هەبێت ئەویدیشیان دەبێت هەمان ژمارەی هەبێت. هاریکاری کۆمەڵایەتی بەبێ هاریکاری سیاسی وەهمە. سی ساڵە لە کوردستاندا لەباتی هاریکاری سیاسی دوژمنایەتییەکی بێوێنەی سیاسیی و سەربازی لە نێوان هێزە کوردییەکاندا ئامادەیە. لەم فەزایەدایە جوندول ئیسلام و چەندان هێزی توندڕەوی تریش دەتوانن دروستببن.

٤ـ ئەو خاڵەی سەرەوە بەرە و ئەوەمان دەبات کە پەیوەندی نێوان «کۆمەڵگای مەدەنی» و «کۆمەڵگای سیاسی» لە کوردستاندا وەک پەیوەندییەکی ئیفلیج و یەکلایەنە و دیسپلینکراو ببینین. کۆنترۆڵکردنی ئەو ڕەهەندانەی لەسەرەوە باسمانکردن مایەی سەندنەوەی هەر سەربەخۆییەکە لە بڕیار و کردار و بیرکردنەوەی دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ناچارکردنیان بە تەسلیمبوونێکی هەمەلایەن بە ویست و ئارەزووەکانی حیزب. لەڕاستیدا پەیوەندی نێوان حیزب و کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا پەیوەندی کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنە نەک پەیوەندییەکی کراوە تێیدا کۆمەڵگای مەدەنی لەڕێی یاسا و دەزگاکانی خۆیەوە چاودێری دەسەڵات و شێوازی بەڕێوەبردنی حوکومەت بکات و بەشداربێت لە پرۆسەی بڕیاردانی کۆمەڵایەتیدا. ئەمەش دۆخێک دێنێتە کایەوە ئینسان هەست بەوە بکات کە هیچ کەس و هێز و لایەنێک ناتوانن هیچ گۆڕانکارییەک بخەنەوە.

دروستبوونی ئەم هەستە بە ئیفلیجبوونی کۆمەڵایەتی سەرچاوەیەکی گرنگی دروستبوونی ڕۆحیەتی تۆڵەکردنەوە و توندڕەوییە.

٥- بەستنەوەیەکی توند وهەمەلایەنەی سیاسەت و ئاین بەیەکەوە و جیانەکردنەوەی لۆژیکی دین و لۆژیکی سیاسەت لەیەکدی. ئەوەی پێیوایە لە کوردستاندا تەنها هێزە ئیسلامییەکان ئاین و سیاسەتکردنیان بەیەکەوە گرێداوە بەهەڵەداچووە، هەم یەکێتی و هەم پارتی لە دەساڵی ڕابووردودا ڕۆڵێکی گەورەیان لە بە ئاینیکردنی فەزای سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا گێڕاوە. ئەم دوو هێزە هەریەکە لەلای خۆیەوە توێژێکی ئاینی کۆنەپارێزی لە کوردستاندا بەهێزکردوە و هەریەکێکیان گروهی ئاینی تایبەت بەخۆی هەبووە. هەم یەکێتی و هەم پارتی مەلا و فاتیحا خوێن و فەتواچی تایبەتیان هەیە کە فەتوای ڕاست و دروستی سیاسەتەکانیان بۆ دەدەن. لە دەساڵی ڕابووردودا ئەم دوو هێزە لە هەوڵی ئەوەدابوون قەناعەت بە کۆمەڵگای کوردی بهێنن کە لە ئیسلامییەکان ئیسلامیترن و ئامادەن لە باتی ئەوان هەموو بنەما ناعەقڵانی و خورافی و غەیبانییەکانی ئاین بەهێزبکەن. گوتاری هیچ یەکێک لەم دوو هێزە ئەوە نەبووە بە کۆمەڵگای ئێمە بڵێن ئێمە هێزی ئاینی نین و نامانەوێت ئاین و سیاسەت بەیەکدی تێکەڵبکەین، بەپێچەوانەوە ئەمان ئامادەبوون بەقەد ئیسلامییەکان بەرنامەی دینیان لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانیاندا هەبێت و بەقەد ئیسلامییەکان مەلا و فەتواچی و خەتیب دروستکەن و بەقەد ئیسلامییەکان تەکیە و مزگەوت و خانەقا ئاوەدانکەنەوە. تاقە مەرجێکیان لەمەدا ئەوەبووە کە سەر بەوان بن. بەڵام دروستکردنی ئەم لەشکرە ئاینییە تەقلیدییە چ دەرەنجامێکی کۆنەپارێز و کوشندەی بۆ سەر فەزای گشتی کۆمەڵگا دەبێ و چەند پانتایی حەرام و چەپاندن و سەرکوتکردن لە کۆمەڵگای ئێمەدا زیاددەکات، ئەمەیان بۆ ئەوان مەسەلەیەک نەبووە.

سەرەڕای ئەمانە یەکێک لە نووقسانییە گەورەکانی کۆمەڵگای ئێمە نەبوونی کۆمەڵێک دەزگای زانستییە بۆ لێکۆڵینەوەی ئاین و بابەتە ئاینییەکان. ئەوەی حیزبە کوردییەکان گرنگیان پێنەدابێت ئەم مەسەلەیەیە و لە ژێر دروشمی ئەوەی گوایە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی موسڵمانە ڕێیان لە دروستکردن و دامەزراندنی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی ئاین گرتووە. کاتی ئەوە هاتووە مۆنۆپۆڵکردنی لێکدانەوەی ئاین لەدەستی ئەو نوخبە تەقلیدیە ئاینییە و

ئەو هێزە ئوسوڵییە ئیسلامییانە بسەندرێتەوە کە لە کوردستاندا ئامادەن و بەشە جیاوازەکانی سۆسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و ئەنسرۆپۆلۆژیا و فەلسەفەی ئاین مافی دروستبوون قسەکردن وەرگرنەوە. نەبوون و لاوازی ئەم بەشە زانستییە جیاجیایانە وادەکات کۆمەڵگای ئێمە لە پەنجا ساڵی داهاتووشدا چاوی لە دەمی کۆمەڵێک مەلا و فەتواچی و هێزی ئاینی ئوسوڵی بێت ئاینی بۆلێکداتەوە، نەک کۆمەڵێک زانای کۆمەڵیەتی تەیار بە دەسکەوتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

٦ـ غیابی تەواوی هەر دیدێکی فیکریی و ڕۆشنبیریی و سیاسی و ئاینی بۆ پێداگرتنی تەواو لەسەر ئەو ڕاستییەی کە ئاین پەیوەندییەکی تایبەتە لەنێوان ئینسان و خوداوەندا، لەسەر ئەوەی کە ئاین پەیوەندییەکە ناوەکی و ڕۆحی و دەرونی و هیچ هێز و لایەن و کەسێک بۆی نییە دەستیتێوەردا و لەدەرەوەڕا دەستنیشانی ئەوەبکات چی و چۆن و بە چ شێوەیەک ڕێکبخرێت. ئەمڕۆ کۆمەڵگای ئێمە لە غیابی تەواوی مافی لێکدانەوە و ڕاڤەکردن و خوێندنەوەی سەربەخۆی دەقە ئاینییەکاندا دەژی، تا ئێستاش ئەوەی دەقەکان و ماناکان و لێکدانەوەکان دەستنیشاندەکات ئەو گروهە ئاینییەن کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە کوردستاندا بەهێزدەبن و ڕۆژبەڕۆژ تەماح و خەیاڵ و ئارەزووە سیاسییەکانیان گەورەدەبێت.

٧ـ لاوازیی کاری فیکریی ڕاستەقینە و لاوازیی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیی و نەبوونی تەفسیری مەعریفی بۆ کۆمەڵگا و جیهان و ڕووداوەکان لای حیزبە خۆ بە عەلمانیزانەکانی کوردستان ڕاستەوخۆ بۆتە هۆی بەهێزبوونی ئوسولەیەت. ئەمڕۆکە لە کوردستاندا نەوەیەکی گەنج هەیە بەدوای مانا و تەفسیر و لێکدانەوەدا دەگەڕێت، ئەوەی لە کوردستاندا دە ساڵە بێنرخ و بێبایەخ دەکرێت کاری فیکری ڕاستەقینەیە. ئەم نەوەیە بە گوتارێکی ئیعلامی بێللەزەت و بێقووڵایی گەمارۆدراوە و بۆ وەڵامدانەوەی کێشە فیکری و کولتووری و ڕۆحییەکانی شتێکی پێشکەش نەکراوە بەر بەوە بگرێت بۆ لێکدانەوەی جیهان و بوون و دیاردەکان بگەڕێنەوە بۆ ئاین و بۆ ئەو تەفسیرانەی ئوسوڵییەکان بە گەڕانەوە بۆ گوتاری ئیسلامی سیاسی عەرەبی بە گەنجی ئێمەی پێشکەشدەکەن. ڕۆژگارێکی درێژە حیزبە سیاسییەکانی کوردستان جگە لە سادەگۆیی و گوتارێکی ئیعلامی ئینشایی و بێنرخکردنی فیکر هیچیدیان نەبووە

و نییە بە کۆمەڵگای کوردی بدەن. کەمنین ژمارەی ئەو سیاسییە نیوە خوێندەوارانەی دێن و جارێ مەرگی ئەم فەلسەفە و ئەو فەیلسوف و ئەم قوتابخانەی فیکری و ئەو مەنهەجی مەعریفی ئەدەن و هەموو ئاڵۆزییەکانی فیکر کورتنەکەنەوە بۆ ئینشانووسیەکی سادە کە ناتوانێت پاسەوانە شەخسییەکانی خۆشیان ڕازیبکات. توندڕەوی لەسەر لۆژیکی سادەگۆیی فیکریی دەژی، دوژمنی هەموو توندڕەوێک ئاڵۆزییە. ئاڵۆزی فیکر و واقیع و جیهان ئاڵۆزییەکە نەخشە سادەکانی توندڕەوی تێکئەدات. هەموو ئینشا نووس و سادەنووس و ساکارنووسێک پرۆژەی دروستبوونی توندڕەوی بەهێز دەکات. کارەساتە هێزە سیاسییە باڵادەستەکانی ئێمە جگە لە لەشکرێک ئیعلامی نومرە سێ و نومرە چوار، دوو ڕۆشنبیریان نییە بتوانێت جیهانیان لە ئاستی تیوری و فیکریدا بۆ شیکاتەوە. کورتکردنەوەی خەباتی فیکری و تیوری بۆ پڕوپاگەندەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن یەکێکە لە هۆکارەکانی بەهێزبوونی ئیسلامی سیاسی بە باڵە میانڕەو و توندڕەوەکانییەوە.

بەدیوی ئەودیودا ئوسولیەتی ئاینی بەخۆی و نووسەر و موفەکیر و یۆتۆپیاکانییەوە ئامادەیە. هیچ ئوسولیەتێکی ئاینی نییە خەونێکی یۆتۆپی و مژدەیەکی ئایندەیی پێنەبێت. لە کوردستاندا تەنها هێزە دینییەکان هەڵگری مژدەی ئایندەیین. ئوسولیەت مژدەی دروستکردنی جیهانێکی پڕ لە برایەتی ئاینی و هارمۆنیەت و یەکسانی بە نەوەی نوێ دەبەخشێت، جیهانێک شانیداداوەتە سەر وێنەیەکی خورافی مۆدێلێکی یەکسانخواز، لەکاتێکدا حیزبە کوردییەکان جگە لە فرۆشتنەوەی «ڕابووردوی قارەمانانە» ی خۆیان بە کۆمەڵگا هەڵگری مژدەیەک نین باس لە سپێدەیەکی باشتر بکات.ب ێمژدەیی حیزبە سیاسییە کوردییەکان یەکێک لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی بەهێزبوونی ئوسولیەتە. بەڵام چارەسەرکردنی کێشەی بێمژدەیی مانای ئەوە نییە مژدەی درۆیینە ببەخشرێت. ئەگەر لە ئێستادا واقیعی ئێمە توانای بەخشینی مژدەی نییە، ئەگەر توانای مژدە بەخشین لە کوردستاندا لاوازە، ئەوا ئەوەی پێوستە دروسکردنی گفتوگۆیەکی ڕاستەقینەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ کۆمەڵگای ئێمەدا و بەرهەمهێنانی شەفافیەتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی بەرفراوانە. ئەمە سەرەڕای بەگەڕخستنێکی دادپەروەرانەی هەموو ئەو ئامرازانەی ئەم کۆمەڵگایە لەبەردمیدایە بۆ بەرهەمهێانی پرۆژەی گشتی و خەون و مژدەی ئایندەیی و مێژوویی.

٨ ـ له ئاستی سیاسەتی چۆنیەتی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان نێر و مێدا حیزبە باڵادەستەکانی کوردستان نەک سیاسەتێکی کراوە و هاوچەرخانەیان نییە، بەڵکو لەزۆر دۆخدا لەدوای هێزە ئیسلامیەکانەوە دەڕۆن. گومان هەڵناگرێت قەحتێکی جنسی گەورە و هەمەلایەن لە کوردستاندا ئامادەیە و بە هەزاران کچ و کوڕی گەنج هەن کە نە دەتوان ژنبهێنن و نە دەتوانن شووبکەن و نەدەتوانن پەیوەندییەکی تەندروستیش لەگەڵ یەکدیدا دەستپێبکەن. ئەمەش کاراساتێکی سایکۆلۆژی و مەعنەوی گەورەی بۆ نەوە نوێکان لە کوردستاندا دروستکردوە. کێشەکە لەوەدایە ئەم کارەساتە سایکۆلۆژی و مەعنەوییە نەبۆتە مایەی دروستبوونی دیالۆگ و ڕاگۆڕینەوە و سیاسەتێکی کۆمەلایەتی نوێ کە لانیکەم ئەم کێشانە بکاتە یەکێک لە کێشە گرنگەکانی سیاسەتکردن لە وڵاتی ئێمەدا. هێزێکی وەک پارتی تا نزیکی ساڵ و نیوێک لەمەوبەر یاساغی کردبوو لە ڕۆژنامە و میدیا و بڵاوکراوەکانیدا باس لە مەسەلەی جنس و کێشە جنسییەکان بکرێت. کەمنین ژمارەی ئەو لێکۆڵەرەوە و خەبیرانەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان قەحتی جنسی و بەهێزبوونی ئاین و ئیسلامی سیاسیدا دەبینن.

٩ـ دەسکارینەکردنی ئەو سیاسەتە پەروەردەییەی لە بەعسەوە بۆ کۆمەڵگای ئێمە ماوەتەوە و شانبەشانی ئەمەش بەحیزبیکردنێکی تەواوی دەزگاکانی پەروەردە. وەک لەشوێنێکی دیکەشدا نووسیومە سیستمی پەروەردەیی ئێمە ئیسانی بێ کارەکتەر و بێ ئیرادە دروستدەکات. دەزگاکانی خوێندنی ئێمە لەسەر دوو کۆڵەکە بەندن: گوێڕایەڵیەکی ڕەها و ئینتیمای بێپرسیار. قوتابخانە لای ئێمە منداڵ وا پەروەردە ناکات ببێتە بوونەوەرێکی ئازاد و بەرپرسیار، ببێتە هاوولاتی لێبووردو و ڕێزگر لە ئازادی ئەویدی، بەپێچەوانەوە قوتابخانە و زانکۆکانی ئێمە بەتەواوی بوونەتە دەزگای حیزبی و نەک ئازادیشیان تێدا دروستناکرێت بەڵکو شوێنی کوشتنی ئازادی و زەلیلکردنی ئینسانن.

قوتابخانە بۆ ئەوە نییە فێرمانکات هەموومان لەیەکبچین و یەک سیستمی بەها قبووڵبکەین و ببین بە ئەندامی یەک حیزب و چەپڵە بۆ یەک سەرکردە لێبدەین، قوتابخانە بۆ ئەوەیە فێرمانکات ڕێزی فرە دەنگی و پلورالیزم بگرین. دەبێت منالان فێربکەین کە سیاسەت سەرزەمینی بەها هاوبەشەکان نییە، بەڵکو سەرزەمینی ڕا و بۆچوونە جیاوازەکانە، دەبێت فێربین لەم سەرزەمینە پڕ جیاوازانەدا ڕێزی یەکدی بگرن و ئامادەبن بە ئیرادەوە لە کۆمەڵگا و چالاکییە

کۆمەڵایەتیەکاندا بەشداربن. قوتابخانە دەبێت منداڵان فێربکات کە هیچ کەس و لایەن و فیکرێک هەموو ڕاستییەکانی پێنییە، دەبێت فێریانبکات بتوانن بدوێن و ئەرگومێنت بۆ بۆچونەکانیان بهێننەوە، پرسیار بکەن و لەسەر بنەمای جیاوازبوونیان لەگەڵ یەکدا ڕێکبکەون. قوتابخانە بۆئەوەیە ئینسان فێربێت ڕێژەیبێت لە بۆچوونەکانیدا، ئامادەبێت هەقیقەتی ناو بۆچوونەکانی دیکە ببینێت و لەوە تێبگات کە ژیان مانای هاتوچۆیەکی بەردەوامە بەناو ناکۆکی هەمەجۆردا. ئەو سیاستە پەروەردەییەی ئەمڕۆکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئامادەیە یان کەسی بێکارەکتەر و ئیفلیج دروستدەکات، یان توندڕەوێک کە ئامادەیە گیانی ببەخشێت لە پێناوی خورافەتێکی ئاینی و سیاسی و کولتووریدا، لەگەڵ خۆیدا ئەو جیهانە وێرنبکات کە تێیدا دەژی.

**دەرنجام**

بەگژاچوونەوەی ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا بەوەنابێت بەرامبەر هەر مەلایەکی ئیسلامی مەلایەکی یەکێتی و بەرامبەر بە قورئانخوێنێکی ئیسلامی قورئنخوێنێکی پارتی و بەرامبەر هەر فەتواچییەکی توندڕە و فەتواچییەکی میانڕەوت هەبێت. بەگژاچوونەوەی ئیسلامی سیاسی بەوە نابێت مونافەسەی ئیسلامییەکان بکەیت لە دروستکردنی مزگەوت و تەکیە و خانەقەدا، بەوەنابێت بەرامبەر هەر ئایەتێکی ئەوان تۆش ئایەتێکت هەبێت و بۆ قسەیەکی ئەبو هورەیرە قسەیەکی تەبەری بدۆزیتەوە. بەگژاچوونەوەی ئیسلامی سیاسی بەوەدەبێت جۆرێک لە سیاسەت پێشنیاربکەیت کە لەباتی گەڕانەوە بۆ فەتوا، بۆ ئیرادەی خەڵک و لەباتی گەڕاندنەوە بۆ تەفسیری ئەم و ئەو، بۆ ڕیفراندۆم و ڕاپرسین و لەباتی گەڕانەوە بۆ ئەبوهورەیرە، بۆ دەستورێکی دیموکراسی بگەڕێیتەوە.

بەگژاچوونەوەی ئیسلامی سیاسی بەوە نابێت کە هەموو پۆستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییە گرنگەکانی وڵاتی ئێمە بدرێنە دەستی کەس و کار و خێزان و هاوڕێ و بنەماڵەی سەکردە سییاسییەکان، بەوە نابێت کە ئینتیمای حیزبی بخرێتە شوێنی سەلیقە و توانا و وریایی میهەنی، بەوە نابێت «قبووڵی خاس» بدرێت بە کەس و کاری مەسئولەکان و قوتابییە تەمەڵ و مام ناوەندیەکان، بەڵام حیزبییەکان، لە خوێندنی باڵا وەرگیرێن و قوتابییە

شایستەکانیش لەبەر بێئینتیمایی بێکار و بێجێ بمێننەوە. بەگژاچوونەوەی ئیسلامی سیاسی پێویستی بە سیاسەتێک هەیە پێیەکی لەناو عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا بێت و پێیەکەی دیکەشی لەناو کۆمەڵێک مژدەی واقیعیانەدا، دەستێکی لەناو کێشە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکاندا بێت و دەستەکەی دیکەی لەناو بنیادنانی کۆمەڵێک دەزگای مۆدێرندا، بەچاوێک لە ڕووە تاریکەکانی کۆمەڵگا و مێژووی ئێمە بڕوانێت و بەچاوەکەی دیکەی لە ئەزموونە فیکری و ئایدیۆلۆژییە گەش و گەورەکانی جیهان.

ئەوەی توندڕەوی لاوازدەکات هێرش و پەلامار و شەڕ نییە بەڵکو پیادەکردنی سیاسەتێکە پایەکانی لەناو دەستورێکی دیموکراسی و کراوەدابێت کە حکومەتێکی بەرپرسیار لە بەرامبەر پەرلەمانێکی هەڵبژێردراودا پیادەی بکات. جوندول ئیسلام بەرهەمی هەلومەرجێکە تێیدا خەڵک هەست بەوە دەکات لە جیهانێکدا دەژین حیزبە کوردییەکان و بەرپرس و خزم و کەس وکار و هاورێکانیان بەشە جوانەکەیان بۆخۆیان مۆنۆپۆڵکردوە و سەرەنوێلکەکانیشیان بۆ خەڵک هێشتۆتەوە. لەدوای قەسابخانەکەی جوندول ئیسلامەوە پێویستمان بە پرۆژەیەکی ڕەخنەیی بەرفراوان و پێداچوونەوەی پایەکانی ئەو جیهانە هەیە کە جوندول ئیسلامی تێدا دروستبووە. ئەوەی ڕێ لەم پرۆژەیە بگرێت بەرگری لە جوندول ئیسلام و هەموو تاریکییەکانی دیکەی ناو مێژووی ئێمە دەکات.

# تەقینەوەکانی هەولێر

## چەند سەرنجێک لەسەر ڕەگوڕیشە ئادیۆلۆژییەکانی توندوتیژی لە دنیای ئێمەدا

### ١. سەرەتا

ڕووداوی تەقاندنەوەی بارەگاکانی یەکێتی و پارتی لە هەولێر هیچمان پێنەڵێت لەوەمان ئاگاداردەکاتەوە کە عێراق لەبەردەم سەرەتایەکی نوێ و تۆقێنەری تێرۆری دینیدایە. ئەم ڕووداوە پێماندەڵێت کە هێزگەلێک لەو وڵاتەدا دەستبەکارن کە ئامادەن بەکارهێنانی توندوتیژیی بە دواهەمین سنوورەکانی بگەیەنن و بێ چاودێرییەکی عەقڵانی ئەوەی بەخەیاڵیاندا ڕەتدەبێت پراکتیکی بکەن. ئەو پرسیارەی کە دەشێت هەریەکێک لە ئێمە لە خۆمانی بکەین ئەوەیە: چی وا لە ئینسانێک دەکات سپێدەی جەژن لە خەو ڕابێت، پشتێنێکی دینامیت بپێچێت، بچێتە شوێنی کۆبوونەوەی دەیان ئینسانی دیکەوە کە نایانناسێت، تەوقەیان لەگەڵدابکات و بەدەمیانەوە پێبکەنێ و جەژنیان لێ پیرۆزبکات و دواتریش بیانکوژێت؟

لێکۆڵینەوە لەم فۆرمە نوێییەی تێرۆر کارێکی ئاسان نییە، ئەگەرچی زەحمەتیەکی ئەوتۆی ناوێت کە هێڵە گشتییەکانی ئەو دەزگا ئایدیۆلۆژی و دەزگای ڕێکخستنانە بناسین کە لەپشتی ئەم فۆرمە دینییەی کاری توندوتیژەوە ئامادەن: لێرەدا هێزێکی دینی توندڕەو ئامادەیە کە بڕیاری کافربوونی جیهان و دەوڵەت و کۆمەڵگای داوە، لەنێوان خۆی ئەم جیهانە کافرەدا سنوورێکی ڕەمزی و واقیعی دروستکردوە، خۆی بە ئیماندار و ئەوانەی دەرەوەی ئەو سنوورەی بەکافر ناونووسکردوە. دواجاریش کوشتن و لەناوبردنی هەموو ئەوانەی وەک خۆی نین حەلاڵ کراوە. لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە کۆمەڵێک سەرکردە و ئەمیر و کەسایەتی کاریزمی و نیوەکاریزمی ئەم گروهە بەڕێوەدەبەن و ڕۆڵی ئەو ڕێبەرە ڕۆحییانە دەبینن کە گوایە دەزانن کێ مافی چوون بۆ بەهەشتی هەیە و کێش

نیەتی، کێ دەبێت بکوژرێ و چ کەس و لایەن و دەستەیەک بهێڵدرێنەوە. لەڕووی ڕێکخستنیشەوە ئەم هێزانە سەر بە کەلەپووری ئەو ڕێکخراوە سیاسییە ژێرزەمینی و یاساغانەن کە مێژووی پەنجا ساڵی ڕابووردوی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەیان و سەدان نموونەمان نیشانئەدەن.

ئەم هێزە دینییە بیرۆکەی «شەهادەت» بە هەموو قورساییە سایکۆلۆژی و ئەفسانەییەکانییەوە دەخاتە گەڕ و مژدەی ژیانێکی جاویدانەی پڕ لەزەت دەبەخشێت. بیرۆکەی «جیهاد» تەرجەمەدەکات بۆ کۆمەڵێک پەلاماری سەربازی توندوتیژ و ئەم پەلامارانەش لە تازەترین فۆرمەکانی تەکنۆلۆژیای کوشتن ماردەکات. بڕبڕەپشتی ئەم گروهە دینییە گروهێک لە کەسانی ئایدیالیست و ڕۆمانسی، بەڵام تێکشکاو و تەنیا و زۆرجار هەژار و نەخوێندەوار و بێئومێدن، کە نارەزاییەکی گەورەیان بەرامبەر بە جیهان و ئەو کۆمەڵگایە هەیە کە تێیدا دەژین. دوا ئامانجی ئەم گروهە دینییە گەیشتنە بە دەسەلاتی سیاسی بە مەبەستی دارشتنەوەی هەندەسەی کۆمەلایەتی کۆمەڵگا لەسەر بناغەی ئەو نەخشە دینییە سادەیەی لە خەیاڵی ئەواندا ئامادەیە. تەشبیهکردنی بارەگاکانی یەکێتی و پارتی لەلایەن ئەم هێزەوە بە «کولانەی شەیتان» سەرەتای ئەو خەیاڵە سیاسییەمان نیشانئەدات کە خوازیاری گۆڕینی هەموو «کولانەکانی تری شەیتانە» بە کولانەی ئیمان. ئەمەش مانای گۆڕانی کۆمەڵگا بۆ مزگەوتێکی گەورە کە تیایدا لەسەر هەمووان پێویستە گوێ لە فەرمودە و حوکم و فەتواکانی ئەو ئیمام و ئەمیر و ئەکتیڤیستە سیاسییە نیوە خوێندەوارانە بگرین کە پێماندەڵێن باش و خراپ چین، چۆن بژین و گوێ لە چی و کێ بگرین و تەماشای کوێ و چیش بکەین، چی ڕەجم کەین و چەپڵە و ئافرەنیش بەکێ ببەخشین.

ئەم ووتارەی من تەرخان نییە بۆ قسەکردن لەسەر تیرۆری دینی وەک فۆرمێکی تازە و بەهێزی تیرۆر لە عێراق و کوردستاندا، تەرخانیش نییە بۆ زیاتر لێکدانەوە و قووڵکردنەوەی ئەو خالانەی باسمانکردن، بەڵکو تەرخانە بۆ لێدوان لە هەندێک بنەمای نادینی تیرۆر کە بەشێکی گرنگی ئەو «کولتووری توندوتیژی» یە دورستدەکەن کە ئەمڕۆکە لە عێراق و کوردستاندا ئامادەیە. ئەم وتارە تەرخانە بۆ خوێندنەوەی چەند ڕەهەندێکی ئەو ڕەگوریشە کولتووری و ئایدیۆلۆژی و فەلسەفییانەی لە پشتی تیرۆر و بەکارهێنانی توندوتیژییەوە ئامادایە بەتایبەتی لەو شێوازی بیرکردنەوە و چەمک و تیڕوانیانەدا کە لەتەماشاکردنی یەکەمدا وەک بنەمایەک بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی نابینرێن.

**٢. توندوتیژی و کۆمەڵگا**

زەحمەتە ماناکانی توندوتیژی بەشێوەیەکی وورد و هەمەلایەن دەستنیشانکەین چونکە تووندوتیژی دیاردەیەکی بەرفراوانە لە سروشتەوە دەستپێدەکات و بە ئینسان و کۆمەڵگا و زماندا بڵاودەبێتەوە. توندوتیژی لە تووڕەبوونەکانی سروشتدا لە شێوەی بورکان و بومەلەرزە و لافاودا ئامادەیە، لە پەیوەندییەکانی ئینسانیشدا لە فۆرمی لێدان و شکاندنەوە و ئیهانەکردندا تا بە کوشتنی تاکەکەسی و کۆکوژی دەگات ئامادەیە، لە کۆمەڵگادا دەشێت فۆرمێکی دەزگایی بگرێتە خۆی و لەناو دەیان ڕەمزیشدا ئامادەبێت.

فۆرمە جیاوازەکانی توندوتیژی بەشێکن لە جیهانی ئەمرۆمان، لە جیهانی دوێنێ و لەوانەشە لە جیهانی سبەینێمان. زەحمەتە کۆمەڵگایەک بدۆزینەوەیە توندوتیژی تێدانەبێت، هێزێکی کۆمەلایەتی هەبێت هەڵگری فۆرمێک لە فۆرمەکانی توندوتیژی نەبێت. جیهانی ئینسان جیهانێکە بەڕادە و فۆرم و بڕی جیاواز توندوتیژی تێدابووە و تێدایە. سۆسیۆلۆژی بەناوبانگ ئیملی دورکهایم باوەڕی وایە کە توندوتیژی بەشێکی دانەبڕاوە لە دنیای تاکەکەس و گروهەکانی ناو کۆمەڵگا و بەشێکی دانەبڕاوە لە جیهانی کۆمەلایەتی. ئەم ئامادەگییە کۆمەلایەتییە بەرفراوانە وایکردوە هەموو کۆمەڵگایەک تێڕوانین و نرخاندنێکی تایبەتی بۆ تووندوتیژی هەبێت و ئەم تێڕوانینەشی لە سیستمی بەها و نۆرم و نرخە کۆمەلایەتییەکانیدا بەرجەستەکردبێت. مەرج نییە ئەوەی لە کۆمەڵگایەکدا وەک تووندوتیژی و ئیجرام قبووڵدەکرێت لە کۆمەڵگایەکی دیکەدا بەهەمان شێوە قبووڵبکرێت. بەلام ئەم ڕێژەگەراییە ڕەها نییە و ڕووداوی لە شێوەی ڕووداوەکەی هەولێر، یان ئەوەی لە ١١ سێپتێمبەردا لە ئەمریکا ڕوویدا، یان دانانی بۆمبا لە میترۆکانی پاریسدا چەند ساڵێک لەمەوبەر و چەندانی دیکەش، ڕووداوگەلێکن لەڕووی ئەخلاقی و سیاسی و کولتوورییە تاوانن و تاوانی گەورەشن بەرامبەر بە ژیان و بە ئینسان و بە کۆمەڵگا. واتە چەندە شێوە و نرخاندن و پێناسەکانی توندوتیژی جیاواز و هەمەجۆربن، سنوورێک هەیە کە بەزێنرا ناکرێت پاساوی کولتووری بۆ بەکارهێنان و شەرعیەت بەخشین بە توندوتیژی قبووڵبکرێت. بەبۆچونی من ئەو سنوورەش بەکارهێنانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی توندوتیژی مادی و ڕەمزییە دژ بە ئینسان بە ئامانجی بچووککردن و بێبایەخکردن و ناچارکردن تا بە کوشتن دەگات.

**٣- دوو هەڵوێستی جیاواز لە توندوتیژی**

بەرامبەر بەم ئامادەگییە سەرتاسەرییەی توندوتیژی و بەرامبەر بە مەبەست و شەرعیەتی بەکارهێنانی توندوتیژی دەکرێت دوو هەڵوێستی جیاواز لە فیکری ئینسانیدا لەیەکدی جیابکەینەوە. یەکێکیان ئەو دیدە فەلسەفییەیە کە تێڕوانینێکی پۆزەتیڤی بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی هەیە و بە ئامرازێکی گرنگی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری دەزانێت. ئەویدیکەیان ئەو دیدەیە کە توندوتیژی بە هۆکاری هەموو کارەساتە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکان لە قەڵەم ئەدات و نێگەتیڤانە دەینرخێنێت. یەکەمیان لەنێوان توندوتیژی و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییدا پەیوەندییەکی ئۆرگانی دەبینێت و بەکارهێنانیشی وەک ناچارییەکی مێژوویی و سایکۆلۆژی و کولتووری پێشنیاریدەکات. ئەویدیکەیان وەک شەڕێکی ڕەها و خراپەکارییەکی فرەلایەن و تێکدەری گشت فۆرمەکانی هارمۆنیەت دەیناسێنێت.

لە مێژووی فەلسەفە و فیکری سیاسیدا زۆر نووسەر و فەیلەسوف هەن کە پرۆژەی بەرقەرارکردنی «ئازادی هەمیشەیی» و بنیادنانی «کۆمەڵگای نموونەیی» و «نەهێشتنی یەکجارەکی ململانێ و ناکۆکیی» بە بەکارهێنانی بەرفراوانی توندوتیژیەوە گرێدەدەن. یان لانیکەم بە زمانێک لە ئازادی و لە کۆمەڵگای نموونەیی و لە ململانێ و ناکۆکی ئەدوێن کە بارگاوییە بە شێوازە جیاوازەکانی توندوتیژی. لە فەلسەفەی کلاسیکیدا ئەفلاتوون و لە فیکری نوێشدا کارل مارکس دووان لەو فەیلەسوفانەن کە دیدێکی پۆزەتیڤیان بەرامبەر بە بەکارهێنانی توندوتیژی هەیە. لە ڕاستیدا بەشێکی گرنگی فیکری ئینسانی لە دۆخی بەرزنرخاندێکی بەردەوامی توندوتیژیدایە، لە ئاینەکانەوە بۆ فاشیزم و نازیزم و مارکسیزم و ناسیۆنالیزم و ئەنارشیزم، ئینسان ئەتوانێت هێڵی ئاشکرای بەرز نرخاندنی توندوتیژی و مۆتیڤی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی بدۆزێتەوە. لە ئیسلامدا بیرۆکەی شەهادەت و جیهاد بارگاوین بەهەموو ماناکانی بەکارهێنانی توندوتیژی، فاشیزم و نازیزم بریتین لە جۆرێکی پەڕگیر و هەمەلایەنی هێزپەرستی، ناسیۆنالیزم خۆی وەک «خۆشەویستییەک» دەناسێنێت کە «داوای قوربانی بەردەوام» دەکات، مارکسیزمیش توندوتیژی وەک «مامانی مێژوو» وێنادەکات.

لەناو فەلسەفە تازەکاندا لیبرالیزم ئەو دیدە فەلسەفییەیە کە توندوتیژی خراپ دەنرخێنێت و بەسەرچاوەی کارەساتی سیاسی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیشی دەزانێت. هۆکاری سەرەکی ئەم خراپ نرخاندنەی لیبرالیزم بۆ توندوتیژی لەوەدایە کە پایە فەلسەفییەکانی فیکری لیبرالیزم لەسەر بیرۆکەی ئازادی و سەربەخۆیی و عەقلانیبوونی تاکەکەس بیناکراوە، هەر تاکەکەسیش دەکاتە بنەمای گرنگیدان بە کۆمەڵگا و لەدیدی ئەوەوە لە کۆی کێشە و ململانێ کۆمەڵایەتییەکان دەڕوانێت. بۆیە هەر دەستدرێژیکردنێک بۆ سەر ئازادی و سەربەخۆبوون و توانای هەڵبژاردنی عەقلانیانەی تاکەکەس وەک هێرش بۆ سەر بنەما فەلسەفییەکانی خۆی دەبینێت و مەحکومی دەکات. ئەمە جگە لەوەی کە لیبرالیزم دوور لە بیرۆکەی شۆڕش و گۆڕانی ڕادیکاڵ و خێرا و یەکجارەکی و نوخبەی پێشەنگ دەدوێت و زیاتر فەلسەفەیەکە بە زمانی «ڕێکەوتن» و «دانوسان» و «دیالۆگ» قسەدەکات.

بێگومان لەمێژووی فیکردا ڕەخنەی قووڵ و فرەلایەن و ڕاستەقینە لە لیبرالیزم گیراوە و دەگیرێت، نووقسانی و کێشە بونیادییەکانی بەوردی خوێندراونەتەوە. لە فۆرمە نوێکەیدا، واتە لە فۆرمی لیبرالیزمی نوێدا، باس لە دیکتاتۆریەت و توندوتیژی بازاڕی ئازادی بێچاودێری و لێپرسینەوە دەکرێت. بەڵام لەگەڵە ئەو ڕاستیانەشدا دیدی لیبرالانە یەکێکە لەو دیدە فەلسەفییانەی کە نەفرەتێکی تەواوەتی لە توندوتیژی دەکات و سنووری بەکارهێنانی بچووکدەکاتەوە.

**٤ـ لەنێوان «پۆل ریکور و کارل مارکس»دا**

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو دوو هەڵوێستەی سەرەوە با نموونەی دوو فەیلەسوف بهێنینەوە کە یەکێکیان دیدێکی زۆر نێگەتیڤی بۆ توندوتیژی هەیە و ئەویدیکەیان دیدێکی زۆر پۆزەتیف. یەکەمیان پۆل ڕیکوری فەرەنسییە و دووهەمیشیان کارل مارکسی ئەڵمانییە.

لە خوێندنەوەیدا بۆ توندوتیژی، پۆل ڕیکور، باس لە نائامادەیی زمان لای ئەوانە دەکات کە توندوتیژی بەکاردەهێنن. ئەو دەڵێت لەکوێدا زمان نائامادەبێت لەوێدا ئەگەری ئامادەگی توندوتیژی گەورەیە و لە کوێشدا زمان ئامادەبێت لەوێدا ئەگەری ئامادەبوونی توندتویژی لاوازە. ئەم فەیلەسوفە لەنوێیان

نائامادەیی زمان و ئامادەیی لۆژیکی توندوتیژیدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ دەبینێت، واتە بڕی ئامادەیی توندوتیژی وابەستەی بڕی نائامادیی زمانە و کەیش زمان ئامادەبوو بڕی ئامادەگی توندوتیژی لاوازدەبێت. بەڵام ئامادەگی و نائامادەگی زمان یانی چی؟ بە چ مانایەک لەنێوان زمان و توندوتیژیدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ بەڵام پێچەوانە هەیە؟

زمان لە دیدی پۆل ڕیکوردا بریتییە لە ئامراز و ئەگەرێک بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێ و لێکتێگەیشتن، مانای ئامادەگی ئەگەری بەرهەمهێنان و بەکارهێنان و گۆڕینەوەی ئەرگومێنت. زمان مانای بوونی فەزایەک بۆ پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی هەقیقەت و مانا و بۆچوونەکان، زمان مانای دانوسان و گوێ لەیەکدی گرتن. بەکورتی لەکوێدا زمان ئامادەبێت لەوێدا ئەگەری قسەکردن و دیالۆگ ئامادەیە و کە ئەمانەش ئامادەبوون ئەگەری ئامادەگی توندوتیژی کەمدەبێتەوە. بەپێچەوانەشەوە لەکوێدا توندوتیژی ئامادەبێت لەوێدا زمان ئامادە نییە. نائامادەگی زمان و ئامادەگی توندوتیژی هاوشانن. کەوابوو هێزی تێرۆریست و توندوتیژ و هێزپەرست هێزگەلێکن کە زمانیان نییە و ناتوانن یان نازانن یان نایانەوێت قسەبکەن و ڕاوبۆچوون و ئەرگومێنت و هەقیقەت لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا بگۆڕنەوە.

ئەم بۆچوونەی پۆل ڕیکور لە ئاستی ڕۆژانەدا لەو دەستەواژەیەدا دەدۆزینەوە کە زۆرجار بۆ کەسێک کە توندوتیژیبێت بەکاردەهێنرێت. هەمووان دەزانین کەسی توندوتیژ یان کەسێک توندوتیژی زۆر بەکاربهێنێت پێیدەگوترێت دەڵێی «وەحشی»ە یان دەڵێی «حەیوان»ە. بەڵام ئایا ئەم دوو دەستەواژەیە لە پەیوەندیاندا بەزمانەوە چ مانایەک دەگەیەنن؟ ئاشکرایە سیفەتی سەرەکی «وەحشی» و «حەیوان» ئەوەیە کە زمانیان نییە و ناتوانن قسەبکەن، کە قسەش نەکرا، دیالۆگ نابێت، کە دیالۆگیشی نەبوو ئینسان ئیدی لە چوارچێوەی ئەو جیهانە تەسکەدا دەژی کە یان خۆی بۆ خۆی دروستدەکات یان ئەو گروهە بچووکە بۆی دروستدەکات کە لەگەڵیدا دەژی. ئەمەش تەسکبوونەوەی جیهانە بۆ یەک وێنە و لەوێشەوە بۆ یەک هەقیقەت و یەک زمان. لەپشتی لۆژیکی بەکارهێنانی توندوتیژەوەیە بێزمانییەک ئامادەیە بەرامبەر بەوانی دیکە کە زمانی دیکە و هەقیقەتی دیکە و وێنەی دیکەیان بۆ ژیان و جیهان و بوون پێیە.

دەرنجامێک بکرێت لەم دیدەی ڕیکورەوە بەدەستیبهێنین ئەوەیە کە توندوتیژی هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسییە کە تێیدا دیالۆگ و ئەرگومێنت و ڕاگۆڕینەوە و هەوڵدان بۆ لەیەکدی تێگەیشتن وونە. توندوتیژی لەدایکبووی ئەو هەلومەرجە تایبەتەیە کە تێیدا زمان بێدەنگدەکرێت، سنووری ئاخاوتنی تەسکدەکرێتەوە و دیالۆگ بزردەبێت. ئەمەش مانای ئەوەی کەسی تێرۆریست یان توندوتیژ کەسێکی بێزمانە و تەنها گوێ لە خۆی دەگرێت، یان تەنها زمان و جیهان و هەقیقەتی ئەو گروهە بچووکە دەناسێت کە ئەندامە تیایدا، ئەمەش وایلێدەکات هەموو شتێکی دەرەوەی ئەو جیهانە بچووکە بە نامۆ و دوژمن و ناڕاست لەقەڵەمبدات و لە قۆناغێکدا هەوڵی لەناوبردن و وێرانکردنیشیان بدات. ئەوەی بە زمانی ئەو نادوێت، یان زمانێک بەکاردێنێت جیاواز لە زمانی ئەو، ڕێک وەک ئاژەڵێکی زمان نەزانی لێدێت و دەبێت لەناوببرێت. واتە وەحشیگەرێتی دەبێتە پەیوەندییەکی دوولایەنە، لەسەرێکەوە کەسی توندوتیژ و بێزمان خۆی دەبێتە وەحشیەکی توندوتیژ و لەسەرێکی دیکەوە زمان نەزانین و تێنەگیشتن لەویدی، ئەویش دەکاتە ئاژەڵ و مەسەلەی لەناوبردنی ئاساندەکات.

بەپێچەوانەی پۆل ڕیکورەوە، کارل مارکس پێیوایە کە توندوتیژی پێویستییەکی مێژووییە و ئەمەش وابەستەی ئەو «ڕاستییەیە» کە کۆمەڵگا تەنها لەڕێگای «شۆڕشەوە» گۆڕانی ڕادیکال و هەمەلایەن و یەکجارەکی بەسەردادێت. ئەگەر مێژوو ململانێ و پێکدادانی بەردەوامی نێوان چینەکان بێت، ئەگەر ئەم ململانێ و پێکدادانانە حەتمین و فۆرمی یاسای بابەتیان لەخۆ گرتبێت، ئەوکات توندوتیژی بەشێکی ئۆرگانی و دانەبڕاو و پێویستی ئەو مێژووەیە کە ئەو یاسایانە پیادەدەکات. ئەم دیدە مارکسییە بۆ مێژوو، کە لە جەوهەردا دیدێکی هۆبزییە، توندوتیژی وەک پێدراوێکی حەتمی و پێویست دەبینێت تەنها لەو دۆخەدا نەبێت کە دوای بەکارهێنانێکی زۆری توندوتیژی ناکۆکی و ململانێ و کێشمەکێش نەماون. واتە ئەم نەمانە منداڵی دوای شەڕ و پێکدادانە گەورە و خوێناوییەکانە.

مارکس باوەڕی وابوو کە هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان بە یەک زمان نادوێن، ئەو پێیوایە هەر هێزێک زمان و خەیاڵ و لۆژیکی تایبەتی خۆی هەیە و لە بنەڕەتەوە دۆخی لێکتێنەگەیشتنێکی لۆژیکی و سیاسی لەنێوان بەشە جیاجیاکنی کۆمەڵگادا بالادەستە، بۆیە دیالۆگ ناتوانێت دروستببێت. ئاخر

چۆن دیالۆگ دروستببێت لەکاتێدا هەر هێزێک و زمانێکی تایبەت قسەبکات؟ سەرەڕای ئەمە دیالۆگ نەک چارەسەری کێشە گەورەکانی مێژوو ناکات، بەڵکو دەبێتە هۆی وازهێنانی هێزە شۆڕشگێڕەکانیش لە ویست و بەرنامە و خەونە سیاسییەکانیان. لای مارکس قسەی چینە جیاوازەکان لەگەڵ یەکدا زیاتر وەک پێکدادانی دوو لۆژیک دەردەکەوێت کە بوونی یەکێکیان دژ بە بوونی ئەویدیکەیانە، نەک وەک دیالۆگی دوو زمان کە زەمینە و گوتراو و گراماتیکی هاوبەشیان هەبێت. ئەمەیە وادەکات لە تیورەی مارکسیزمدا دەربارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بیرۆکەی شۆڕش ئەو شوێنە گرنگە داگیربکات کە هەیەتی. بیرۆکەی شۆڕش لە وێناکردنە مارکسییەکەیدا بریتییە لە جێگرتنەوەی چینێک بۆ چینێکی دیکە، یان گەر بە زمانی ڕیکور بدوێین جێگرتنەوەی زمانێکە بۆ زمانێکی دیکە. لەهەردوو دۆخەکەشدا ئەم جێگرتنەوەیە مانای دەرکردنەدەرەوەی یەکێکیان بۆ ئەویدیان، ئەمەش مەحاڵە بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی.

ڕەنگە بتوانین بەشێکی گەورەی ڕەگە فەلسەفی و فیکرییەکانی توندوتیژی هاوچەرخ بۆ ئەم دیدە مارکسییە بۆ توندوتیژی بگەڕێنینەوە. نەک تەنها لەبەرئەوەی مارکسیزم داوای گۆڕانی ڕادیکاڵ و هەمەلایەن و ڕیشەیی دەکات، باس لە حەتمیەتی بەریەککەوتن و پێکدادانی کۆمەڵایەتی توندوتیژ دەکات، وێنەیەکی ڕۆمانسییانە بۆ شۆڕش و گۆڕان و تازەبوونەوە دەکێشێت، بەڵکو لەبەرئەوەش مارکسیزم ئایدیۆلۆژای باڵادەستی پەنجا ساڵی ڕابووردوی ناو فیکر و کولتووری سیاسی بەشێکی گرنگی جیهانی ئەمڕۆیە. ئەمڕۆ هێزە دینییەکان لەپاڵ بیرۆکەی جیهاد و شەهادەتدا هەمان ڕۆمانسیەت پیادەدەکەن کە مارکسییەکانی دوێنێ پیادەیان دەکرد و هەوڵی بەرپاکردنی هەمان گۆڕانی ڕادیکاڵ و ڕیشەییش ئەدەن کە ئەوان دەیاندا. دینییەکانی ئەمڕۆ دەیانەوێت کۆمەڵگای بێدینی ئەمڕۆکە لەبەریەک هەڵوەشێننەوە و ئەو کۆمەڵگا ئاینییە دامەزرێنن کە هەمووان دەکاتە برای دینی یەکتری و یەک هەقیقەت و یەک زمان و یەک خودا و یەک بەهەشت و یەک جەهەنەمیش بەهەمووان ئەبەخشێت.

مارکس پێی وابوو بەبێ توندوتیژی هیچ شتێکی جەوهەری لە مێژوودا نەگۆڕاوە و ناشگۆڕێت، ئەو لەیەکێک لە ڕستە بەناوبانگەکانیدا دەڵێت: «توندوتیژی مامانی مێژووە، هیچ مەسەلەیەکی بنەڕەتی لە مێژوودا نادۆزینەوە بەبێ توندوتیژی چارەسەر کرابێت».

ئەم دیدە مارکسییە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە دوژمنە چینایەتییەکان بەئاسانی لای هێزە دینییەکان گۆڕاوە بۆ جیهاد دژ بە دوژمنەکانی خودا کە ئەوان وەک شەیتان دەیانبینن و بارەگاو دەزگاکانیشیان وەک «کولانەی شەیتان» وێنادەکەن. بەم مانایە توندوتیژی هێزە دینییەکانی ئەمرۆ لە ئاستێک لە ئاستەکاندا بەردەوامی ئەو توندوتیژییە کە بەدرێژایی سەدەی بیستەم بەناوی "توندوتیژی شۆڕشگێڕانەوە» ئامادەبووە و پێیەکانی لەنێو بەشێکی گرنگی بۆچوونەکانی مارکسیزمدایە.

## ٥- ووشیاری ساختە و ووشیاری ڕاستەقینە

مارکس تەنها لەوەدا باوەڕی بەتوندوتیژی نییە کە دەیکاتە «مامانی مێژوو»، لە مارکسیزمدا کۆمەڵێک گوتراو و چەمکی دیکەش هەن کە دەشێت وەک سەرچاوەیەکی گرنگی بەرهەمهێنانی توندوتیژی بیانبینین. یەکێک لەو سەرچاوە گرنگانە بریتییە لەو جیاکارییەی مارکس لەنێوان چەمکی «ووشیاری ساختە» و «ووشیاری ڕاستەقینەدا» دەیکات. لای مارکس «ووشیاری ساختە» ووشیارییەکی هەڵەیە و دەبێت ڕاستبکرێتەوە و جێی بە «ووشیاری ڕاستەقینە» بگیرێتەوە. بێدرێژەپێدان دەکرێت بپرسین: کێن ئەوانەی هەڵگری ووشیاری ڕاستەقینەن؟ کێن ئەوانەش کە پێماندەڵێن کام فۆرمی ووشیاری ڕاستە و کامیشیان ساختەیە؟

لە ڕاستیدا وەڵامی ئەم پرسیارانە لە مارکسیزمدا ئاشکرایە. فۆرمەکانی ووشیاری دەرەوەی «ووشیاری کرێکاران» ساختەن و هەندێکجار ووشیاری کرێکاران خۆشیان دەبێتە ووشیاریەکی ساختە کە دەبێت لەلایەن نوێنەران و مامۆستایان و سەرکردە کرێکارییەکانەوە ڕاستبکرێنەوە. (خوێنەر دەتوانێت هێڵێکی بەراورد لەنێوان ووشیاری ڕاستەقینە و ووشیاری ساختە لەلایەکەوە و باوەڕداران و بێباوەڕانی دینی لەلایەکی دیکەوە بدۆزێتەوە. هەروەها دەتوانێت هێڵێکی بەراوردکردن لەنێوان مامۆستا دینییەکان و مامۆستاکانی پرۆلیتاریادا بدۆزێتەوە).

بێگومان لەپشتی دابەشکردنی ووشیارییەوە بۆ ووشیاری ساختە و ووشیاری ڕاستەقینە ئەو لۆژیکە کاردەکات کە دەبێت ووشیاری ڕاستەقینە بچێتە شوێنی

ووشیاری ساختە. دەبێت فۆرمەکانی ووشیاری بەساختە کراو لە کۆمەڵگا و کولتوور و سیاسەت بکرێنە دەرەوە و لەجێی ئەواندا ووشیاری ڕاستەقینە بەرقەرابێت. لێرەشدا خوێنەر دەتوانێت لەنێوان ئەم دیدە و دیدی ئوسولییە دینییەکاندا کە ووشیاری خۆیان بە تاقە ووشیاری ڕاستەقینە و دەرەوەی خۆیان بە جاهیلیەت دەزانن، بەراوردێک بکات. ئەم لابردن و لەناوبردنەش بەبێ بەکارهێنانێکی بەرفراوانی توندوتیژی مەسیەرنابێت. ئەزموونی لەناوبردنی شێوەکانی تری ووشیاری چ لە ئەزموونی دەوڵەتە مارکسییەکانی سەدەی بیستەم و چ لە ئەزموونی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا ئەزموونێکی خوێناوی و ناشیرینە

**٦- توندوتیژی و دیدی هۆبزی بۆ مێژوو**

سەرچاوەیەکی دیکەی توندوتیژی لای مارکس دیدی هۆبزیانەی ئەوە بۆ مێژوو. وەکچۆن لای هۆبز دۆخی سروشتی دۆخی جەنگەڵیانەی شەڕی گشت دژ بە گشتە، ئاواش مارکس پێیوایە کە مێژوو جەنگەڵی ململانێ و پێکدادانی بەردەوامی چینەکانە لەگەڵ یەکدا. لای مارکس بیرۆکەی چین بیرۆکەیەکی ڕەهایە، شتێک نادۆزینەوە ناوی ئینسانی موجەرد یان ئینسانیەتی موجەرەد بێت، لای ئەو چینەکان هەن و ئەمانیش لە شەڕ و پێکدادان و ململانێیەکی بەردەوامدان. (خوێنەر دەتوانێت لەنێوان ئەم دیدە و دیدی ئیسلامییە توندڕەوەکاندا بەراوردێک بکات کە ئەوانیش مێژوو وەک شەڕی نێوان ئیمان و بێئیمانی دەبینن و ئینسانی باوەڕدار و ئینسانی بێباوەڕ وەک دوو جۆر بوونی تەواو ناکۆک بەیەک لەیەکدی جیادەکەنەوە و ناتوانن ئینسانبوون لە مانا موجەرەدەکانیدا ببینن. ئەم گروهانە چەند هەنگاوێک زیاتر دەڕۆن و گروهەکەی خۆیان نەبێت کەسیدی بە ئینسان نازانن و مافی ژیانیان پێنابەخشن).

کۆی ئەو خاڵانەی لەسەرەوە باسمانکردن و وەک بەشێک لە دەزگا چەمکی و خەیاڵگە سیاسییەکەی مارکسیزم ناساندمانن لە جەوهەردا دابڕانن لەو دیدە لیبراڵەی کە پێیوایە گۆڕان مەسەلەیەکی درێژخایەن و فرەقۆناغ و لەسەرخۆ و بەردەوامە. کە کۆمەڵگا شوێنی کۆبوونەوەی تاکەکەسی ئازاد و جیاواز و

سەربەخۆبێت، بناغەی پێکەوەبوونی ئەم تاکەکەسانە ڕێککەوتن و یەکدی قبووڵکردن و دیالۆگە. ئەگەر توندوتیژی لە دیدی نالیبرالدا بۆ گۆڕینی ڕادیکاڵ و خێرای ئەو «پەیمانە کۆمەلایەتی»یە بێت کە لەو ساتەدا لە ئارادایە بەهیوای دروستکردنی پەیمانێکی نوێ، ئەوا ئەزموونە مێژووییەکان نیشانیانداوین کە ئەو تێکدانە هاوشانبووە بە تێکدانی هەموو پەیمانەکان بەبێ دروستکردنی هیچ پەیمانێکی دیکە.

## ٧- ستەمگەرانی ئیسلام و توندوتیژی

بێگومان ئەو بۆچوونانەی سەرەوە بەو مانایە نین گوناهی ڕووداوەکەی هەولێر بخەینە ئەستۆی کارل مارکس و مارکسییەکانی کوردستان. ئەگەر کەسێک لەو بۆچوونانەی سەرەوە بیری بۆ ئەم دەرەنجامە چووبێت ئەوا لە مەبەستی ئەم نووسینە و ئەو بۆچوونانە نەگەیشتوە. ئەوەی من لەو پەرەگرافانەدا دەمەوێت بیڵێم نیشاندانی ئەو پێشخانە ئادیۆلۆژی و فیکریانەیە کە لە وڵاتی ئێمەدا بەرامبەر بە توندوتیژی ئامادەبوون. بەر لە توندوتیژی ئیسلامییەکان توندوتیژی هێزە مارکسیی و ناسیۆنالیستەکان ئامادەبووە. مارکسیزم لە ڕۆشنبیری و کولتووری سیاسی ئێمەدا ڕۆژگارێکی درێژ باڵادەستبووە و تا ئێستاش بەشێکە لە «ویژدانی ڕۆشنبیرییمان». لەبیرمان نەچێت زۆربەمان تا دوێنێ مارکسی بووین، باوەڕمان بەو بۆچوونانەی مارکس هەبوو، هەندێک لە سەرکردەی هێزە ئاینییە توندڕەوەکانی ئەمڕۆکە سەردەمانێک مارکسی بوون، بەشێکی گەورەی ڕۆشنبیرانی مارکسی دوێنێ ئەمڕۆ ئیسلامین. بۆیە ئەم تێڕوانینانە بۆ توندوتیژی نامۆنین بەو ناوەندەی ئەمڕۆکە ئیسلامی سیاسی تێیدا دەستبەکارە، ئەم تێڕوانینانە لە خەیاڵی سیاسی و کولتووریی و فیکری ئێمەدا ئامادەبووە، ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ پێییەکیان لەناو ئەم خەیاڵەدایە و پێیەکەی دیکەیان لەنێو ئەو فۆرمە کوشندانەی توندوتیژیدایە کە مێژوو و کەلەپووری ئیسلام پێشکەشیان دەکات. بە مانایەکی دیکە ئیسلامییە توندڕەوەکانی ئەمڕۆ لە بۆشاییەوە نەهاتوون، ئەوان لەو ناوچەیەدا ژیاون کە هەموومانی تێدا ژیاوین و ئەو هەوا فیکری و ڕۆشنبیری و ڕەمزییەیان هەڵمژیوە کە هەموومان هەڵمانمژیوە. ئەم هێزانە ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دەربارەی ڕۆڵی پۆزەتیڤی

بەکارهێنانی توندوتیژی بە کۆمەڵێک ئەزموونی تاریکی هاوچەرخی دەسەڵات و بە کۆمەڵێک دۆگمای دینی تێکەڵدەکەن کە دەرەنجامەکەی ئەو قەسابخانە بەردەوامانەیە کە ئەنجامیان ئەدەن. ئەم هێزانە لەدوای سی و پێنج ساڵ بەعس و دوای ٢٥ ساڵ شۆڕشی ئێرانی و دوای دەیەیەک لە ئەزموونی توندڕەوی گروپە ئیسلامییە نوێکانی وەک ئەزموونی حەماس و ئەل قاعیدە و لەشکری محەمەد و وەهابیزمی نوێ، بە دۆخێک گەیشتوون کە تێیدا بەکارهێنانی توندوتیژی لە فۆرمە کۆکوژیەکەیدا هیچ پرسیارێکی ویژدانی و ئەخلاقی لای بکەرەکانی دروستنەکات. تەنانەت گەر ئەو بکەرانە بەخێرهاتن و چەژنەپیرۆزەشیان لەگەڵدا کرابێت لەلایەن ئەوانەوە کە دەیانکوژن.

بەڵام ئیسلامییەکان تەنها لەنێو ئەم هەوا و کەشە هاوچەرخەوە نەهاتوون، ویژدانی ڕۆشنبیرییان تەنها ئەم مێژووە هاوچەرخە دروستینەکردوە، ئەوان لە کەلەپووری ئیسلامدا دەیان وێنە و نموونە و ئەزموونی خوێنین دەناسن کە ڕۆحی بەکارهێنانی توندوتیژییان لەلا بەهێزتر دەکاتەوە و بە فۆرمی هێجگار ناشیرنی بەکارهێنانی توندوتیژیان ئاشنادەکات. با چەند نموونەیەک لەو مێژووە خوێنینەوە بهێنینەوە

نووسەری میسری ئیمام عدالفتاح ئیمام لە کتێبێکی زۆر نایابدا بەناوی «ستەمگەر» ەوە و لە بەشێکدا بەناوی «ستەمگەر لە بەرگی دیندا» هەندێک ڕووداومان بۆ دەگێڕێتەوە کە ڕادەی توندوتیژبوونی ستەمگەرە موسڵمانەکانمان نیشانئەدات. با سەرنجبدەینە ئەم چەند نموونەیە:

ئەبول عەباسی سەفاح، دامەزرێنەری دەوڵەتی عەباسی، کە دێتە سەر حوکم یەکێک لەو کارانەی لەسەرەتادا ئەنجامیئەدات هەڵدانەوەی گۆڕی خەلیفە ئەمەوییەکان و دەرهێنانی تەرمەکانیانە لە گۆڕەکانیان، دواتر هەڵواسینی ئێسقانەکانیانە لە شوێنە گشتییەکاندا و دوای ئەوەش سوتاندنیان و ئینجا بڵاکوردنەوەیانە بە هەودا. ( خوێنەر دەتوانێت ئەم نموونەیە بە نموونەی هەڵدانەوەی گۆڕی پیاوە ئاینییەکانی ناوچەی تەوێڵە و بیارە لەلایەن جوندول ئیسلامەوە، بەراوردبکات)

سەرەڕای ئەو کارەی سەرەوە سەفاح ژمارەیەکی زۆری لە ئەمەوییە کۆنەکان دەکوژێت و دوایی ئەیانپێچێت لە سفرەیەکەوە و دەستئەکات بەنانخواردن لەسەر

تەرمەکانیان، هەندێکیان لە ژێر سفرەکەدا هێشتا نەمردوون و دەناڵێنن و دەجوڵێنەوە بەڵام ئەو بەردەوام دەبێت لە نانخواردندا.

یەکێک لە سەرکردەکانی لەشکری عەباسی کە دەچێتە ناو دیمەشق و داگیریدەکات، بە سەربازەکانی دەڵێت کە بۆ ماوەی سێ سەعات بۆیان هەیە خەڵکی شارەکە بکوژن، بۆ ماوەی حەفتا ڕۆژیش مزگەوتەکەی دیمەشقیش دەکاتە تەویلەی وڵاخ و حوشترەکانی.

ڕووداوی کوشتنی (ئیبن موقەفەع)یش نموونەیەکی دیکەی بەکارهێنانی توندوتیژییە لە مێژووی ئیسلامدا کە سادیەتێکی گەورەی لێدەبارێت. ئیبن موقەفەع خوێندەوارێکی گەورەی سەردەمەکەی خۆی بووە و شارەزاییەکی باشی لە کولتووری یۆنانی و عەرەبی و فارسیدا هەبووە و بەشێکی گرنگی کتێبەکانی ئەرستۆی بۆ عەرەبی وەرگێڕاوە. ئەم پیاوە کتێبێک دەنوسێت و دەینێرێت بۆ ئەبو جەعفەری مەنسور کە تێیدا ئامۆژگاری مەنسور دەکات چۆن حوکمبکات و چۆن خۆراسان و عێراق و شام بەڕێوەببات. مەنسور خۆی لەهەموو نەسیحەت و ئامۆژگاریەک بەگەورەتر دەزانێت و لەم کارەی ئیبن موقەفەع توڕەدەبێ. چونکە ئیبن موقەفەع لە بەسرە دەژیا، مەنسور هەواڵ دەنێرێت بۆ والی بەسرە کە ئیبن موقەفەع بکوژێت. والیش بە پیلانێک ئەم ڕۆشنبیرە داوەت دەکات، کاتێک ئیبن موقەفەع دەگاتە کۆشکی والی دەبینێت تەنورێک داخروە. پاسەوانەکان کە ئیبن موقەفەع دەبینن دەیگرن، هەرجارەی پارچەیەک لە لەشی دەکەنەوە و بەبەرچاوی خۆیەوە فڕێئەدەنە ناو تەنورە داخراوەکەوە، تا دەمرێت.

**٩- لەنێوان مارکس و ئەبول عەباسی سەفاحدا**

بە کورتی توندوتیژی هێزە ئوسولییەکانی ئەمڕۆ لەیەککاتدا لەنێو کۆمەڵێک بۆچوون و ئەزموون و تێڕوانینی نوێدا و لەنێو کۆمەڵێک نموونە و ئەزموونی کەلەپوریی و مێژوویی کۆندا نیشتەجێیە. ئەم هێزانە منالی سەردەم و ڕۆژگارێکی زۆر توندوتیژ و خوێناوی و بێدیالۆگین، وەکچۆن چاویان لەهەندێک ئایدیالی پێشین و وێنەی باوکی ترادیسیۆنی و دینییە کە ئەوانیش لەناو توندوتیژی فیزیایی و ڕەمزیدا نووقمن. تێڕوانینیان بەرامبەر بە توندوتیژی لەسەرێکەوە درێژکراوەی تێڕوانینی ئەو تێز و تیورە و فەلسەفە هاوچەرخانەیە کە ساڵانێکی

درێژ لە فەزای سیاسی و کولتووری ناوچەکەدا ئامادەبوون، لەسەرێکی دیکەوە لەدایکبووی لێکدانەوە و خوێندنەوە و وەرگرتنی کۆمەڵێک چەمک و ئەزموون و تێڕوانینی ناو مێژووی ئیسلامن. ئەم دوو ئەزموونە لە ساتێکی مێژوویی پڕ قەیراناویدا بەیەکدی تێکەڵدەبن و ئەو جیهانە تۆقێنەرە دروستدەکەن کە بە زمانی خوێن و مەرگ و بێزیزی بەرامبەر بە ژیان ئەدوێت. ئەوەشی تیرۆری بە ئاستێکی تۆقێنەر گەیاندووە بڵاوبوونەوەی ئاسان و بەرفراوانی تەکنۆلۆژیای کوشتنە. قایشی پڕکراو لە دینامیت، داهێنراوێکی تەکنۆلۆژی تازەیە و سی ساڵێک لەمەوبەر لەئارادا نەبوو. هەموو ئەمانەش ڕەوگەیەکیان، سیاق، دروستکردوە کە تێیدا دین بەربەریترین ساتەوەختەکانی خۆی بژی، بەربەریەتێک کە لەسەر تێکەڵکردنێکی ناشیرینی بەربەریەتی تەکنۆلۆژیا و بەربەریەتی خەیاڵگەی ئاینی دەژی.

ئەوەی ئەم خەرەندی توندووتیژییە قووڵتر دەکاتەوە ئەو کۆمەڵە ئەزموونە سیاسیە نوێیەی ناوچەکەن کە سەرتاپا نووقمی ناو بەکارهێنانێکی توندڕەوی توندوتیژین لەوانە ئەزموونی ناسیۆنالیزم و ئیمپریالزیم، ئەزموونی سۆسیالیزم و فاشیزم و نازیزم و بەعسیزم و کەمالیزم و ناسریزم کە هەریەکێکیان پێییەکی لەناو تەکنۆلۆژیای لەناوبردنی هاوچەرخ و نوێدایە و پێیەکەی دیکەیان لەناو ئەو ڕێباز و بۆچوونە دینی و فیکری و ئایدیۆلۆژیانەدایە کە توانایەکی گەورەو و هەمەلایەنیان هەیە لە بە شەیتانکردنی ناحەزەکانی خۆیاندا و لە سەندنەوەی سیفەتی ئینسانبوون و لێیان و دواجار بەخشینی شەرعەیەت بە خود بۆ کوشتن و لەناوبردنی ئەویدی.

کۆمەڵناسی سکۆتلەندی جیل ئیلیۆت لە کتێبێکدا کە لەساڵی ۱۹۷۲ نووسیویەتی باس لەوە دەکات کە لەساڵی ۱۹۰۰ ەوە تا ساڵی ۱۹۷۲ زیاد لە ۱۱۰ ملیۆن ئینسان بەدەستی ئینسان کوژراون. لەدوای ساڵی ۱۹۷۲شەوە تا ڕووداوەکەی هەولێر توندوتیژی ڕانەوەستاوە، بەڵکو ژمارەی قوربانیانی توندوتیژی دەیان ملیۆن زیادیکردوە و تا ئێستاش لە زیادبووندایە. سایکۆلۆژی بەناوبانگ ولیەم جێمس وێنەیەکی تەڵخمان دەربارەی مێژووی مرۆڤایەتی ئەداتێ و سەرتاپای مێژوو بە «حەمامی خوێن» لە قەڵەم ئەدات.

لە کۆتایداچەند ئیرادەیەکی سیاسی و سەربازی و ئەمنی پێویستە بۆ

وەڵامدانەوەی ئەو گروپانەی کۆکوژی وەک کۆکوژیەکەی هەولێر ئەنجامئەدەن، چەند گرنگە تۆڕی ڕێکخستن و یارمەتی و خۆشاردنەوەی ئەو هێزە تێرۆریستانە ئاشکرابکرێن و بگیرێن و سزا بدرێن، ئەوەندەش گرنگە کولتووری سیاسی و کۆمەڵایەتی باڵادەست لەو چەمک و بۆچوون و دیدانە پاکبکەینەوە کە توندوتیژی بەرهەمدەهێنن. ئەم ئەرکەیان لەوی یەکەمیان ستراتیژیتر و قورسترە. بنیادنانی ئیرادەیەکی ڕۆشنبیریی ڕەخنەگر و ئیرادەیەکی فەرهەنگی کراوە و ئیرادەیەکی سیاسی دیالۆگکەر، کە زمان و توانای گفتوگۆکردن لە تاریکترین و بێزمانترین سوچ و قوژبنەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا بچێنێت، یەکێ لە وەڵامە هەرە ڕاستەکانە بە ڕووداوەکەی هەولێر.

# ڕۆژنامەنووسانی کوردستان لەنێوان حیزب و کۆمەڵگادا

## ١- سەرەتا

ئەم ووتارە تەرخانە بۆ لێدوان لە کۆمەڵێک لە کێشەکانی ڕۆژنامەگەریی لە کوردستانی ئەم دەیەی دواییدا. بۆ ئەم مەبەستەش بە ڕووداوێک دەستپێدەکات کە توانای ئاشکراکردنی زیاد لە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی ئەو کێشانەی هەیە و لەهەمانکاتدا دەتوانێت ئاسۆیەکی تایبەت بۆ کۆمەڵێک گۆڕانکاری گرنگ دەستنیشانبکات. لەڕاستیدا گۆڕانکاری لە کایەی ڕۆژنامگەریی لە کوردستاندا دەبێت فرەلایەنەبێت، لەسەرێکەوە کایەی ڕۆژنامگەریی خۆی وەک کایەیەکی سەربەخۆ پێویستی بە تازەبوونەوە هەیە. لەسەرێکی دیکەوە ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان ڕۆژنامەگەری و کۆمەڵگای کوردیدا دروستبووە پێوسیتییان بە پێداچوونەوەیەکی ڕیشەیی هەیە و لەمەش گرنگتر ئەو پەیوەندییانەی کە ڕۆژنامگەریی وەک کایە و ڕۆژنامگەران وەک تاکەکەس بە نوخبەی سیاسی دەسەڵاتدارەوە لە کوردستاندا گرێدەدەن، پێویستیان بە گۆڕانکارییەکی قووڵ و هەمەلایەن هەیە.

## ٢- ڕووداوێکی پڕ مانا

لە ژمارە (٥)ی ڕۆژنامەی «ڕای گشتی»دا، کە مەم بورهان قانیع سەرنووسەریەتی، هەواڵێک بڵاودەبێتەوە گوایە تورکیا دەستیگرتووە بەسەر ٢١٥ ملیۆن دۆلاری پارتی دیموکراتی کوردستاندا. بەپێی ئەو هەواڵە ئەم پارەیە بە کاک عارف تەیفوری ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە و ویستوویەتی بیبات بۆ ئەوروپا و لەوێ بیخاتە بانکەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان ئەم هەواڵە بەدرۆدەخاتەوە و دوای ئەویش ڕۆژنامەی «ڕای گشتی» ناڕاستی هەواڵەکە دەسەلمێنێ و داوای لێبوردنیش لە پارتی دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دادگای هەولێر بە نووسراوێکی ڕەسمی

سەرنووسەری ڕۆژنامەی ڕای گشتی بۆ هەولێر بانگدەکات و هۆی بانگکردنەکەش بۆ شکاتێک دەگەڕێتەوە کە کاک عارف تەیفور لە مەم بورهان قانیعی کردوە و بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناڕاست و زڕاندنی ناوبانگی شەخسی و سوکایەتیکردن بە پارتی، تاوانباریکردوە. مەم لە سلێمانییەوە دەچێت بۆ هەولێر و دەگاتە دادگا، بەڵام داوەری لێکۆڵینەوەوە ڕازینابێت بە کەفالەت مەم بەرەڵابکات و بڕیاری شەش ڕۆژ زیندانکردنی بۆ دەردەکات. دوای تەواوبوونی شەش ڕۆژەکە هەمان داوەر دوازدە ڕۆژی دیکەی بۆ تازەدەکاتەوە و دوای ئەویش شەش ڕۆژی دیکەی دەخاتە سەر تا دەگاتە ٣٤ ڕۆژ. لەو ماوەیەشدا داوەرەکە بە ڕاشکاوی بە پارێزەرەکەی مەم دەڵێت کە بەبێ هێنانی نامەی تایبەت لە کاک عارفەوە مەم بەرنادات. بۆ ماوەی زیاد لە دوو هەفتەش هەموو پەیوەندیەک لەنێوان مەم و خێزان و کەسوکار و ناسراوەکانیدا یاساغ دەبێت و ناهێڵن لەکاتی سەردانی هەفتانەی زیندانییەکاندا سەردانی بکرێت. مەسەلەی سەرلێدان و بینینیشی هەر پێویستی بە ڕازیبوونی کاک عەرف دەبێ و یەکەم سەردانی ئەم ڕۆژنامەنووسە گیراوە لەڕێگای کاغەزێکی تایبەتی سکرێتەرەکەی کاک عەرف تەیفورەوە ئەنجامئەدرێت. کاک عارف داوای ناوی ئەو سەرچاوەیە لە مەم دەکات کە لە هەولێرەوە هەواڵەکەی بۆ سلێمانی ناردوە، هێشتنەوەی مەمیش لە زینداندا بەو هیوایەبووە کە ناوی ئەو سەرچاوەیە ئاشکرابکات.

دواجار دوای تێکەوتنی کۆمەڵێک کەسایەتی ناسراو، کاک عارف بڕیاری بەربوونی ئەم ڕۆژنامەنووسە ئەدات. بەڵام مەرجەێک بۆ کاکە مەم دادەنێت بۆ بەردانی کە بریتییە لە نووسینی نامەیەک تیایدا داوای پەشیمانبوونەوە و لێبوردن لە کاک عارف بکات، مەم نامەیەک دەنوسێت و کاک عارف بەدڵی نابێت، بۆیە ناچار نامەیەکی دیکە دەنوسێت. دوای قبوولکردنی نامەی دووهەمی مەم لەلایەن کاک عارفەوە ئیدی حاکمەکە مەم بە کەفالەت بەردەدات تا ڕۆژی داوەریکردن.

دەکرێت چەند ئاستێکی گرنگ لەم ڕووداوەدا لەیەکدی جیابکەینەوە و بەمشێوەیە ڕیزیان بکەین:

یەکەم: ئاستی دەستنیشانکردنی چییەتی کاری ڕۆژنامەنووسی و ئەرکی ڕۆژنامەنووس و مەسەلەی پەیوەندی نێوان هەواڵ و ئاشکرابوون.

دووهەم: ئاستی ئەو پەیوەندییەی کە ڕۆژنامەنووس و سیاسی، ڕۆژنامەنووسیی و حیزب لە کوردستاندا بەیەکدیەوە گرێدەدات.

ئاستی سێهەم: لێدوانە لە چەمکی «حوکمی یاسا» و وردبوونەوەیە لەو پەیوەندییەی دادگاکانی کوردستان بە حیزب و سیاسییەکانی کورد و ڕۆژنامەنووسانەوە گرێدەدات.

**٣ـ هەندێک ڕاستی سادە**

یەکێک لە بەڵگەنەویستە هەرە سادەکانی ژیانی دیموکراسییانە ئەو ڕاستییەیە کە بەبێ ڕۆژنامەنووسی سەربەخۆ و ڕەخنەیی و پشکنەر، کە ئازادی گەڕان و پشکنین و چاودێریکردنی هەبێت، بەبێ ڕۆژنامەگەرییەک لە دوورییەکی تایبەتەوە لە ڕووداوەکان بڕوانێت و بابەتییانە و بوێرانە شتەکان باسبکات، بەبێ ناوەندێکی سیاسی و سیستەمێکی کولتووری و پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی کە ئامادەبێت بدوێت و بەئاشکرایی باسی کێشە و گرفت و توانا و هێز و نەخۆشی و لاوازییەکانی بکات. واتە بەبێ ئامادەگی کۆی ئەو شتانەی سەرەوە ناتوانین باس لە دیموکراسیەت و سیستەمی دیموکراسی بکەین. بوونی ئەم مەسەلانە ئەلف و بای دیموکراسیەت و هەنگاوی هەرە سادە و هەرە سەرەتایی بنیادنان و پتەکوردن و پاراستنی سیستمێکن بە خۆی بڵێت دیموکراس.

ڕۆژنامەنووس بوونەوەرێکە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە دامەزراندنی پایەکانی کۆمەڵگا و سیستمێکی سیاسی و کولتووریدا بوێرێت باسی خۆی و کێشە و گرفت و مژدە و نەهامەتییەکانی بکات. ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە بوونەوەرێکە قسەکەر، لە ڕێی قسەکانیشیەوە هەوڵی ئەوە ئەدات ئەو کۆمەڵگا و ناوەندە کولتووری و سیاسییەی تێیدا دەژی ناچار بە قسەکردن بکات تا بزانرێت چی لە خەیاڵ و هەست و ویستی ئەو هێزانەدا ئامادەیە کە لەو کۆمەڵگایەدا دەژین. قسەکردنی ڕۆژنامەنووس کۆمەڵێک ئەرکی گرنگ جێبەجێدەکات کە پشتگوێخستنیان نەک تەنها زیانی بۆ مەسەلەی ئاشکارایی و فرەدەنگی و دیموکراسیەت دەبێت، بەڵکو زیانی بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئینسان و مەسەلەی ڕێزدانان بۆ بەها ئینسانییەکانیش دەبێ. قڕوقەپکردنی ڕۆژنامەنووس و بێدەنگبوونی ڕۆژنامەگەریی ئەگەری سوکایەتیکردن بە ئینسان و کۆمەڵگا و

بەها ئینسانییەکان گەورەدەکات. ئەو کۆمەڵگایەی ڕۆژنامەنووسانی بێدەنگن کۆمەڵگایەکە نە خۆی دەناسێت نە جیهان و نە ئەو هێزانەی کەتێیدا ئامادەن. من لێرەدا و بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسێکی قسەکەر هێمایەکی خێرا بە سیان لەو ئەرکە گرنگانە دەکەم کە جێبەجێنەکردنیان زیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری گەورەیان لێدەکەوێتەوە:

کاری سەرەکی ڕۆژنامەنووس بریتییە لە بەرهەمهێنان و دۆزینەوە و بلاکوردنەوەی زانیاری، بەلام زانیاری ڕاستەقینە و متمانەپێکراو و هەمەجۆر دەربارەی ئەو شتانەی لە کۆمەڵگادا ڕوودەدەن. بلاکوردنەوەی زانیاریش مانای ئاشکراکردن و بەگشتیکردن و مەرەخەسکردنی ئەو زانیاریانە بۆ بەردەمی هەموو ئەو تاکەکەس وگروە و هێز و لایەنە جیاوازانەی لە کۆمەڵگادا ئامادەن و بەسەریەکەوە ژیانی گشتی ئەو کۆمەڵگایە بەڕێوەدەبەن. تەنها لەڕێگای ئاشکرابوونی زانیارییەوە هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگایەک دەتوانن بزانن چی لەو کۆمەڵگایەدا ڕوودەدات و چۆن و بە چ ئاراستەیەکدا مەسەلەکان گەشەدەکەن.

ئەرکی دووهەمی ڕۆژنامەنووس بریتییە لە خستنەڕوو و نیشاندانی کۆی ئەو ڕاو بۆچوون و دید و وێناکردن و چاوەڕوانییە جیاواز و ناکۆکانەی لە کۆمەڵگادا ئامادەن، بەخشینی هەلی بلاوبوونەوە و ئاشکرابوون بەهەر یەکێک لەو شتانەش. مەبەست لەم کارەش ئەوەیە هەم کۆمەڵگا وەک گشتێک و هەم هێزە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگایە وەک بەشی تایبەت لەوە ئاگاداربکرێنەوە کە خەڵکی جیاوازی ئەو ولاتە چۆن بیر لەو کێشە و مەسەلە و ڕووداوانە دەکەنەوە کە ڕووبەڕوویان دەبنەوە، چیان دەربارە دەڵێن و چۆن وێنایان دەکەن و چ دیدێکیان بۆ چارەسەرکردنیان هەیە و چاەڕوانی چیش دەکەن.

کاری سێهەمی ڕۆژنامەنووس بریتییە لە بەرپاکردن و خستنەوەی کۆمەڵێک لێدوان و دیالۆگ و کێبەرکێی فیکری ئاشکرا. مەبەست لەم ئەرکەش دامرکاندنەوە و هێمنکردنەوەی ئەو جیاوازییە ئایدیۆلۆژی و فیکری و سیاسییانەیە کە لەئارادان و گۆڕینی «توندوتیژی فیزیکی» و مادیی ئەو هێزانەیە بۆ «توندوتیژی ڕەمزی». بە مانایەکی دیکە ئەرکی ڕۆژنامنووس ئەوەیە کارێکبکات کە هێزە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئاینی و کولتوورییە جیاوازەکان

باتی ئەوەی فیشەک بەیەکدیەوە بنێن، ووشە و فیکر و بۆچوون و چەمک و
ڤەکردن و لێکدانەوە بەیەکەوە بنێن، لەباتی ئەوەی لەسەر لوتکەی شاخ و ناو
ار و پەنای گوندەکاندا توندوتیژانە بەگژیەکدیدا بچنەوە، لەسەر لاپەڕەی
ۆژنامەکان ململانێبکەن.

بێگومان جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانە کارێکی ئاسان نییە، بەرهەمهێنان و
زینەوە و بڵاکوردنەوەی زانیاری مەسەلەیەکە تەنها وابەستەی بەقسەهاتنی
ۆژنامەنووس نییە، بەڵکو پێویستی بە کۆمەڵێک مەرجی تایبەتی دیکەش هەیە
ە لەدەرەوەی دەسەڵاتی ڕۆژنامەنووس خۆیدایە. ڕۆژنامەنووس بۆئەوەی بتوانێت
نیاری دەربارەی ئەو ڕووداوانەی لە کۆمەڵگاکەیدا ڕوودەدەن دەستبکەوێت و
ڵاویکاتەوە، دەبێت سەرچاوەی جیاوازی هەواڵی هەبێت، دەبێت کۆمەڵگایەک و
وەندێکی سیاسی و ئەخلاقی و کولتووری لەبەردەمدابێت ئامادەبن بدوێن و
نیاری بدانە ڕۆژنامەنووسان و لەڕێی ئەوانیشەوە بە هەموو بەشە
یاوازەکانی کۆمەڵگا. کۆکردنەوە و بڵاکوردنەوەی زانیاری ئەرکێکی
ۆمەڵایەتییە و پێویستی بە هاریکاری گەمەکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و
ولتووری و ئاینی و هونەرییەکان هەیە لەگەڵ یەکدا و لەگەڵ ڕۆژنامەنووساندا.
هیچ شوێنێکی جیهاندا ڕۆژنامەنووسێک نادۆزینەوە بە تەنها بتوانێت هەموو
و هەواڵ و زانیاری و باس و خواسە گرنگانە کۆکاتەوە کە لە کۆمەڵگایەکدا
ودەدەن، ڕاستە ڕۆژنامەنووس دەبێت توانایەکی تایبەتی بینین و بیستن و
بینکردنی هەبێت، بەڵام ئەمە بەتەنها بەس نییە بۆ ئاگاداربوون لە کۆی ئەو
وداوانەی لە کۆمەڵگادا ڕوودەدەن. کۆمەڵگایەک بۆئەوەی خۆی بناسێت
ویستی بە قسەکردنی کۆی ئەو گەمەکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و
ولتوورییانە هەیە کە لەو کۆمەڵگایەدا ئامادەن و ڕووداوەکان دروستدەکەن.
وقمبوونی ئەم لایەنانە لەناو کاری نهێنی و ژێرپەردەیی و شاراوەدا
ەنجامی خراپی دەبێت بۆ خودناسی کۆمەڵگا. کۆمەڵگایەکیش خۆی نەناسی،
یزانی چۆن بڕیارەکانب دەدرێن و کێ دەیندات و بۆ، کۆمەڵگایەکە باوەڕ بە
ژنامەنووسەکانی خۆی ناکات. لەکوێشدا ڕۆژنامەگەریی بووە هۆی شوێنی
ەرپێنەکردن ئەوا لەوێدا بەهاکانی سیاسەت و نرخی سیاسەتمەدارانیش
یندارەبێت.

لەمانەش بترازێت شاردنەوەی زانیاری پەیوەندییەکی دوژمنکارانە لەنێوان ڕۆژنامەنووسان و ئەو کایە سیاسییانەدا دروستدەکات کە بەرپرسی ئەو زانیاریانەن، لەهەمانکاتدا بێباوەڕییەکی گەورەش لەنێوان کۆمەڵگا و گەمەکەرە سیاسییەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا دروستدەکات.

## ٤- ڕۆژنامەگەریی و هەواڵ

ئەوانەی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا لێزانن بەردەوام پێ لەسەر ئەو ڕاستییە دادەگرن کە ڕۆژنامەی باش وابەستەی بوونی سەرچاوەی هەواڵی باشە، لەکوێدا سەرچاوەکانی هەواڵ باشنەبن ناکرێت قسە لە بوونی ڕۆژنامەگەرییەکی باش بکەین. هەندێک ئەم دیدە قووڵتردەکەنەوە دەڵێن «بەبێ بوونی سەرچاوە ناکرێت قسە لە بوونی ڕۆژنامەگەریی بکەین». جا ئەگەر ئەمە سەرەتاییترین پرنسیپی کارکردنی ڕۆژنامەگەریی بێت و نرخ و بەهای هەر ڕۆژنامەیەکیش بە ڕادەیەکی زۆر وابەستەی نرخ و بەهای ئەو هەواڵانەبێت کە بڵاویاندەکاتەوە، ئەوا لێرەدا ئەو پرسیارەی دەکرێت لەخۆمانی بکەین ئەوەیە: ئایا سەرچاوەکانی هەواڵ لە کوردستاندا چین و کێن، ئازاد و کراوە و ئاشکران یان داخراو و نهێنیی و نەناسراو؟ ئایا حیزبە سیاسییەکانی کوردستان، کە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە لە کوردستاندا دەسەڵاتداران، ئامادەن زانیاری ڕاستەقینە بە ڕۆژنامەکانی کوردستان بدەن؟ ئایا ئەم حیزبانە چ جۆرە هەواڵێک ئاشکرا دەکەن و چیش دەشارنەوە؟ ئایا ڕۆژنامەنووسانی کوردستان دەتوانن زانیاری تەواو لە سەر ڕووکارە جیاوازەکانی ژیانی ئابووری و سیاسی لە کوردستاندا لە دەسەڵاتداران وەرگرن؟

بێگومان من لێرەدا مەودای وەڵامدانەوەی وردی هەریەکێک لەم پرسیارانە نییە، بەڵام بۆ دەربڕینی چەند سەرنجێکی گشتی لەسەر ئەو پرسیارانە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کێشەیەی لە نێوان مەم بورهان قانیع و کاک عارف تەیفوردا دروستبوو. مەم وەک ڕۆژنامەنووسێک و کاک عارفیش وەک دەسەڵاتدارێکی حیزبی. بەبۆچوونی من جەوهەری ئەم کێشەیە وابەستەی شاردنەوەی زانیارییە گرنگەکانە لە کۆمەڵگا لەلایەن حیزبەوە بەتایبەتی شاردنەوەی سادەترین زانیاریش سەبارەت بەو شتەی کە دەشێت بە «ئابووری حیزب» ناونووسیکەین حیزبی کوردی لەسەر شاردنەوەی زانیارییەکان دەژی، نەک تەنها لە خەڵکی

کوردستان بەڵکو لەبەشێکی هێجگار گەورەی ئەندامان و هەوادارەکانیشی. لەم ڕەوتەدا ڕەوایە بپرسین ئایا کۆمەڵگای کوردی لانیکەمی زانیاری ڕاستەقینە و متمانپێکراوی لەسەر توانای ئابووری حیزبە باڵادەستەکانی کوردستان لەبەردەستدایە؟ ئایا ئەم حیزبانە لە ١١ ساڵی ڕابووردودا لانی هەرە کەمی زانیاریان دەربارەی توانا ئابوورییەکانی خۆیان بۆ خەڵکی کوردستان ئاشکراکردوە؟ ئایا هێمایەکی سادەشیان بەوەکردوە کە چیان دەستدەکەوێت و چۆنی سەرفدەکەن و چیان لێهەڵگرتووە؟ گرنگترین خاڵێک لەو هەواڵە سێ دێڕیەدا کە ڕۆژنامەی ڕای گشتی بڵاویکردۆتەوە و مەم بورهان قانیعی لەسەر گیراوە مەسەلەی بردنی ٢١٥ ملین دۆلارە لەلایەن سیاسییەکی کوردەوە بۆ دەرەوەی کوردستان. ئەو پرسیارەی لە پشتی ئەم هەواڵەوە ئامادەیە ئەوەیە: ئایا ڕاستە پارتی دیموکراتی کوردستان لەم چەند ساڵەدا ئەوەندە دەوڵەمەند بووە بتوانێت ئەو بڕە پارە گەورەیە بنێرێتە دەرەوەی کوردستان؟ ئایا سەرچاوە داراییەکانی ئەم حیزبە چین و چۆنن؟ ئایا جگە لە چەند کەسێکی بچووکی ناو حیزب، کە هەوڵی تەواوەتی شاردنەوەی هەر زانیارییەک لەسەر ئابووری حیزب ئەدەن، کەسی دی دەزانێت ئەم ئابوورییە چۆن ڕێکخراوە و چۆن بەڕێوە دەچێت؟

بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە دەبێت بچینە ناو ئەو جەنگەڵە تاریکەوە کە ناوی توانا ئابوورییەکانی حیزبە لە کوردستاندا، جەنگەڵێک کە لە دوای ڕاپەڕینەوە تا ئێستا سادەترین زانیاری متمانەپێکراوی بە کۆمەڵگای کوردی نیشاننەدراوە. هەر ڕۆژنامەنووسێکیش بیەوێت سەرقاڵی ئەم مەسەلەیەبێت، کە بێگومان مەسەلەیکی هێجگار گرنگە، و بیەوێت وەڵامێکی دوور لە درۆ و پڕوپاگەندەکردن بەم پرسیارە بداتەوە، دەبێت زانیاری ڕاستەقینە و جێی متمانەی لەسەر داهاتی حیزبە سیاسییەکانی کوردستان و هەردوو حکومەتەکە لەبەردەستدابێت. دەبێت بزانێت بڕی ئەو پارانەی کە دەستی حیزب دەکەوێت چەندە و بڕی ئەوەی کە خەرجدەکرێت چەندە، چی دەدرێت بە حکومەت و چی دەچێتە دەغیلەکانی حیزبەوە و چیش لەوە دەکرێت کە دەمێنێتەوە، چی لە کوردستاندا دەهێڵدرێتەوە و چی لێدەچێت بۆ دەرەوەی کوردستان و بەناوی کێ و کام کەس و لایەنێکەوە هەڵدەگیرێن؟ زانینی ئەم زانیارییانە، کە زانینیان مافی هەموو کەسێکە لە کوردستاندا بژی، پێویستی بە سیستمێکی سیاسی هەیە لەسەر نهێنی و کاری ژێرپەردەیی و شاردنەوەی شتەکان نەژی، پێویستی بە

ئاشکرایی و شەفافیەت و بڵاکوردنەوەی زانیاری بەردەوام لەسەر چۆنیەتی کارکردنی ئەو ئابوورییە تاریکە هەیە کە حیزب لە کوردستاندا بەڕێوەیدەبات.

ئاشکرایە نەک تەنها ڕۆژنامەنووسان، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان ئەو ڕاستییە سادەیە دەزانن کە لانیکەمی شەفافیەتی ئابووری لە کوردستاندا بوونی نییە و هیچ ڕەهەندێکی ئەو ئابوورییە بۆ نوخبەی دەرەوەی دەسەڵاتدارانی حیزب ئاشکرانییە. دەزگا و لایەنێک نادۆزینەوە بتوانێت سادەترین پرسیار دەربارەی ئەم ئابوورییە بکات و بیەوێت لانیکەمی نهێنییەکانی ئاشکرابێت. مادامەکی حیزن نایەوێت هیچ لایەنێکی ئەم مەسەلانە ئاشکرابن، بۆیە هەر پرسیارێک لەم بارەیەوە دەبێت بە مەزەنە وەڵامبدرێتەوە، نەک ئامار و ژمارە و حیساباتی باوەڕپێکراو قسەبکەن. کە مەزەنە و خەیاڵیش قسەیانکرد ئەوکات ئەوەی ووندەبێت ڕاستییە، کەڕاستیش وونبوو تۆمەت و یەکدی تاوانبارکردن باڵادەستدەبن. لە ڕاستیدا حیزبە سیاسییەکانی کوردستان بەجۆرێک ئابووریی و زانیاریی ئابووریان مۆنۆپۆڵکردوە هەرجۆرە پرسیارکردنێک دەربارەی ئەو ئابوورییە، چەند سادەش بێت، کێشەی گەورە بۆ کەسی پرسیارکەر دروستدەکات. ڕەگە قووڵەکانی ئەو کێشەیەی سەرەوە لەم تاریکسانە ناشیرینەدایە کە عەقڵیەتێکی فیوداڵی بەڕێوەیدەبات.

بێگومان لەهەموو دنیادا سیستمێکی دیموکراسی نادۆزینەوە کەناڵە ئابوورییەکانی ئاشکرانەبێت، نەک تەنها کەناڵە ئابوورییەکانی حیزب و حکومەت و دەزگا ڕەسمییەکان، بەڵکو کەنەڵی کۆمپانیا و کەرت و هێزە ئابوورییە تایبەتەکانیش. نەک هەر ئەمە بەڵکو یەکێک لە کۆڵەکە گرنگەکانی دیموکراسیەت جیاکردنەوەی کایەی ئابووری و کایەی سیاسەتە لە یەکدی، یەکەمین وانەی دیموکراسیەت پێماندەڵێت ئەو کەسەی کە بڕیاری سیاسی لە دەستە نابێت هەمان ئەو کەسە بێت کە بڕیاری ئابووریشی لەدەستە. ئەو کەسەی کە سیاسەت بەڕێوەدەبات ئەو کەسە نییە کە بازاڕیش بەڕێوەدەبات، هەر کەس و لایەن و هێزێکیش هەوڵی کۆکردنەوەی ئەم دوو دەسەڵاتە لەیەک یەکەدا بدات، جگە لە دیکتاتۆریەت و تۆتالیتاریزم هیچی دیمان پێشکەش ناکات.

سەرەڕای ئەوانەش لە وڵاتێکی دیموکراسدا هەموو کەسێک دەتوانێت بزانێت داهاتی نەتەوەیی، خەرجی نەتەوەیی و دەوڵەمەندی و هەژاری دەوڵەت و کۆمەڵگا

و هێزە کۆمەڵایەتییەکان چەندن. ساڵانەش هەموو کۆمپانییەکان حیساباتی دەسکەوت و زیانەکانیان بە ئاشکرایی بڵاودەکەنەوە، سەرچاوەی داهاتی حیزبەکان چییە و چییان هەیە و چۆنیان دەستکەوتوە ئاشکرایە و هەرکەس بیەوێت دەتوانێت بە ئاسانی دەستیبکەوێت. لە کوردستاندا ئەگەرچی حیزبە سیاسییەکان شەوڕۆژ باس لە ئەزموونە دیموکراسییە خۆماڵییەکە دەکەن کەچی هیچ یەکێک لەم مەسەلە گرنگانە لەئارادا نین، کەس نازانێت دەسکەوت و توانای ئابوری ئەو سەرکردە و سیاسییە بەڕێزانە چەندە و چۆنە کە دەساڵێک لەمەوبەر خاوەنی هیچ نەبوون؟ ئەگەرچی حیزب تەنها لەڕێگای ئەم ئاشکرابوون و کراوەییەوە دەتوانێت لەبەردەمی هەمواندا خاوەنی گوتارێکی باوەڕپێکراوبێت و تەنها ئەم ئاشکرابوونەشە دەتوانێت بە کۆمەڵگا ئەو هەستە ببەخشێت کە خاوەنی هێز و توانا و قوورساییەکی تایبەتە و دەتوانێت چاودێری دەسەڵاتدارەکانی بکات و نەهێڵێت وەک فیوداڵێکی مۆدێرن هەڵسوکەوتبکەن و بێ هیچ چاودێری و سانسۆرێک و چۆنیان بوێت دەست بە دەخیلەکانیاندا بکەن و سامانی نەتەوەیی بە ویستی خۆیان خەرجبکەن. دوای زیاد لە ١١ ساڵ دەسەڵاتدارێتی کوردی ئەو ڕۆژگارە بەسەرچوو متمانەی خەڵک تەنها بە ژمارەی شەهیدەکانت بکڕیت، ئەمڕۆکە حیزبە باڵادەستەکانی کوردستان بە لۆژیکی دەوڵەت لەگەڵ خەڵکدا مامەڵەدەکان، لۆژیکی دەوڵەتیش بۆئەوەی نەبێتە لۆژیکێکی تۆتالیتێر و دیکتاتۆری دەبێت لانی کەمی شەفافیەتی هەبێت و خەڵک بزانن ئەو دەوڵەتە خەریکی چییە و چۆن ئەو وڵاتە بەڕێوەدەبات و دەزگاش هەبێت کە لادان و گەندەڵییەکان موحاسەبەبکات. لەڕاستیدا دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆکەی کوردستان چیدی لە دیدی خەڵکدا پێشمەرگەکانی دوێنێ نین، بەڵکو دەسەڵاتدارانی خاوەن لەشکر و دەزگا و سەرمایەی تایبەتن. لە دۆخێکی لەو بابەتەشدا ئەوەی متمانەی خەڵک دەباتەوە ئەو هێزەیە کە ئاشکرایە و بە ئاشکرایی ژیانی خۆی و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت نیشانئەدات. ئەو هێزە کۆمەڵایەتییەش کە حیزب دەتوانێت لەڕێگایانەوە ئەم ئاشکراکارییە ئەنجامبدات ڕۆژنامەنووسانن.

لەدۆخی نەبوونی سادەترین زانیاریدا لەسەر ئەو مەسەلانەی لەسەرەوە هێمامان پێکردن و لەدۆخی قرووقەپکردنی تەواوەتی حیزبدا لە داهات و دەسکەوت و توانا ئابوورییەکانی، تاقە ڕێگایەک لەبەردەم ڕۆژنامەنووساندا

بمێنێتەوە گوێهەڵخستنە بۆ ئەو هەواڵانەی لە ڕێگای کەناڵە نهێنی و سەرچاوە نەناسراوەکانەوە بڵاودەبنەوە. ئەمەش ئەگەری بڵاکوردنەوەی زانیاری ناڕاست و هەڵبەستراو و پڕوپاگەندەئامێز و ئەگەری تێکچوونی تەواوەتی پەیوەندی نێوان سیاسیی و ڕۆژنامەنووسان گەورەدەکات.

ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە لە هەر شوێنێکی دونیادا بژی سەرقاڵی چاودێریکردن و تێبینیکردن و ئاشکراکردنی هەڵسوکەوت و ئاکاری ئەو لایەنە بەهێز و دەسەڵاتدارانەیە کە بڕیاردانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریان لەژێردەستدایە. لە کوێ دەسەڵات هەبێت دەبێت لەوێدا ڕۆژنامەنووسێک هەبێت چاودێری ئەو دەسەڵاتە بکات، لە کوێش ڕۆژنامەگەرییەکی پێگەیشتوو هەبوو مانای ئەوەی دەسەڵاتێکی پێگەیشتوو هەیە کە ئامادیە چاودێریبکرێت.

مانا قووڵەکانی ڕۆژنامەگەریش لەوەدایە کە ڕۆڵی ئەو ئامرازە ببینێت کە بەهۆیەوە کۆمەڵگا چاودێری دەسەڵاتدارانی بکات، مانا دیموکراسییەکانی دەسەڵاتیش لەوەدایە کە بە کۆمەڵگا کۆمەڵێک ئامراز ببەخشێت بەهۆیەوە چاودێریبکرێت. دەسەڵاتدارێکیش بیەوێت دیموکراس و دادپەروەر و خاوەن ئایندەبێت، دەبێت بنەماکانی ئەو دەسەڵاتەی دروستیکردوە لە دۆخی ئاشکراییەکی بەردەوامدا بژی. شاردنەوەی زانیاری و ڕێگرتن بەبڵاوبوونەوەی زانیاری بەربەستێکی گەورەن لەبەردەم بنیادنانی کۆمەڵگایەکی کراوەدا کە دیموکراسیەت بناغەکەیبێت.

نەبوونی ئاشکرایی کێشەی نەبوونی متمانە و بێباوەڕی دروستدەکات، هەم سیاسییەکان لە کاری ڕۆژنامەنووسان بەدگومان دەبن و هەم ڕۆژنامەنووسانیش لە ئاکاری سیاسییەکان سەد دڵ، نەک تەنها دوو دڵ. ئەو کێشەیەی لەنێوان مەم بورهان قانیع و کاک عارف تەیفوردا دروستبووە لەم هاوکێشەیە بەدەر نییە. گەر لە ١١ ساڵی ڕابووردودا دەفتەری حیساباتەکانی حیزب کراوەبووایە و خەڵک لەوە ئاگاداربوونایە حیزب چی هەیە و چی نییە، ئەوکات بڵاکوردنەوەی هەواڵێکی لەو بابەتە ئەو نرخەی نەدەبوو و ئەو کێشەیەشی لەنێوان ئەو ڕۆژنامەنووس و سیاسییەدا نەدەخستەوە. خودی ئەم کێشەیە وادەکات ناچاربین لە چۆنیەتی کارکردنی ئەو سیستمە ڕۆژنامگەرییە بدوێین کە حیزب لە ١١ ساڵی ڕابووردودا بۆ شاردنەوە و ئاشکرانەکردنی

زانیاری لە کوردستاندا دروستیکردوە و لەو دەرەنجامانەش بدوێین کە ئەم سیستەمە بۆ ڕۆژنامەگەریی سەربەخۆ دروستیاندەکات.

**٥- کێشەی مامەڵەکردنی ڕۆژنامەنووس وەک فەرمانبەری حیزب**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لە کێشەی ئاشکرانەکردن و شاردنەوەی زانیاری کرد و لەوەدواین کە «ئابوری حیزب» جەنگەڵێکی تاریک و سەرزەمینێکی نەناسراوە. ئەوەشمان ووت کە لەدۆخێکی لەو بابەتدا ڕۆژنامەنووس بۆ بەدەستهێنانی زانیاری ناچارە گوێ بۆ سەرچاوەی نهێنی و شاراوە ڕاگرێت. ئەمەش هەم لە ئێستادا کێشەی دورستکردوە و هەم لە ئایندەشدا کێشەی دی دروستدەکات. با ئێستا سەرنجبدەینە ئەو پەیوەندییانەی کە ڕۆژنامەنووس و حیزب لە کوردستاندا بەیەکدیەوە گرێدەدات.

لە ڕۆژی لەدایکبوونییەوە، ڕۆژنامەنووس بوونەورێکە شوێنی سەرنجی سیاسەتمەدار و دەسەڵاتداران. هەم لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا و هەم لە سیستەمە دەسەڵاتگەر و دیکتاتۆری و تۆتالیتێرەکاندا و هەم لەو سیستەمانەشدا کە لەنێوان ئەم دووانەدان، ڕۆژنامەنووس ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی نهێنی و ئاشکرای ئەو سیستەمانەدا دەگێڕێت. هەر یەکێک لەو سیستەمانە پێویستییەکی گەورەی بە مۆدێلێکی تایبەتی ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامگەریی هەیە. بزوتنەوە نەتەوایەتییەکان، بزوتنەوە چینایەتییەکان، بزوتنەوەی ژنان و پیران و مناڵان، بزوتنەوەی بەرگری لە ژینگە، لە گیانلەبەرە دەگمەن و نادەگمەنەکان و چەندانی دیکەش، هەموویان پێویستییەکی بەرچاویان بە ڕۆژنامەنووسان هەیە. هەموو ئەم لایەنانە خوازیاری ئەوەن کە ڕا و بۆچوون، باس و خواس، ویست و چاوەڕوانییەکانیان، لەڕێی ڕۆژنامەنووسان و کاری ڕۆژنامەگەرییەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا بڵاوبێتەوە و هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا بە خۆیان و داخوازییەکانیان ئاشناکەن. ئەم توانای ناساندن و ئاشناکردنەیە وایکردوە هەموو سیاسییەک ئەو ڕاستییە بزانێت کە بۆ گەیاندنی هەواڵ و پلان و پەیامەکانی بە دەرەوەی خۆی پێویستی بە ڕۆژنامەنووسان و سیستەمێکی تایبەتی ڕۆژنامەگەریی هەیە کە لەگەڵ کاراکتەری ئەو سیستەمەدا بگونجێت کە دەیەوێت بەرقەراریبکات. ڕەنگە لە دیدی سیاسییەکاندا ڕۆژنامەنووس گرنگترین گەمەکەرێکی کولتووری بێت.

پێویست ناکات بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دوور بڕۆین و نموونە لە شوێنانی دی بهێنینەوە، با لە عێراقەوە دەستپێبکەین. لە سی ساڵی ڕابووردودا ڕۆژنامەنووسانی بەعس ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە و دەبینن لە دارشتنی خەیاڵی کۆمەڵایەتی و دیسپلینکردنی ئەو جیهانە ڕەمزییەدا کە ئینسانی عێراقی تێکەوتووە. بەبێ ڕۆژنامەنووس و میدیا زەحمەت بوو بەعس بتوانێت کۆمەڵگای عێراقی لەسەر مۆدێلی سەربازگەیەکی گەورە بینابکات. ئەم پرۆسەیە بۆ بەعس بەڕادەیەک گرنگ بوو کە دەوڵەت هەزاران تەلەفیزۆنی بەخۆڕایی بەسەر خەڵکە گوندنشینەکانی خوراوی عێراقدا بڵاکوردەوە. ئەو ڕۆژنامەنووسەشی لەم پرۆسە گەورەیەی دیسپلینکردن و بە سەربازگەکردنەدا چالاکانە بەشدرابوویێت پلە و پایە و توانای مادی و مەعنەوی گەورەی خراوەتە بەردەم و شوێن و جێییەکی گرنگی بەدەستهێناوە. بە واتایەکی تر ئەگەر ڕۆژنامەگەریی بۆ بەعس یەکێک لە کۆڵەکە گرنگەکانی دامەزراندنی ئەو سیستمە تۆقێنەرەبووبێت کە دیمان، ئەوا بۆ ڕۆژنامەنووسە گوێڕایەڵەکان ئامرازێک بووە بۆ جێگۆڕکێی کۆمەڵایەتی و گواستنەوە لە پایەیەکی نزمەوە بۆ بەرزتر. هەر دیارترین ڕۆژنامە نووسێک کە ئەم دۆخەی قۆزتبێتەوە تاریق عەزیزە، ئەم پیاوە سەرەتا ڕۆژنامگەرێکی سادەبوو لە ڕۆژنامەی السورە، دواتر بووە وەزیری ڕۆشنبیری و دواتریش یەکێک لە پیاوە گەورەکانی بەعس لە عێراقدا. ئەو ڕۆژنامەنووسەشی ئەم پرۆژەی چاودێری و دیسپلینکردنە خنکێنەرەی بەعسی قبووڵنەبووبێ و بیری لە کۆمەڵگا و جیهان و دەوڵەتێکی دیکە کردبێتەوە، بەعس یان گرتویەتی، یان کوشتویەتی یان شاربەدەری کردوە. درێژە لیستی ئەو نووسەر و ڕۆژنامەنووسانەی بەشێوەیەکی نائینسانی و تۆقێنەرانە لە عێراقدا مامەڵەیان لەگەڵداکراوە.

بەعس لە تێڕوانینیدا بۆ ڕۆژنامەنووسان دوو پرنسیپی سەرەکی بەکارهێناوە: یان ئەوەتە هەمووانی کردۆتە فەرمانبەری حیزب و دەوڵەت و بەم کارەشی وەک کۆیلەیەکی فیکری بەگەڕیخستون و هەموو کاراکتەر و هەوڵ و داخوازییەکی سەربەخۆبوونی لێسەندونەتەوە، یان ئەوەتە دەمی داخستون و گرتونی و ڕاویناون و کوشتونی.

ئەگەر ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسەکانی بەعس بنیادنان و بەهێزکردن و پاراستنی پایەکانی تۆتالیتاریزم بووبێت، ئەوا ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسان لە سیستەمێکی

دیموکراسیدا تەواو پێچەوانەی ئەو ڕۆڵەیە کە بەعس لە عێراقدا بە ڕۆژنامەنووسانی دابوو. لە سیستمی دیموکراسیدا ڕۆژنامەنووسان هێزێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری و ویژدانی گرنگن، کاری سەرەکییان چاودێریکردنی دەسەڵات و ڕێگرتنە لەوەی بەشێوەیەکی خراپ بەکاربهێنرێت. ڕۆژنامەگەرییش یەکێکە لەو ئامرازە گرنگانەی بەهۆیەوە کۆمەڵگا دیموکراسییەکان ڕێ لە کۆبوونەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لەدەستی نوخبەیەکی بچووکدا دەگرن. لە سیستمی دیموکراسیدا ڕۆژنامەنووسان ڕۆژانە باس و خواس و مەسەلە گشتییەکان دەهێننە کایەوە و گفتوگۆ و دیالۆگی کراوەیان لەسەردەکەن، لەسەر کێشە هەنووکەییەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگایە ئەدوێن و دەبنە سەرچاوەیەکی گرنگی بەخشینی زانیاری و داخوازی و چاوەڕوانییەکانی خەڵک بە دەسەڵاتداران بۆ ئاگاداربوون لێیان و مامەڵەکردن لەگەڵیاندا. لەم سیستمەدا ڕۆژنامەنووسان فەرمانبەری حیزب نین و لەژێر سایەی ئەمر و داخوازی و چاوەڕوانییەکانی حیزب و دەوڵەت و حکومەتدا نانووسن. کەمنین ژمارەی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لەم سیستەمەدا توانیویانە حکومەتی وڵاتەکەی خۆیان بڕوخێنن و وەزیر و دەسەڵاتدارانی گەورە ناچار بە دەستکێشانەوە و وازهێنان لە کار بکەن، بێگومان لە کاتی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتدا. ڕەنگە باشترین نموونەی ئەم ڕۆڵە گرنگەی ڕۆژنامەنووسان ئەوەبێت کە سی ساڵێک لەمەوبەر لە ئەمریکادا بینیمان. لە ساڵی ١٩٧٢ دا دوو ڕۆژنامنەنووسی ئەمریکی توانیان بەڕێگای کۆمەڵێک ووتارەوە کۆتایی بە دەسەڵاتی سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا، نیکسۆن، بهێنن و حکومەتەکەی بڕوخێنن. دوو ساڵێک لەمەوبەر لە هۆڵەندا ڕۆژنامەنووسێک لەڕێگای ووتارێکەوە وەزیری کاروباری ناوخۆی هۆڵەندای ناچار بە دەستکشانەوە لە کارکرد. لە زۆر وڵاتی ئەوروپی دیکەشدا، کە دیموکراسیەت بەڕاستی سەروەرە، دەتوانین زۆر نموونەی لەم جۆرە دۆزینەوە.

لە کوردستانی خۆشماندا ڕۆژنامەنووسان لە قۆناغی جیاجیادا ڕۆڵی جیاجیایان گێڕاوە، لە قۆناغی بەرگری و خەباتی چەکداردا ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە کۆکردنەوەی خەڵک لەدەوری شۆڕش و بەخشینی هێزێکی ڕەمزی و ویژدانی بە خەباتی چەکدار، ئەمڕۆکەش ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە کۆکردنەوەی خەڵک لەدەوری حیزب و هێزە سیاسییەکانی کوردستان. ئەم ڕۆژنامەگەرییە، ئەمڕۆدا، هەم خاڵی باشی هەیە و هەم خاڵی خراپ، من لێرەدا مەودای

باسکردنێکی تەواوی ئەو مەسەلانەم نییە، بەڵام چەند سەرنجێکی خێرا لەسەر دۆخی ئەمڕۆی ئەم ڕۆژنامەگەرییە دەردەبڕم.

ئاشکرایە ئەوەی ئەمڕۆ ماشێنی گەورەی ڕاگەیاندنی حیزبەکان بەڕێوەدەبات ڕۆژنامەنووسانی حیزبن. ئەوانن دیدی حیزب بۆ شەڕ و ئاشتی، ئێستا و ئاینده، دیموکراسیەت و کرانەوە، حکومەت و پەرلەمان، ئاین و کۆمەڵگا، یاسا و حوکمی یاسا، دۆست و دوژمن وەردەگێڕنە سەر ووتار و نووسین و ستوون و ڕیپۆرتاج و سەرنج و بڵاویاندەکاتەوە. حیزب چی بوێت وا دەکەن، کە شەڕی دەوێت تەپڵی شەڕی بۆ لێئەدەن و کە باس لە ئاشتیش دەکات باس لە خێروبەرەکەتی ئاشتی دەکەن. لەمڕۆدا هەر یەکێک لە دوو هێزە باڵادەستەکەی کوردستان دەیان ڕۆژنامەنووسی هەیە کە ڕۆژانە هەواڵی ئەو بەشە لە سیاسەتەکانی حیزب ئاشکرادەکەن کە حیزب دەخوازێت ئاشکاریانکات. ئەو قسانە دەنوسن کە حیزب دەیەوێت بنووسرێن و ئەو هەواڵ و زانیارییانە دەکەنە ووتار کە حیزب پێیوایە دەبێت بنووسرێن. ئەم دۆخە وایکردوە بەشی هەرە زۆری ڕۆژنامەنووسانی کورد بە ڕادەیەکی ترسناک بێدەنگدەبن لە کۆی ئەوشتانەی حیزب نایەوێت باسبکرێن و حیزب نایەوێت خەڵکی کوردستان و کۆمەڵگای کوردی بیانزانێت. ئەوەشی ئامادەنییە وەک فەرمانبەرێکی حیزبی کاربکات، یان لەدەرەوەی ویستی حیزبدا دەنوسێت، بە ئەندازەیەکی دیاریکراو تووشی لێپرسینەوە دەبێت. چیرۆکی مەم بورهان قانیع و ئەو هەموو شکاتانەی لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی دەکرێت و دەرکردنی دوو ڕۆژنامەنووسی بەتوانای وەک نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد و ئازاد سوبحی لەهەولێر لەسەر کار، شایەتی ئەم ڕاستییەن. لە دیدی حیزبە سیاسییەکانی ئێمەدا ڕۆژنامەنووس یان ئیرادەی خۆی بە حیزب تەسلیمدەکات یان دەبێت بڕوات بەقاڵی بکات. حیزبە کوردییەکان ڕۆژنامنووسێکیان ناوێت بەدوای هەواڵێکدا بگەڕێت حیزب نەیەوێت، با ئەو هەواڵە گرنگترین هەواڵی ئەو کۆمەڵگیەش بێت کە تیایدا دەژی.

بێگومان ئەو سیستمە ڕۆژنامەگەرییەی ئەمڕۆکە لە کوردستاندا ئامادەیە ناکرێت بەو سیستمە بەراوردکرێت کە بەعس لە عێراقدا دروستیکردبوو، هەرکەسێک ئەم کارە بکات بێویژدانییەکی گەورەدەکات. بەڵام هەموو بیرکردنەوەیەک لە خۆ بەراوردکردن بە بەعس هەڵەیەکی ئەخلاقی و سیاسی و ویژدانی گەورەیە، بەعس هێزێکی دڕندەیە و سەرۆکەکەشی یەکێکە لە

خـوێنـاویتـرین دیکتـاتۆرەکـانی سـەدەی بیـسـتـەم، لەکـاتێکدا بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بزوتنەوەیەکە بەدرێژایی تەمەنی لەشەڕدابووە لەگەڵ ئەم سیستـمـەدا. بۆیە هـەمـوو ئەوانەی وازناهێن لە بەراوردکـردنی ئەو سیـسـتـمە سیاسییەی ئەمڕۆکە لە کوردستاندا بەرقەرارە بە بەعس و پێماندەڵێن بڕوانە ئێمـە لە بەعس باشـترین، هەم خـیـانەت لە خـۆیـان و هەم لە خـەڵک و هەم لە مێژووی ناسیۆنالیزمی کوردیش دەکەن.

## ٦- ڕۆژنامەگەریی و دەسەڵات لە کوردستاندا

لە سـادەترین پێناسـدا ڕۆژنامـەگـەریی بەو چالاکـیـیە تایبەتە دەگـوترێت کـە سـەرقـاڵی کۆکـردنەوە و ڕێکخـسـتن و چاپ و بڵاوکـوردنەوەی هەواڵ و ڕووداو و بۆچوون و سـەرنجـە نەناسـراو و جـیـاواز و هەنووکـەییـەکـانی ناو کـۆمـەڵگایە، بەشێوەیەکی خێرا و لە کورتترینی ماوەدا بەمەبەستی گەیاندنیان بە گەورتەرین ژمارە لە خوێنەران. بە مـانایەکی دیکە ڕۆژنامگەری ئەو چالاکییەیە کە تاکەکەس و هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگایەک لەکۆی ئەو شتانە ئاگاداردەکاتەوە کە لەو کۆمەڵگایەدا ڕوودەدەن، ئەو ناوەندەیە کە تێیدا کۆمـەڵگا خۆی نیشـانی خۆی ئەدات، لە وێنە و دەرکـەوت و مـەوداکـانی خـۆی دەڕوانێت و بەکـۆی ئەو ڕاو بۆچوون و سـەرنج و دیدانـە ئاشنـادەبێت کـە هێـزە جـیـاوازەکـانی نـاو ئەو کـۆمـەڵگایە هەڵیـانگرتوە. ڕەنگە مـیـتـافـۆری ئاوێنە باشـترین شـتـێکبـێت ڕۆژنامەگەریی پێ بچووێنرێت: ڕۆژنامەگەریی ئەو ئاوێنە ڕەمزییـە گەورەیەیە کە بە کۆمەڵگا وێنە جیاوازەکانی خۆی نیشانئەدات. با لێرەدا هەڵوێستەیەک بکەین و کۆمـەڵێک پرسـیـاری سـادە سـەبارەت بە کـاراکتـەری ڕۆژنـامـەگـەریی کوردی لەخۆمـان بکەین: ئایا ئـەو «ئاوێنە ڕەمزییەی» ناوی ڕۆژنامـەگـەریی کـوردییـە لە کوردستاندا چی پیشانئەدات؟ ئایا ڕۆژنامەگەریی ئەمڕۆکەی کوردستان ئاوێنەی تەمـاشـاکـردنی کۆمـەڵگای کـوردییـە لە وێنەکـانی خـۆی، یاخـود ئاوێنەیەکە تێـیدا حـیـزب هـەم تەمـاشـای خـۆی دەکات هەم وێنەکـانی خـۆی بە کـۆمـەڵگای کـوردی نیـشـانئـەدات؟ ئایا ڕۆژنامـەنووسـان وێنەی کـۆمـەڵگا بە خـودی کـۆمـەڵگا خـۆی نیشانئەدان یان وێنەکانی حیزبی پێنیشانئەدەن؟

سـەرنجدانێکی سـەرپێـیی لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو ڕۆژنامـانەی ئەمڕۆکە لە کوردستـاندا دەردەچن بەو دەرەنجامـەمـان دەگەیەنێت کە ڕۆژنامـەگەریی کـوردی

ئەوەندەی خەریکی نیشاندانی وێنەکانی حیزبە بە کۆمەڵگای کوردی، ئەوەندە سەرقاڵی نیشاندانی وێنەکانی کۆمەڵگای کوردی نییە بە خودی ئەم کۆمەڵگایە. ئەوەندەی هەواڵ و باسوخواس و بۆچوونەکانی حیزب بەرجەستەدەکات ئەوەندە لەدوای کێشە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگای کوردی نییە و بەهیچجۆرێکیش بەشدارنییە لە دروستکردنی دیالۆگێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری ئاشکرا و بەرفراواندا، کە وێناکردن و دید و بۆچوونە جیاوازەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە دەربارەی کێشە هەنووکەییەکانی ناوخۆی نیشانبدات. ڕۆژنامەگەریی کوردی ئەمڕۆکە ئەو ئەرکە گشتی و ئاشکرایە نابینێت کە ڕۆژنامەگەریی ڕاستەقینە دەبێت بیبینێت. ئەگەر ئەرکی ناساندنی کۆمەڵگا بە کێشەکانی و ئاشکراکردنی ئەو هەواڵ و دید و بۆچوون و زانیارییە گرنگانەی لەو کۆمەڵگایەدا ئامادەیە، جەوهەری کاری ڕۆژنامەگەریی بن ئەوا ڕۆژنامەگەریی کوردی لەم ڕووەوە لە دۆخی نووقسانییەکی گەورە و مەترسیداردا دەژی. ئەمڕۆ ڕۆژنامەگری کوردی لەباتی هەواڵی کۆمەڵگا هەواڵی حیزبی پێیە و بەپلەی یەکەمیش خەریکی گەیاندنی ئەم هەواڵانەیە بە خەڵک.

بێگومان بۆ تێگەیشتن لەم نووقسانییە بونیادیە گەورەیەی ڕۆژنامەگەریی کوردی دەبێت لەو ڕاستییە سادەیەوە دەستپێبکەین کە ئەم ڕۆژنامەگەرییە منداڵی هەلومەرجێکی مێژوویی تایبەتە کە دەشێت دووان لە ئاکارە گرنگەکانی بەمشێوەیە دەستنیشانکەین:

**یەکەم**: هەلومەرجی ئامادەگی داگیرکەران و بێبەشکردنی کۆمەڵگای کوردی لە مافی قسەکردن لەسەر کێشە و گرفت و مژدە و هیوا و ئامانج و ڕووداوەکانی ناو هەناوی خۆی.

**دووهەم**: هەلومەرجی ئامادەگی شۆڕش و بەرگریکردنی چەکداری و لەوێشەوە باڵادەستی گوتارێکی حەماسی لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا کە وایکردوە ئەم ڕۆژنامگەرییە لەباتی خۆخەریککردن بە کۆمەڵگا و کێشەکانیەوە سەرقاڵی خۆ خەریککردنبێت بە شۆڕش و کێشەکانییەوە. جگە لە گەیاندنی بەردەوامی هەواڵەکانی حیزب بە کۆمەڵگا.

ئەم دوو پێشینە مێژووییەیە وایانکردوە ڕۆژنامەگەریی کوردی لەهەردوو دۆخەکەدا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، توند بە حیزب و داخوازییە حیزبییەکانەوە

گرێبدرێت. لەدۆخی ئامادەگی داگیرکەران لە کوردستاندا ڕۆژنامگەریی کوردی ڕاستەوخۆ لەژێر کۆنترۆڵی ئەو حیزب و لایەنە سیاسییانەدا بووە کە کوردستانیان داگیرکردوە و بەڕێوەیانبردوە، لەدۆخی شۆڕش و بەرگریشدا ڕۆژنامەگەری لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدابووە بەو حیزبە سیاسییانەوە کە لە شاخەکانی کوردستاندا نەیانهێشتوە ئاگری شۆڕشی درێژخایەنی کوردستان بکوژێتەوە. یەکەمیان هەوڵی جوانکردنی وێنەکانی بەعسی داوە لە کوردستاندا، دووهەمیان هەواڵەکانی شۆڕشی بە کۆمەڵگای کوردی گەیاندوە و بێگومان پڕوپاگەندەشی بۆ ئەو حیزبە کردوە کە دەریکردوە. یەکەمیان پرۆژەی دیسپلینکردنی کۆمەڵگای کوردی پێبووە، دووهەمیان لەڕووی پراکتیکییەوە حیزبی خستۆتە شوێنی کۆمەڵگا، یەکەمیان کاراکتەرێکی فاشیانەی هەیە دووهەمیان کاراکتەرێکی حیزبی داخراو. لە کورتی بیبرینەوە ئەو دوو هێزەی کە خەیاڵی ڕۆژنامەگەریی هاوچەرخی کوردییان لە کوردستانی عێراقدا داڕشتوە بریتین لە:

١- بەرگری کوردی و ئامێزانبوونی ڕۆژنامەگەریی تێیدا بە حیزب و حیزبایەتی.

٢- مۆدێلی بەعس بۆ داڕشتن و چاودێریکردن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و کردنی ڕۆژنامەگەریی بە ئامرازێکی گرنگی پڕوپاگەندەکردن.

بێگومان خوێنەری کوردی ئەو ڕاستییە دەزانێت کە مێژووی حیزبایەتی لە کوردستاندا مێژوویەکی پڕناکۆکی و شەڕ و پێکدادانی خوێناوییە، کۆی ئەم ناکۆکیانەشیان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ گواستراونەتەوە بۆناو ئەو ناوەندەی پێیدەگوترێت ڕۆژنامەگەریی کوردی. بەم گواستنەوەیەش ڕۆژنامگەریی کوردی کاراکتەری دەزگایەکی حیزبی وەرگرتوە و لەناو کێشەی حیزبە سیاسییە ناتەباکانی کوردستاندا نووقمە، ئەمەش ئەو ڕەهەندە سەربەخۆ و ڕەخنەیی و ئازادەی لێسەندۆتەوە کە بە ڕۆژنامەگەری توانای ژیان و گەشەکردن دەبەخشێت.

## ٧- سێ کێشەی گرنگ

گەرچی بە هەندێک حیسابانی سەرپێیی ئەو دوو هەلومەرجەی سەرەوە ئەمڕۆکە لە کوردستاندا بەشێوەیەک لە شێوەکان لاوازبوون، بەعس لە

کوردستاندا نەماوە و هێزە سیاسییە کوردییەکانیش زیاد لە ٥ ساڵە باس لە ئاشتبوونەوە و ڕێکخستنەوەی ماڵی کورد دەکەن. بەڵام هێشتا ئەو خەیاڵە کولتووری و سیاسی و ڕەمزییەی ئەو هەلومەرجە مێژووییە تایبەتە لە پەیوەندیاندا بە ماناکانی ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەگەرییەوە دروستیانکردوە زۆر بەهێزن و تائێستاش بەشی هەرە گەورەی ڕووبەری ڕۆژنامەگەریی کوردی بەڕێوەدەبات. هێشتا کەلەپووری شۆڕشی چەکداریی حیزبی و کەلەپوری بەعس لەوپەڕی بەهێزیدان. لە یەکەمیاندا ڕۆژنامەنووس وەک کادرێکی حیزبی، یان وەک فەرمانبەرێک لەلای حیزب، مامەڵەدەکرێت. لە دووهەمیاندا ڕۆژنامەنووس ستایشی حیزب و سیاسەتەکانی سەرکردە و دەوڵەت دەکات. یەکەمیان کولتوورێکی دروستکردوە کە نەشێت لەدەرەوەی هەقیقەتەکانی حیزبدا هیچ هەقیقەتێکی دی ببینین، دووهەمیان کولتوورێک کە هەموومان ناچاربین شووناسی خۆمان لە شووناسی سەرۆکەوە وەرگرین. یەکەمیان لەنێوان ڕۆژنامەنووس و بزوتنەوەکەدا هیچ مەسافەیەکی ڕەخنەیی نەهێشتۆتەوە، دووهەمیان داوا لە ڕۆژنامەنووس دەکات ببێتە خزمەتکارێکی خۆویستی دیکتاتۆریەت و سیاسەتەکانی. لە هەردوو سیستمەکەشدا میکانیزمی تایبەتی شاردنەوەی زانیاری و هەواڵ و بۆچوون و ڕا و سەرنجی جیاواز ئامادەن و هەردووکیشیان، بەبڕی جیاواز، پانتاییەکی تایبەت بۆ پڕوپاگەندەکردن بەجێدەهێڵن. بەبۆچوونی من ئەم دۆخە تایبەتەی ڕۆژنامەگەریی کوردی سێ کێشەی گرنگی دروستکردوە:

**یەکەمیان:** کێشەیەکی پیشەیی، میهەنییە. کە لە نەبوونی ڕۆژنامەنووسدا بەمانا پیشەییەکەی بەرجەستەیە. واتە نەبوونی ڕۆژنامەنووسێک کە ئەو ئەرکانە جێبەجێکات کە لە بەشی لاپەڕەکانی پێشوودا باسمانکردن.

**دووهەمیان:** کێشەیەکی سیاسییە، کە تێیدا سیاسەت ڕۆژنامەنووس لە کەسێکی پشکنەر و ڕەخنەیی و چاودێریکەرەوە دەگۆڕێتە سەر فەرمانبەرێکی حیزبی، یان فەرمانبەرێک لای حیزب کە دەبێت ئەمر و نەهییەکانی حیزب بنووسێتەوە.

**سێهەمیشیان**: کێشەیەکی کولتوورییە کە بۆتە هۆی دروستبوونی وێنەیەکی تایبەت بۆ ئەرک و شوێن و ڕۆڵ و بەرپرسیاریەت و ئینتیمای ڕۆژنامەگەریی و

ڕۆژنامەنووس کە تێیدا ڕۆژنامەگەریی وەک یەکێک لە ژوورە تایبەتەکانی ناو ماڵی حیزب دەبینرێت نەک وەک ژوورێک لە ماڵی کۆمەڵگادا، بەشێکە لە ویژدانی حزیبی نەک لە ویژدانی کۆمەڵایەتی و شەرعیەتی بوونی لە حیزبەوە وەردەگرێت نەک لە کۆمەڵگاوە.

ئەم سێ کێشەیەش بەسەریەکەوە ڕۆژنامگەری کوردی لەهەر نوزەیەکی ڕەخنەیی بەتاڵدەکەنەوە و بەتەواوی وەک بەشێک لە ژیانی حیزبی لە کوردستاندا سەروەریدەکەن.

**٨- دوو مۆدێلی جیاواز بەڵام لێکچوو**

لەم دوو مۆدێلەدا، مۆدێلی شۆڕش و مۆدێلی بەعس، دوو وێنەی جیاوزمان بۆ ڕۆژنامەنووس هەیە کە لە زۆر ڕووەوە ناکۆکە بەو وێنانەی ڕۆژنامگەریی وەک پیشەیەکی تایبەت بۆ ڕۆژنامەنووسی هەیە. لە مۆدێلی شۆڕشدا ڕۆژنامەنووس پێشمەرگەیە و وەک پێشمەرگەش چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت گوێڕایەڵی داخوازی و ویست و پلانەکانی ئەو حیزبە سیاسییەبێت کە کاری تێدادەکات، ئەو کارەشی کە ئەنجامیئەدات بریتیبووە لە لە بڵاکوردنەوەی دەنگوباسکەنای شۆڕش کە بە پلەی یەکەم دەنگوباسی چالاکییەکانی حیزب بووە، چونکە هیچ ڕادیۆیەکی حیزبی، بۆ نموونە، لە کوردستاندا هەواڵی چالاکییەکانی حیزبێکی دیکەی ناو شۆڕشی بڵاونەکردۆتەوە. جگە لە بڵاکوردنەوەی ئەم هەواڵانە ڕۆژنامگەری کوردی سەرقاڵی.بەرهەمهێنانی گوتارێکی حەماسیی بووە بۆ کۆکردنەوەی خەڵک لەدەوری حیزب و لە دەوری شۆڕش. لە کاتێکدا لە مۆدێلی بەعسدا ڕۆژنامەنووس فەرمانبەری دەوڵەتە و دەبێت وەک فەرمانبەرێک بجوڵێتەوە، ئەوەی دەوڵەت داوایدەکات، کە بێگومان داواکارییەکی فاشیانە و دیکتاتۆریانەیە، پیادەبکات. گەر ئەمەشت نەکرد بکوژرێیت یان بگیرێیت یان ڕاونرێیت.

گەر فێڵ لەخۆمان نەکەین و لەگەڵ ویژدانی مێژوویی خۆماندا ڕاستگۆبین بە ئاسانی دان بەو ڕاستییەدا دەنێین کە بەشی هەرەزۆری ڕۆژنامەگەریی حیزبی لە کوردستانی ئەمڕۆدا پێیەکی لەناو مۆدێلی ڕۆژنامەگەریی شۆڕش و پێیەکەی دیکەی لەناو مۆدێلی ڕۆژنامەگەریی بەعسدایە.

ئەم مۆدێلە تایبەتەش تەواو پێچەوانەی ئەو مۆدێلانەی ڕۆژنامەگەرییە کە بە مەبەستی بنیادنان و پیادەکردنی دیموکراسیەت دەستبەکارن. ڕۆژنامەگەرییەک خولیای بنیادنانی دیموکراسیەت بەڕێوەیببات لە هەوڵی گەڕاندایە بەدوای هەواڵ و باسوخواس و زانیاری هەنووکەییدا کە سەرنجی خوێنەران ڕابکێشێت و کۆمەڵگا پێویستی پێبێت، لەکاتێکدا ڕۆژنامەگەریی حیزبی بەدوای هەوڵ و باس و خواسی هەنووکەیی نەدۆزاوەدا ناگەڕێت، بەڵکو بەدوای خوێنەرێکدا دەگەڕێت کە هەواڵ و حیکایەتە حازرەکانی حیزب ببیستێت. ئەم دوو ئەرکەش تەواو پێچەوانەی یەکترین، یەکەمیان لە کارکردنیادا وەک ڕۆژنامەگەرییەکی سەربەخۆ ڕۆڵی میکانیزمێک دەبینێت بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و ڕا و بۆچوونی جیاواز، دووهەمیان ڕۆڵی ئامرازێکی حیزبی دەبینێت بۆ گەڕان بەدوای خوێنەر و خەڵک و جەماوەردا بۆ هەواڵەکانی حیزب. لە یەکەمیاندا ئینتیمای ڕۆژنامگەریی بۆ پرنسیپەکانی کاری پیشەیی ڕۆژنامەگەرانەیە، لە دووهەمیاندا بۆ ویست و داواکاری و سیاسەتەکانی حیزب، یەکەمیان کاری ئاگادارکردنەوە و بەخشینی زانیارییە دووهەمیان ڕۆڵێکی تەعبەوی دەبینێت، لە یەکەمیاندا ڕۆژنامەنووس کەسێکە لەنێوان کۆمەڵگا و دەسەڵاتداران دەوەستێت، لە دووهەمیاندا ڕۆژنامەنووس بەردەستێکە لە بەردەستەکانی حیزب، یەکەمیان پڕوپاگەندە بەسەریدا زاڵە، دووهەمیان ڕۆحێکی ڕەخنەیی.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو شتانەی تا ئێستا باسمانکردن با جارێکی دیکە بگەڕێینەوە بۆ ئەو کێشەیەی لە نێوان کاک عارف تەیفور و مەم بورهان قانیعدا هاتەکایەوە. کاک عارف سیاسییەکی کوردە و لەناو ئەو هەلومەرجە سیاسی و کولتووری و ڕۆژنامگەرییەدا گەورەبووە کە لەسەرەوە هێمام پێکرد، واتە کەسێکە لەناو بەرگری و شۆڕشی کوردەوە هاتوە و وەک زۆربەی سیاسییەکانی کوردستان ڕۆژنامگەریی وەک ژورێک لە ژورەکانی حیزب تەماشادەکات، ڕۆژنامەنووسیش وەک فەرمانبەری حیزب دەبینێ و دەبێت ئەو هەواڵانە بڵاوکاتەوە کە حیزب حەز بە بڵاکوردنەوەیان دەکات یان مەودای بڵاکوردنەوەیان ئەدات، یان بڵاکوردنەوەیانی پێناخۆش نییە. لە کاتێکدا مەم بورهان قانیع ڕۆژنامەنووسێکی گەنجە و لە سەردەم و ڕۆژگار و هەلومەرجێکی دیکەدا گەورەبووە و دید و تێڕوانین و وێناکردنێکی دیکەی بۆ کاری ڕۆژنامەنووس و ئەرکی ڕۆژنامەگەریی هەیە. لە دیدی ڕۆژنامەنووسە ڕەخنەیی و سەربەخۆکانی

کوردستاندا کاری ڕۆژنامەنووس بریتییە لە ئاشکراکردن، لەکاتێکدا بەشێکی گەورەی کاری حیزبی لە کوردستاندا بریتییە لە نهێنیکاری و شاردنەوە. ڕۆژنامەگەرە سەربەخۆکان کەسانی ڕەخنەگرن لەکاتێکدا بەشێکی زۆری سیاسییەکانی کورد ڕەخنەیان قبووڵ نییە بەتایبەتی لە کەسێک لەدەرەوەی حیزب و لەخۆیان کەم دەسەڵاتدارتر. خەونی ڕۆژنامەنووسی ئازاد خەونێکی دیموکراسییانەیە چونکە دەزانێت تەنها لە سیستمێکی دیموکراسیدا دەتوانێت ئازادانە کاربکات، لەکاتێکدا بەشێکی زۆری خەونی سیاسییەکانی کوردستان ڕێگرتنە لە دروستبوونی دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینە کە تێیدا ئەوان و حیزبەکەیان ناچاربن بە ئاشکرایی کاربکەن و شەفاف بن و نەتوانن شت لەکەس بشارنەوە.

بێگومان ئەم ناکۆکییە لەنێوان دیدی ئەو نەوە گەنجەدا بۆ ڕۆژنامەگەریی و دیدی نوخبەی سیاسی باڵادەست لە کوردستاندا بەم ڕووداوەی نێوان کاک عارف و مەم بورهان قانیع کۆتایی پێنایەت. سبەینێ و دوو سبەی و سێ سبەی ئێمە شایەتی کێشەی دیکەی لەم بابەتە دەبین، چونکە ئەو ناکۆکییە پەیوەندی بە ناکۆی تایبەت و شەخسی نێوان ئەم سیاسی و ئەو ڕۆژنامەنووس نییە، بەڵکو وابەستەی ئەو نووقسانییە بونیادییانەیە کە لەسەرەوە هێمام پێکردن. چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش پەیوەندی بە گۆڕانی ئەو وێنە و ئەرک و چاوەڕوانیانەوە هەیە کە نوخبەی سیاسی باڵادەست لە کوردستاندا بۆ ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەگەرییان هەیە، وەکچۆن وابەستەی ئەوەشە ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ڕازینەبن بەو ئەرکی فەرمانبەرییەی حیزب بەسەریاندا سەپاندوویەتی و بەهۆیەوە هەموو سەربەخۆییەکی لێسەندونەتەوە.

دروستبوونی ئەو چەند ڕۆژنامە ئەهلییە لە کوردستاندا هەنگاوێکی گرنگە بۆ گۆڕانێکی هێمن و لەسەرخۆی ئەو وێنە و چاوەڕوانی و ئەرکانە و پڕکردنەوەی ئەو نووقسانیانەی باسمانکردن، بەڵام ئەو فشارە گەورەیەی لەسەر ئەم ڕۆژنامانە و ئەو ڕۆژنامەنووسانەیە کە تیایاندا کاردەکەن، گومانێکمان لا دروستدەکات دەربارەی ئەوەی ئەم پرۆسەیە لە کوردستاندا بتوانێت بەرە و کامڵبوون بڕوات. مەترسی هەڵوێستی کاک عەرف تەیفور لە مەم بورهان قانیع لەم خاڵەوە سەرچاوەدەگرێت، واتە لە بەرگرتن بە دروستبوونی ڕۆژنامەگەرییەکی ئازاد و بەکارهێنانێکی خراپ و ناڕاستی ئەو دەسەڵاتەی کە

کاری سەرەکی ڕۆژنامەگەر چاودێریکردنیەتی. هەر لێرەشەوە ئەو پەتای شکاتکردنەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا یەخەی ڕۆژنامە ئەهلییەکانی گرتۆتەوە هیچی لێسەوز نابێت جگە لەسەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو شێوازی ڕۆژنامەگەرییەی بەعس لە عێراقدا دروستیکردبوو. ئاخر بەشێکی زۆری ئەو یاسایانەی ئەمڕۆ ڕۆژنامەنووسانیان پێ داوەریدەکرێت هەر یاساکانی بەعس خۆین یان کۆپییەکی سووکتری ئەو یاسایانەن کە دواجار عێراقی کردە یەکێک لە تۆقێەرترین ئەزموونە سیاسییەکانی سەدەی بیستەم.

لەمانەش بترازێت ئەمڕۆ نەوەیەک لە خوێندەواری گەنج لە کوردستاندا دروستبووە کە منالّی ئەو گۆڕانکارییە گەورانەن لە ١٥ ساڵی ڕابووردوودا لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا هاتوونەتەکایەوە، ئەم نەوەیە بەعس ناناسێت و باسکردنی ڕابووردی تێکۆشەرە سیاسییەکان و خەباتی حیزبەکوردییەکانیش بەس نییە بۆئەوەی وایانلێبکات هەستێکی تەندروستی بەبەرپرسیاریەتیان بەرامبەر بە مێژووی کۆمەڵگای کوردی و ئەو خەباتەی نەوەکانی بەر لەوان ئەنجامیانداوە، تیادروستبێت. فرۆشتنی ڕابوردوی حیزب و ڕابووری تێکۆشەرانی حیزب بەم نەوەیە نایانکاتە هاوڵاتی بەرپرسیار، ئەم نەوەیە پێویستی بەوەیە وەک بوونەوەری ئازاد و سەربەخۆ و خاوەن ئیرادە مامەڵەی لەگەڵدابکرێت، ئەو هەستەی لا دروستبێت کە توانای بڕیاردانی هەیە و وەک هاوڵاتییەکی بەرپرسیار دەتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر ئەو سیستەمە سیاسیەی لە کوردستاندا باڵادەستە و لەسەر ئەو بڕیارانەش کە بەڕێوەبەرانی ئەو سیستەمە دەریدەکەن. نەک لەڕێگای فشار و ترس و زیندانیکردنەوە مامەڵەیان لەگەڵدابکرێت و هەقیقەتی تاڵی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتیان وەک کوردایەتیکردن پێبفرۆشرێت.

**٩- ڕۆژنامەگەریی کوردی و مەترسییەکانی جیانەکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکدی**

تا ئێستا قسەمان لەسەر کێشەی ئاشکرانەکردن و شاردنەوەی زانیاری لە کوردستانداکرد، بەتایبەتی شاردنەوەی زانیاری باوەڕپێکراو لەسەر «ئابوری حیزب» و توانا مادییەکانی حیزب لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا. لەوەش دواین چۆن ئەم دۆخە ڕۆژنامەنووسی ناچارکردوە گوێ بۆ سەرچاوەی نهێنی و

شاراوە و نەناسراو ڕادێرێ و چۆن ئەم کارەش ئەگەری بڵاوبوونەوەی زانیاری ناڕاست گەورەدەکات. هەروەها لەو پەیوەندییە ئاڵۆزانەش دواین کە ڕۆژنامەنووس و حیزب لە کوردستاندا بەیەکدیەوە گرێدەدات و ئەوەمان نیشاندا کە ڕۆژنامەگەریی کوردیی تا ئێستاش پێیەکی لەناو مۆدێلی ڕۆژنامەگەریی شۆڕش و پێیەکەی دیکەی لەناو مۆدێلی بەعسییانەی کاری ڕۆژنامگەریدایە. لێرە بەدواش باس لە پەیوەندی نێوان سیستمی ڕۆژنامگەریی و سیستمی داد لە کوردستاندا دەکەین و ئەوە کێشانە باسدەکەین کە ئەم پەیوەندییە دروستیکردوون و لەئایندەشدا دروسیاندەکات.

### ١٠- دادگا لەنێوان ڕۆژنامەنووس و نوبەی سیاسی دەسەڵاتداردا

بۆ نیشاندانێکی سەرەتاییانەی پەیوەندی نێوان دادگاکانی کوردستان و ڕۆژنامەنووسان و ڕۆژنامەگەری جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کێشەیەی لەنێوان کاک عارف تەیفوری ئەندامی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و مەم بورهان قانیعی ڕۆژنامەنووسدا ڕوویدا. ئەم کێشەیە نموونەیەکی زیندوو بەرجەستەمان نیشانئەدات لە ماهیەتی ئەم پەیوەندییە و گەمەکەرە سەرەکییەکانی و چۆنیەتی دەرکردنی بڕیارەکان. ئەوەی سەرنجی کەسێکی دەرەوەی ئەو کێشەیەی نێوان کاک عەرف و کاکە مەم ڕادەکێشێت هەڵوێستی دادگایە لە هەولێر. سەرەتا ڕازینەبوونی دادگا بە بەربوونی کاکە مەم بە کەفالەت خۆی شوێنی پرسیارە، زۆربەی پارێزەرانی کوردستان ئەو ڕاستییە دەزانن کە لە دۆخێکی وادا بەردانی تۆمەتبار بە کەفالەت مەسەلەیەکی ئاساییە و پێویست بەهێشتنەوەی تۆمەتبار لە زینداندا ناکات. (بۆ دڵنیابوون لەم خاڵە من پەیوەندیم بەچەند پارێزەرێکەوە کرد و ئەوان ئەو مەسەلەیەیان بەو شێوەیە هەڵسەنگاند، واتە کێشەکە دەکرا بەبێ زیندانیکردنی کاکە مەم بچێت بەڕێوە و دادگای هەولێر دەکرا ئەم ڕۆژنامەنووسە گەنجە تا ڕۆژی داوەریکردن بە کەفالەت بەرەڵابکات).

جگە لەم مەسەلەیە خودی بەربوونی کاکە مەم دوای ٣٤ ڕۆژ زیندانیکردن بە کەفالەت، بێگومان دوای واستەیەکی زۆر و پەیوەندیکردن بە کاک عارف و کەسوکار و ناسراوەکانییەوە، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە ئەم ڕۆژنامەنووسە یەکرا ئەو ماوەیە لە زینداندا نەهێڵدرێتەوە و زووتر بە کەفالەت بەربدرایە.

ڕاستە لە عێراقدا بەپێی یاساکانی بەعس داوەری لێکۆڵینەوە بۆ مەبەستی تەواکوردنی لێکۆڵینەوە دەتوانێت تۆمەتبار بۆ ماوەیەکی تایبەت لە زینداندا بهێڵێتەوە، بەلاّم لە دۆخی کاکە مەمدا لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ لە ئارادانەبووە تا پێویستی بەو ماوە درێژەی زیندانکیردن بێت. جەوهەری کێشەکەی کاکە مەم ئەوەبووە کاک عارف داوای ناوی ئەو سەرچاوەیەی لێکردوە کە لە هەولێرەوە هەواڵەکەی بۆ سلێمانی ناردوە. مەمیش بە ڕاشکاوی بەم بەڕێزەی ڕاگەیاندوە کە ئەو ناوی ئەو سەرچاویە نازانێت، (لەڕاستیدا بیشیزانێت عورفی ڕۆژنامەگەری داوای ئەوە دەکات کە ڕۆژنامەنووس لەزۆربەی هەرەزۆری حاڵەتەکاندا سەرچاوەی نهێنی هەواڵەکانی ئاشکرانەکات)

بێگومان هەڵویستی دادگا تەنها لە مەسەلەی هێشتنەوەی کاکە مەم لە زینداندا و ئازادنەکردنی بە کەفالەت کۆتایی پێنایەت، دەشێت درێژکردنەوەی ماوەی هێشتنەوەی ئەم ڕۆژنامەنووسە لە زینداندا، بەپێی پێودانگەکانی بەعس، کۆمەڵێک پاساوی یاسایی بۆ بهێنرێتەوە و بگوترێت ئەو ماوەیە بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە کێشەکەدا پێویست بووە، بەلاّم ئەوەی ناکرێت لەپاڵ هیچ سیستمێکی یاساییدا هیچ پاساوێکی بۆ بهێنرێتەوە ئەم سێ مەسەلەیەن:

یەکەم: بۆ مەسەلەی دیتن و سەردانی کاکە مەم ڕازیبوونی کاک عارف پێویستبووە. تا نامەش لە مەکتەبەکەی ئەوەوە نەچوو بۆ حاکم حاکمەکە مەودای سەردانی ئەم ڕۆژنامەنووسەی قەدەغەکردبوو. بەمانایەکی دیکە ئەوەی بڕیاری دیتن و سەردانی کاکە مەمی لەدەستدابوو حاکم و مەحکەمە نەبوو، بەڵکو کەسی کاک عارف بوو.

دووهەم: بۆ بەردانی کاکە مەم بە کەفالەت دیسانەوە ڕازیبوونی کاک عارف پێویست بوو، واتە بڕیاری بەربوونی کاکە مەم بە کەفالەت بڕیاری حاکم نییە بەڵکو بڕیاری کاک عارفە.

سێهەم: کاک عارف کاکە مەمی ناچارکردوە نامەی پاشگەزبوونەوە و لێبوردن بنووسێت، بەوشێوەیەش کە لەگەڵ زەوق و سەلیقە و ویستی بەڕێزیدا بگونجێت. (لەبەشی یەکەمی ئەم ووتارەدا هێمامان بەوە کرد کە کاک عارف بە نامەی یەکەمی کاکە مەم ڕازینابێت و ناچاری دەکات نامەیەکی دیکە بنووسێت)

ەم سێ دۆخـەدا ئێـمـە نەک لەبەردەم حـوکـمی یاسـادا نین بە ڵکو لەبەردەم
وکمی دەسـەڵات و سـایکۆلۆژیا و زەوقی کاک عـارفداین، نـەک مـەحکەمـە وەک
زگایەکی سـەربەخۆ ناجوڵێتەوە و کارناکات بەڵکو وەک دەزگایەکی ژێردەستی
ک عـارف دەجـوڵێـتـەوە بڕیارەکـانی بەپێی داواکـارییـەکـانی ئەو دەردەکـات.
کـورتی ئەوەی لێـرەدا بڕیاری گرتن و سـەردان و کـەفـالەتوەرگـرتن و بەربوون
ردەکات دادگایەکـی سەربەخۆ و ئازاد و بێلایەن نییە، بەڵکو هەست و ویست و
ادەی تۆڵەکردنەوەی کاک عارفە. ئەگەر درۆ لەگەڵ خۆمان و خـەڵک و ئایندەی
للەتەکەمـانـدا نەکەین، لەم سێ دۆخـەدا ئێمـە لەبەردەم شێوەیەکی نالەبار و
راپ و ئاشکرای پێشـێلکردنی یاسـاداین کە لە خـەیاڵی زۆرمـاندا سـەردەمی
س و چۆنیـەتی هەڵسوکەوتی بەرپرسەکانی بەعسـمان لەگەڵ یاسا و داوەر و
گادا بیردەخاتەوە. ئەم هەڵسوکەوتە شایەتی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتێکە
میللەتی ئێمە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکات بەشێوەیەکی بەرپرسیار بیباتە ناو
یهانی ئالۆزی سـەدەی بیست و یەکەمـەوە و بۆ ئینسانی ئێمە، کـە نزیکەی
ەدەیەکە داگیرکەران ئیهانەی دەکەن و وەک بوونەوەرێکی بچووک تەماشای
کەن، ڕێز و ئیرادە و هێز بگەڕێنێتەوە.

ایشـارمـەوە ئەگەر حوکم و دەسـەڵاتی یاسا لە کوردسـتـاندا دەستبەکار و
ادەبێت ئەوەی لەم مەسـەلەیەدا پێویستی بە لێپرسینەوە هەیە، کاکە مەم نییە
کو کەسی کاک عارف تەیفورە، ئەوەی یاسا پێشێلدەکا ڕۆژنامەنوسێکی کورد
ە بەڵکو یەکێکە لە سـەرکردە سیاسییەکانی ئەم میللەتە، ئەوەی دەسـەڵات
راپ بەکاردەهێنێت مەم نییە بەڵکو کاک عارفە. خۆش لەوەدایە هەم کاک عارف
ەم بەشـێکی گەورەی نوخبـەی سیاسی کـوردیی هاوڵاتی یەکێک لە دەوڵەتە
ئاواییـەکـانن و لەزۆر ڕووەوە مـافی خـۆیان و مـاڵ و منـاڵ و هـاوڕێ و
ەسـوکـارەکـانیـان لەو ولاتـانەدا پارێزراوە و کـەس نـاتوانێت لەو ولاتـانەدا
انونیاین بەرامبەر بکات. کـەچی ئەم بەڕێزانە لە کوردسـتـاندا ئەو ڕاستییە
دانانە لەیاددەکەن و بە شێوەیەک مامەڵەی یاسا و سیستمی داوەریی دەکەن
هی سەردەمی فـیـودالیزم و ئاغـایەتی کـۆنە و بەسـەدان ڕیشـەی ئاشکار و
ێنییـەوە بە کـەلەپووری دیکتـاتۆریانەی بەعسـەوە بەسـتـراوەتەوە، نەک بە
موونی دیموکراسییانەی ئەو ولاتانەوە کە خۆیان هاوولاتیان تیایدا. گومانم
ە نییە کـاک عـارف لەمن باشـتـر دەزانێت کە ئەم شـێوازی بەکارهێنانە نا

بەرپرسیارانەی دەسەڵات نەک ناتوانێت سیستمێک بنیادنێت کە ڕێزی ئینسا بگرێت، بەڵکو ڕووی لە دووبارەکـــردنەوەیەکی ترسناکی ئەزمــــوونی ئە سیستمانەیە کە سووکایەتی بە ئینسـان و کۆی ئەو بەهایانە دەکەن کە ب ئینسان نرخێکی تایبەت دەبەخشێت، سیستمێک لەساتێکی تایبەتیدا بەشێک گەورەی سەرکردایەتی ئەمڕۆی کوردی ناچارکرد تەنانەت لە شـاخـەکـانی کوردستانیشدا نەتوانن بژین و بۆ ڕۆژئاوا هەڵێن.

بۆیە ئەو پرسیارانەی لێرەدا پێویستیان بە وەڵامدانەوەیە ئەمانەن: ئەم جۆر پێشێلکردن و خراپ بەکارهێنانەی دەسەڵات لە کوردستاندا بۆ ڕوودەدات؟ چیی وداەکات سیاسییەک ویست و زەوق و سایکۆلۆژیا و هەستی تۆڵەکردنەوەی خۆ بخاتە شوێنی یاسا؟ لەبەرچی دادگا لە وڵاتی ئێمەدا زیاتر ڕۆڵی دەزگایەکی حیزبیی دەبینێت تا دەزگایەکی سەربەخۆی خاوەن دەسەڵات؟ ئایا بنەماکان جێبەجێنەکردنی دروشمی حوکمی یاسا، کە دروشمێکە حیزبە سیاسیی باڵادەستەکانی کوردستان هەڵیانگرتوە، لەکوێدایە؟ هۆی چییە بەشێکی ەگورە سیاسییەکانی کورد وەک ئاغا و فیوداڵەکانی سەدەکانی پێشوو مامەڵە لەگە دەسەڵات و یاسا و دادگادا دەکەن؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە یەکەمین دەروازەیەک نابێت لێینزیکبینەو مەسەلەی هێرشی شەخسیی و تاوانبارکردنی ئەم سیاسی و ئەو داوەر و ئە دادگایە بەتەنها، بێگومان تاکەکەسەکان دەتوانن کاردانەوەی جیاوازیا بەرامبەر بەو کێشانە هەبێت کە ڕوودەدەن، بەڵام کێشەکە تەنها وابەستەی ئە ئاستە تاکەکەسییە نییە و لەڕاستیشدا ئەم ئاستە تاکەکەسییە لاوازترین ئاسد و ڕووکەشترین دەرکەوتی ئەو کێشەیەیە کە من لێرەدا ڕەهەندە نادیار قووڵەکانی دەخوێنمەوە. بەکورتی ئەوەی نابێت لە خەیڵماندا ئامادەبێد مەسەلەی لەکەدارکردنی ناوبانگی ئەو کەسانەن کە ئەم کێشەیەیان خستۆتەو واتە وازهێنانە لەو گەمە ناشیرینەی جنێوبازی و سووکایەتیپێکردن تۆمەتکارییەیە کە ساڵانێکی درێژە بەشێکی بەرچاوی کولتووری سیاسی کورد و ڕووبەرێکی بەرفراوانی ڕۆشنبیری کوردیشە. لەباتی ئەوە دەبێت بەدوا جەوهەری کێشەکاندا لە شوێنە ڕاستەقینەکانی خۆیاندا بگەڕێین. ئە جەوهەرەش وابەستەی بوونی کۆمەڵێک کەموکوڕیی بونیادی و قووڵ هەمەلایەنە لە پەیوەندی نێوان سیاسی و ڕۆژنامەنووس و لە پەیوەندی نێوا

سیاسی و داد و دادگا و داوەراندا. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە لەخۆڕا و لە ئاسمانەوە نەبوون بە بەشێک لە ڕەوشتی سیاسی کوردی و ڕەوشتی ئەو سیستمە دادگاییەی لەپاڵ ئەو سیستمە سیاسییەدا دەژی. بۆئەوەی لە کورتی بیبڕینەوە دەکرێت بڵێین: سەرچاوەی ئەم کەموکورییانە هەم لە پێکهاتی ئەو سیستمە سیاسییەدایە کە کۆمەڵگای کوردی بەڕێوەدەبات و هەم لە پێکهاتی ئەو سیستمی دادگاییەدا کە لە کوردستاندا بەرقەرارە. چۆنیەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم دوو سیستمەیە ئەو هەل و توانا و ئەگەرە بە دەسەڵاتداران ئەدات هەرکاتێک بیانەوێت سایکۆلۆژیای خۆیان بخەنە شوێنی یاسا و چیان ویست بیخەنە سەردەم و ژێر پێنووسی داوەرەکان.

تا ئەم ساتەی ئێستاشمان سیستمی سیاسی لە کوردستاندا سیستمێکە هەڵگری بەشێکی گەورەی کولتووری شەڕی چەکداری و ئەو جەنگە خوێناوییانەیە کە باڵەکانی ناو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی یەکدیان پێ وێرانکردوە. سیستمی دادگاش لەزۆر ڕووەوە درێژکراوەی هەمان ئەو سیستمی دادەیە کە بەعس زیاد لە سی ساڵە لە کوردستاندا ئینسانی کوردی پێ زەلیل و بچووک و بێمانا دەکات. لێرەوە هەردوو سەرکی هاوکێشەکە لە دۆخێکی نادروست و نەخۆش و قەیراناویدان، نە سیاسییەکانی کوردستان کەسانی دیموکراسن و ڕێزی مافەکانی مرۆڤ دەگرن و وەک فیوداڵێک هەڵسوکەوت ناکەن، هەم ئەو سیستمی دادەی کە لە کوردستاندا ئامادەیە لە یاسا و پێدراو و ئەخلاقیاتی بەعس ڕزگاریبووە و دەوێرێ و دەتوانێت بە سەربەخۆیی و ئازادانە بڕیاربدات. ئەگر هەنگاوێک زیاتر وەپێشچین دەشێت بپرسین: داخۆ سیفەتی سەرەکی ئەو سیستمە سیاسییە چییە کە ئەم هەلومەرجە تایبەتە دەخولقێنێت؟ ئەوە کام سیستمە تێیدا دادگا و داوەران دەبنە پاشکۆیەکی لاواز و بێکاراکتەر و بێقورسایی سیاسی و سیاسەتکارەکان؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەگەڕێمەوە بۆ قسەکردن لەسەر یەکێک لە گرنگترین پرنسیپە سیاسییەکانی دەسەڵاتی دیموکراسی کە (لێکجیانەکردنەوەی دەسەڵاتەکانە)، چونکە تەنها لەڕێگای نیشاندانی چۆنیەتی ڕێکخستنی ئەم پەیوەندیانە لە دیموکراسیەتدا دەکرێت لادان و ناشیرنییەکانی لە سیستمەکانی دیکەدا ببینین.

**١١. کێشەی لێکجیانەکردنەوەی دەسەڵاتەکان**

زیاد لە سێ سەد و پەنجا ساڵێک لەمەوبەر و لە کتێبی (ڕۆحی یاساکاندا) فەیلەسوفی فەرەنسی مۆنتیسکیو باس لە چۆنیەتی بنیادنانی دەسەڵاتی دەوڵەتی یاسا دەکات و تیورەی لێجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، کە دواتر دەبێتە بەردی بناغەی هەر سیستمێک بەخۆی بڵێت دیموکراسی، پێشنیاردەکات. مەبەست لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکدی جیاکردنەوەی دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و دەسەڵاتی داوەریکردنە لەیەکدی.

١ـ دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن لەژێر دەستی ئەو حکومەت یان کابینەیەدا دەبێت کە لەساتێکی مێژوویی دیاریکراودا وەک دەرنجامی هەڵبژاردنێکی ئاشکراو گشتی دروستبووە. حکومەتیش مەرجنییە هەمیشە یەک گروپ بیبات بەڕێوە بەڵکو دەشێت زیاد لە گروپ و لایەنێک بەشداربن لە بەڕێوەبردنیدا، بەڵام بەپێی بڕی ئەو دەنگانەی کە لە هەڵبژاردندا هێناویانە. ئەوەشی ئەمڕۆ هەڵبژێردراوە و پۆستە حوکومییەکانی وەرگرتوە مەرج نییە سبەینێ هەڵبژێردرێتەوە و ئەو پۆستانەی پێبدرێتەوە. واتە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەسەڵاتێکی هەڵبژێردراو و کاتییە و بەردەوام لەبەردەم ئەگەری گۆڕاندایە.

٢ـ دەسەڵاتی یاسا دانان لەژێر دەستی پەرلەماندادەبێت. پەرلەمانیش نوێنەرانی هەموو میللەتی تێدایە، هەر هێز و گروە و لایەن و حیزبێک بە قەد کۆی ئەو دەنگانەی کە دەیانهێنێت لە پەرلەماندا بەشداردەبێت. پێکهاتی پەرلەمانیش بەپێی بڕی دەنگهێنان دەگۆڕێت.

٣ـ دەسەڵاتی دادوەریکردن لەژێر دەستی دادگادا دەبێت. لێرەشدا دادگا هێزێکی سەربەخۆیە و پەیوەندی بە حیزب و کەس و گروهی تایبەتەوە نییە، داوەر خاوەنی دەسەڵاتێکە کە لە خودی کارەکەی خۆیەوە هەڵدەقوڵێت و دەستورێکی دیموکراسییانە و کۆمەڵێک یاسا کە مافەکانی مرۆڤ دەپارێزێت پاڵپشتی دەکات، نەک لەژێر ڕەحمی بڕیاری ئەم حیزب یان ئەو حیزب و هەڕەشە و فشار و دۆستایەتیکردنی ئەم یان ئەو سیاسیدابێت. دەسەڵاتی داوەری لە دوو دەسەڵاتەکەی دیکە جێگیرترە و ماوەی درێژ وەک خۆی دەمێنێتەوە و گۆڕانی گەورە و گرنگی بەسەردا ناهێنرێت.

لە ئەمریکا داوەرەکان کلینتۆنیان دادگایی کرد. لای ئێمە داوەر ناوێرێت

تەناتە یاساکانی بەعسیش لەدەرەوەی فشاری سیاسییەکانی کورددا پیادەبکات.

بێگومان بۆ هەریەکێک لەو شێوە جیاوازانەی دەسەڵات دەزگای تایبەت دروستدەبێت کە عەقڵانیەتی دەزگایی بە مانا ڤێبەرییەکەی و یاسا و نۆرمی دیموکراسییانە بەڕێوەیاندەبات، هەر یەکێکیش لەو دەزگایانە چاودێری چۆنیەتی کارکردن و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ئەویدیان دەکات و سنوورێک بۆ دەسەڵاتەکانی دادەنێت. بۆ نموونە پەرلەمان چاودێری کار و کردەوەکانی حکومەت دەکات و سنوورێک بۆ ویست و توانا و هەڵسوکەوتەکانی ئەو وەزیر و بەرپرسانە دادەنێت کە لەناو حکومەتدا دەستبەکارن. ئەندامانی پەرلەمانیش کۆمەڵێک یاسا هەڵسوکەوتیان بەڕێوەدەبات کە پێشێلکردنیان ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی یاساییان دەکاتەوە، دادگاش دەتوانێت لەهەر کەسێک بپرسێتەوە کە لە یاسا لایدابێ و دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزی خۆی بەشێوەیەکی خراپ باکارهێنابێت. لە سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی حیزب و گەورە دەسەڵاتدارانەوە بیگرە تا بە هاوڵاتییەکی سادە دەگات. ئەم دەسەڵاتەی دادگاش دەستور دەیپارێزێت و داوەر لەوە ناترسێت حیزبێک یان سیاسییەک لەسەر کار لایببات، یاخود ناچاریکات داوەرییەک بکات لەگەڵ زەوق و ویست و سایکۆلۆژیای ئەم یان ئەو سیاسیدا یەکبگرێتەوە و دژ بە یاسا و بەندە یاساییەکانبێت، یان لەوە بترسێت گەر بڕیارێکی بەدڵی ئەم یان ئەو سیاسی نەدا لەسەر کار لاببرێت یان دووربخرێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، واتە نەقڵ بکرێت.

**١٢- ئازادی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان**

بەپێی ئەم جیاکارییەی دەسەڵاتەکان لەیەکتری دۆخێک دروستدەبێت کە ناهێڵێت گروهێک هەر سێ شێوەکەی دەسەڵات لەدەستی خۆیدا کۆبکاتەوە، ناهێڵێت هیچ هێزێک لەیەک کاتدا هەم دەسەڵاتی یاسادانان، و هەم دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و هەم دەسەڵاتی داوەریکردنی بەدەستەوەبێت، یاخود دەسەڵاتێکیان ئەوانیدکەیان ناچار بە نووچدان و بێدەنگبوون و ئەنجامدانی کاری نایاسایی بکات. ئەم سێ شێوە جیاوازەی دەسەڵات دەبێت بەسەر کەس و لایەن و هێز و گروهی کۆمەڵایەتی جیاوازدا دابەشبێت. ئەوەشی پەیوەندی نێوان ئەو لایەنانە ڕێکدەخات دەستور و چاودێری بەردەوام و یاسایە نەک ویست و زەوق و

ئیرادەی لایەنێک بەتەنها. لە فەلسەفەی سیاسیدا ئەم تیورەیەی دەسەڵات وەک تیورەیەکی پلورالیست ناویدەرکردوە و ڕێک پێچەوانەی ئەو سیستمە دیکتاتۆری و نیمچە دیکتاتۆریانەیە کە هەموو دەسەڵاتەکان لەدەستی گروهێکی بچووکی حیزبی یان تاکەکەسێکدا کۆدەکەنەوە.

لەم شێوازە تایبەتەی ڕێکخستنی دەوڵەت و حکومەتدا ئازادی کاتێک مەیسەر دەبێت کە هیچ گروپێک توانای مۆنۆپۆلکردنی ئەم شێوە جیاوازانەی دەسەڵاتی نەبێت. لەهەر وڵاتێکدا هێزێک دروستبوو توانی کۆی ئەو دەزگایانەی ئەم سێ شێوە دەسەڵاتە بەرجەستەدەکەن بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، ئەوکات ئەو شێوازی دەسەڵاتەی دروستدەبێت تاکڕەو و دەسەڵاتگەر و ستەمگەر دەبێت، هیچ میکانیزمێک نامێنێتەوە بۆ چاودێریکردنی چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسەڵات و ڕەوشتی دەسەڵاتدارانی.

فەلسەفەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکدی فەلسەفەیەکە ڕێگر لەوەی دەسەڵات بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و ناڕاست بەکاربهێنرێت و کەس نەتوانێت لە دەسەڵاتداران و چۆنیەتی بڕیاردان و بەکارهێنانی دەسەڵاتیان بپرسێتەوە. ئەم فەلسەفەیە ئەو میکانیزمانە فەراهام دەکات کە بەهۆیانەوە کۆمەڵگا بتوانێت بەگژ هەر شێوەیەکی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتدا بچێتەوە. لەهیچ شوێنێکی جیهاندا پێشێلکردنی پرنسیپی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکدی بەو ئەندازەیە لەئارادنەبووە وەک لە عێراقی بەعس و ڕۆژگاری سەدام حوسەیندا. زیاد لە سی ساڵ جەنگی خوێناوی بەعس دژ بە کورد، ئەنفالکردنی گوند وشارۆچکەکانی کوردستان، گرتن و کوشتنی سەدان و هەزاران مرۆڤ، هەڵگیرساندنی چەندان جەنگی خوێناوی دۆڕاو، ئیهانەکردنی ڕۆژانەی مرۆڤ و سووکایەتیپێکردن و ناچارکردنی بۆ بوون بە بەعسی و ڕێگرتن لە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی کەسێک کە بەعسی نەبووبێت، بەهەدەردانی سامانی نەتەوەیی عێراق و ئیفلاسکردنی سەرتاسەری، هەموو ئەم شتانە دەرەنجامی کۆبوونەوەی کۆی هەموو ئەو دەسەڵاتانەی سەرەوەبوو لەدەستی دیکتاتۆرێک و نوخبەیەکی حیزبی بچووکدا. ئەنجامی ئەوەبوو کە مرۆڤ و کۆمەڵگای عێراقی بەدرێژایی مێژووی ئەم سی ساڵەی دوایی هیچ دەزگا و یاسا و میکانیزمێکی لەبەردەستدا نەبوو بتوانێت سنوورێک بۆ بڕیار و هەڵسوکەوت و ڕەوشتی ئەو دەسەڵاتدارانە دابنێت کە عێراقیان بەڕێوەدەبرد. ڕەگەکانی وێرانەیی ئەمڕۆکەی عێراق لە

یانەکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا بوو لەو وڵاتەدا. ئەوەی لێرەدا شایانی باسکردنە
و ڕاستییەیە کە بەعس هەموو ئەو دەزگایانەی هەبووە کە تیورەی
کجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان خوازیاریانە. بەعس هەم حکومەتی هەبوو، هەم
ەرلەمان و هەم سیستمی داوەری، بەڵام هیچ یەکێک لەم لایەنانە
ەربەخۆنەبوون. پەرلەمانی عێراقی هەمیشە پەرلەمانێکی کارتۆنی بووە و تەواو
بەردەم مەجلیسی قیادەی سەورەدا ئیفلیج بووە، دادگا لەبەردەمی فشاری
یزب و بەرپرسەکانیدا ئیفیلج بووە و حکومەتیش لەبەردەم دەسەڵاتی سەدام و
ۆر و ئامۆزا و نیمچە براکانیدا ئیفلیج. ئەوەی لە کوردستاندا دەبێت ڕێی
بگیرێت دووبارەکردنەوەی ئەم ئەزموونە ناشیرینەی بەعسە. ئەمەش ناکرێت
ەر بەڕاستی دابەشکردنێکی ئاشکرای دەسەڵات و لێکجیاکردنەوەیان لەیەکدی
ووستنەبێت، گەر هەر بەشێک لەو دەسەڵاتانە بە دەزگای ڕاستەقینەی خاوەن
سەڵات نەبەخشرێت و دەستورێکی دیموکراسیش ئامادەنەبێت بۆ هەمووان
اف و ئەرکەکان دەستنیشانبکات، نەک زەوق و ویستی ئەم یان ئەو
ەرپرسیاری سیاسی. بەکورتی ئەوەی دەبێت لێیبترسین و دژی ڕاوەستین
ەوەی کە دەزگاکانی کوردستان وەک دەزگا کارتۆنییەکانی عێراقیان لێبێت،
تە هەم پەرلەمان ببێتە پەرلەمانێکی کارتۆنی، هەم سیستمی داوەری و
دگاکان و هەم حکومەتیش. نایشارمەوە پرۆسەی بە کارتۆنیکردنی ئەم
ەزگایانە لە کوردستاندا ئامادەیە و بەردەوام دەزگاکان زیاتر ئاکارێکی
ارتۆنیانە وەردەگرن. چارەسەرنەکردنی ئەم کێشانە سەرەتای دارمانێکی
ەورەیە.

**١- ئەزموونی کورد و ئەزموونی بەعس**

بێگومان گوناهێکی گەورە دەکەین گەر ئەزموونی کوردستانی عێراق لە
ەوەدەکاندا بە ئەزموونی بەعس بەراوردبکەین، ڕاستە ئەم ئەزموونە خاڵی
شیرینی هێجگار زۆرە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا ئامادەیە بە چەندان
ەنگاو لەپێش ئەو سیستمەوەیە کە بەعس لە عێراقدا بینایکردوە. بەڵام
ستییەکی سادە هەیە کە باشتربوون لە بەعس مانای دیموکراسیبوون
گەیەنێت. بەعس هێزێکی فاشییە، نەبوون بە فاشیەت مانای ئەوە نییە تۆ
یموکراسی و ڕێزی مافەکانی مرۆڤ دەگری و ئەو دەسەڵاتەی هەتە

بەشێوەیەکی خراپ بەکارینا‌هێنیت. دەسەڵاتێک بۆئەوەی ببێت بە دەسەڵاتێک
دیموکراس و ڕێزی مرۆڤ و کۆمەڵگا و ژیان بگریت و هاوڵاتیان بەشێوەیەک
یەکسان مامەڵەکات، ئەوەندەی بەس نییە لە بەعس نەچێت، بەڵکو دەبێت هەڵگر
زۆر کارەکتەری دیەکەبیت کە دەکەونە ئەودیوی لە بەعس نەچوونەوە. لەپێش
هەمووشیانەوە لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، دروستکردنی میکانیزم
تایبەتی چاوێریکردن و لێپرسینەوەی کۆمەلایەتی و یاسایی سەربەخۆ
لەهەمووشی گرنگتر ئامادەبوونی هەموو لایەنەکان بۆ چاودێریکردن
لێپپرسرینەوەی یاسایی. ئەو کەسەی کەپێیوایە دە ساڵ یان بیست ساڵ یا
ئەوەتەی هەیە پێشمەرگەبووە و ئەمە وایلێدەکات نەکرێت لە کاروکردەوەکان
بپرسرێتەوە، ڕێ لە دروستبوونی ئەو سیستمە دیموکراسییە دەگرێت کە خەڵک
ئێمە نزیکەی سەدەیەکە خەباتی بۆدەکات. جارێکی دیکەش دەیڵێمەو
دیموکراسیەت تاقە ڕێگایەکە بشێت بە کورد مژدەی ئایندەیەک بدات کە تێید
جینۆساید نەکرێت و وەک ئەرمەنی و قیبتی و هیندییە سوورەکانی لێنەیەت.

لێرەوەیە کە نابێت لادانی کاک عارف تەیفور لە یاسا و بێدەنگبوونی دادگ
لەهەولێر لەو لادانە وەک ڕووداوێکی سادە و ڕێکەوتێکی خراپ تەماشاکەین. ئ
ڕووداوە هێمایەکی ڕاستەوخۆیە بۆ هەلومەرجێک کە دەسەڵاتەکانی تێد
جیانەکراوەتەوە، یاسا سەروەر نییە، دادگا ئازاد نییە، سایکۆلۆژیا
دەسەڵاتداران لە شوێنی بڕیاری داوەران کاردەکات، حیزب زۆربە
ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری کۆنترۆڵکردوە. ئەمانەش
کۆمەڵێک دەرکەوتن کە پێویستیان بەپیاچوونەوە و چارەسەرکردنی خێرا هەیە
نەک بێدەنگبوون لێیان بە بەهانەی ئەوەی ئەوانەی ئەمڕۆ دەسەڵاتیا
بەدەستەوەیە دوێنێ پێشمەرگەبوون و کوردایەتیان کردوە و قوربنیان داوە
بێگومان ڕابووردوی ئەو بەڕێزانە جێی ڕێز و ستایشە، بەلام کۆمەڵگای ئێم
چیدی لەو ڕابووردوەدا ناژی و ڕووی بەجیهانێکی نوێدا تەقیوەتەوە کە پێویستی
بە سیستم و عەقلیەت و خەیاڵێکی نوێ هەیە. دوای زیاد لە ١١ ساڵ لە حوکم
حیزبە کوردییەکان لە کوردستاندا چیدی بڕی نیشتیمان پەروەری و دڵسۆزی ب
ڕابووردوی حیزبی و سالانی پێشمەرگایەتی ناپێورێت، بەڵکو بەگوێگرتن
بەدەمەوەچوونی داواکارییەکانی ئەو جیهانە نوێیە دەپێورێت کە کەوتووینەت
ناویەوە.

بێگومان هەرکەسێک کەمەکێک بەوردی لە هەلومەرجی ئەمڕۆکەی کوردستان ڕابمێنێت بە ئاسانی بەو ڕاستییە دەگات کە دەسەڵاتەکان لەیەکدی جیانەکراونەتەوە و هەرسێ شێوەکەی دەسەڵات لەژێر دەستی حیزب و سەرکردەکانی حیزبدان. هەموومان دەزانین مەکتەبی سیاسی حیزبەکان لە پەرلەمانی کوردی گرنگترن و دەسەڵاتی بەرپرسە حیزبییەکان لەدەسەڵاتی داوەران گەورەترە و دەسەڵاتی سەرکردە حیزبییەکان لە دەسەڵاتی هەردوو حکومەتەکە مەزنتر. ئەمانەش هێما بۆ هەلومەرجێک دەکەن کە پێویستی بە گۆڕانی خێرا و گرنگ و ڕیشەیی هەیە. ئەم دۆخە تایبەتەیە هێزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا داوەتدەکات بۆ ئەنجامدانی خەباتێکی دیموکراسییانەی هێمن و بەردەوام و هەمەلایەن، لەپێش هەمووشیانەوە ڕۆژنامەنووسان و ڕۆژنامەگەریی کوردی.

## ١٤- ڕۆژنامەگەریی و نەبوونی دەسەڵاتی چوارەم لە کوردستاندا

ئەوەی تا ئێستا باسمانکرد نیشانیئەدات لە کوردستاندا نەک دەسەڵاتەکان لەیەکدی جیانەکراونەتەوە بەڵکو نوخبەکانیش لەیەک جیانین. لەڕاستیدا جیابوونەوەی نوخبەکان لەیەکدی مەرجێکی هێجگار گرنگی پایەداربوونی سیستمی دیموکراسییەتە. لای ئێمە نوخبەی دەسەڵاتدار نوخبەیەکی هەمەلایەنە و لەهەموو شوێنێکدا ئامادەیە و بڕیارە گرنگەکانی کۆمەڵگای ئێمەی لەبەردەستدایە، لەبڕیارە سیاسییەکانەوە بیگرە بۆ بڕیارە ئابووری و کولتووریی و کۆمەلایەتییەکان. ئەم نوخبە دەسەڵاتدارە نوخبەیەکی حیزبییە و خاوەنی هێزی سەربازییە و ڕاستەوخۆ لە سێنتەری دەسەڵاتدایە. ئەم نوخبەیە بەشێکی گەورەی ڕووکارە گرنگەکانی کۆمەڵگای کوردی مۆنۆپۆڵکردوە، ئەمەش وایکردوە لە کوردستاندا نوخبەی جیاوازمان نەبێت کە لە کایەی جیاوازدا دەسەڵاتی جیاوازیان هەبێت. هەموو نوخبەکان دەبێت حیزبی بن و لەناو حیزبدا توابنەوە، هیچ نوخبەیەک لەدەرەوەی حیزبدا هەلی مانەوەی وەک نوخبەیەکی چالاک و خاوەن کاریگەریی لەسەر بڕیاردانی کۆمەلایەتی و سیاسی زۆر لاوازە. لە کوردستاندا نوخبەی ئابووری و نوخبەی سیاسی تا ڕادەیەکی زۆر هەمان نوخبەن، نوخبەی سەربازی و نوخبەی سیاسیش لێکجیانین، نوخبەی ڕۆشنبیری و زانستیش بەتوندی بەستراونەتەوە بە ڕەورەوەکانی نوخبەی

حیزبییەوە (زۆربەی ئەوانەی لەناوە زانکۆکان و دەزگا رۆشنبیرییەکاندا لەشوێنی بڕیارداندان سەر بە حیزبەکانن و وەلائی یەکەمیان بۆ حیزبە بەر لە هەر شتێکی دیکە و بەڕادەیەکی زۆر ویستی حیزب لەو کایانەدا پیادەدەکەن). هیچ یەکێک لەو نوخبانە لەسەر بنەمای ئەو پیشەیەی کە هەیانە بەشێک لە دەسەڵاتیان بەدەستەوە نییە، بەڵکو دەسەڵاتی هەر گروپ و لایەنێک، گەر هەیانبێت، لەوەدایە داخۆ لەناو حیزبدان یان نا، لە سەرکردەکان نزیکن یان نزیک نین، وەلائی رەهایان بۆ هەموو شتەکانی حیزب هەیە یان نیانە. بەم مانایە لە کوردستاندا هەلومەرجی دروستبوونی نوخبەی جیاوازی خاوەن دەسەڵات بەتەواوی داخراوە و پرۆسەی دروستبوونی نوخبەکان لەلایەن حیزبەوە بە قووڵی کۆنترۆڵ و چاودێریکراوە. بە کورتی لە کوردستاندا نە نوخبەی جیاواز و نە دەزگای جیاواز بۆ دابەشکردن و جیاکردنەوەی دەسەڵات لەئارادایە. ئەم دۆخەش وایکردوە هەموو قسەکردنێک لەسەر جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە کوردستاندا قسەکردنێکی ناڕاست بێت و زیاتر تەعبیر لەو رۆحیەتی دروشمبازییە بکات کە سەروەرە نەک هەقیقەتێکی سیاسی و مەدەنی، درۆ و پڕوپاگەندە بێت، نەک واقیعێکی بەرجەستە.

ئەو پرسیارەی لێرەدا و لە پەیوەندیدا بە دەسەڵاتی رۆژنامەگەریی و سدەسەڵاتی رۆژنامەنووسانەوە دەبێت لە خۆمانی بکەین ئەوەیە: ئایا لە کۆمەڵگایەکدا سێ دەسەڵاتە سەرەکییە لە یەکدی جیانەکرابێتەوە، نوخبەی جیاوازی نەبێت و حیزب و وەلائی رەها بۆ سەرکردەکان دەستنیشانی شوێن و جێی کەس و لایەنەکان لە هەرەمی دەسەڵاتدا بکات، دەشێت دەسەڵاتی چوارەمی تێدا دروستببێت؟ ئایا دەشێت لە غیابی لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتە سەرەکییەکاندا لەیەکدی، رۆژنامگەری ببێتە دەسەڵاتی چوارەم و کاریگەری هەبێت؟

بەرلەوەی وەلامی ئەم پرسیارە بدەینەوە با وردتر مەبەستمان لە دەسەڵاتی چوارەم روونبکەینەوە.

دەستەواژەی «دەسەڵاتی چوارەم» دەستەواژەیەکە زیاد لە دوو سەد ساڵ لەمەوبەر فەیلەسوفی سیاسی ئینگلیزی، ئیدمۆند بیورکە، بەکاریهێناوە. مەبەستی ئەم فەیلەسوفە لەم دەستەواژەیە دروستبوونی دەسەڵاتی رۆژنامەنووسان و رۆژنامەگەرییە لەپاڵ سێ شێوەکەی دیکەی دەسەڵاتدا. واتە

ئەوەی ئەم فەیلەسوفە باسیدەکات دروستبوونی دەسەڵاتێکی نوێیە لەپاڵ دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و داوەریدا، ئەم دەسەڵاتەش لەدەرەوەی ئەواندا ئامادەیە و کاری چاودێریکردنی هەرسێکیانە بەسەریەکەوە. ئەو پرسیارانەشی لە پشتی چەمکی دەسەڵاتی چوارەمەوەن پرسیارگەلێکی لەم بابەتەن: چۆن ڕۆژنامەگەریی دەبێتە ئەو هێزەی بەهۆیەوە کۆمەڵگا بتوانێت چاودێری چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسەڵات بکات؟ چۆن ڕۆژنامەنووسان دەتوانن هێزە دەسەڵاتدارەکان چاودێریبکەن؟ چۆن شێوازی کارکردنی دەزگا ڕاپەڕێنەکان و دەزگاکانی یاسادانان و دەزگاکانی سیستمی داوەری چاودێریبکرێن و کەموکوڕیٰ و لادانەکانیان دەربخرێن؟. ئێمە سەرەتا ئەوەمان ووت کە هەریەکێک لەم سێ شێوازەی دەسەڵات ئەم ئەویدیان چاودێریدەکات و کەموکوڕییەکانی دەخاتە ژێر لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە. بۆ نموونە، کاتێک سەرۆکی حکومەت، وەک باڵاترین کەسێکی ناو سیستمی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن، کارێکی هەڵەبکات ئەوکات هەم لەبەردەمی پەرلەمان و هەم لەبەردەمی سیستمی یاسادا تووشی لێپرسینەوە دەبێت، هەڵەی لایەنەکانی دیکەش بەهەمان شێوە لێیان دەپرسرێتەوە. دەسەڵاتی چوارەم دێت بۆئەوەی لەپاڵ ئەم چاودێریکردنە ناوەکیەی دەزگاکان بۆیەکدی، لەدەرەوەشڕا چاودێرییەکی دیکە دروستببێت کە لە کۆی شتەکان بپرسێتەوە، ئاکاری سەرەکی ئەم چاودێرییە دەرەکییەش لەوەدایە کە چاودێری کۆمەڵگایە لەسەر کۆی دەزگاکان و لەسەر خۆی. بە مانایەکی دیکە دەسەڵاتی چوارەم مانای بەخشینی توانایەکی دیکەی چاودێریکردنە بە کۆمەڵگا کە بەهۆیەوە بتوانێت کۆی شتەکان چاودێری بکات. ئامانجی سەرەکی دەسەڵاتی چوارەم بەرگریکردنە لە کۆمەڵگا لە بەرامبەر هێزە باڵادەستەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایە خۆیدا.

ئەوەی دەتوانێت دەسەڵاتی چوارەم بپارێزێت و شەرعیەتی پێببەخشێت لەشکر و تفەنگ و دەزگای چەکدار و نهێنی نییە، بەڵکو هێزە ڕەخنەییەکانی ناو کۆمەڵگا خۆین کە لە فۆرمی ڕۆژنامەگەریی و ڕۆژنامەنووسدا بەرجەستەن. لە هەموو جیهاندا نە ڕۆژنامەگەرییەک و نە ڕۆژنامەنووسێک هەیە دەبابە و تۆپ و دەزگای ئاسایش و لەشکری تایبەتی هەبێت بۆ خۆپاراستن، بەڵکو هێز و ئامادەگی کۆمەڵگا بۆ ڕەخنەکردن و ئامادەگی دەسەڵاتە جیاوازەکان بۆ چاودێری و دەستووریکی دیموکراسیی هەیە کە چۆن پێشوەخت سێ

دەسەڵاتەکەی دیکەی لەیەکدی جیاکردۆتەوە، ئاواش بە ڕۆژنامەنووسان دەسەڵاتی چوارەم دەبەخشێت.

لێرەوە ناتوانین بەبێ لێکدیجیاکردنەوەی سێ دەسەڵاتە سەرەکییەکە لەیەکدی قسە لەبوونی دەسەڵاتی چوارەم بکەین، ڕێگەی دروستبوونی دەسەڵاتی چوارەم بە لێکدیجیاکردنەوەی سێ دەسەڵاتەکەدا تێدەپەڕێت. لێکجیاکردنەوەی سێ دەسەڵاتەکەش لەیەکدی مانای ئامادەگی کۆمەڵگا و نوخبە و ناوەندێکی سیاسی و کولتووریی فرەڕەنگ بۆ ڕەخنەگرتن و خودچاودێری و ڕێزنان لە جیاوازی.

لێرەوە هەموو قسەکردنێک لەسەر ڕۆژنامەگەریی ئازاد و ڕۆژنامەنووسی سەربەخۆ قسەکردنێکی بێمانا دەبێت گەر دەستورێک نەبێت لەڕێی لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ئامادەگییەوە بۆ ڕەخنە دۆخێکی دروستکردبێت ڕۆژنامەنووسان و داوەران و هێزەکانی دیکە بتوانن بەسەربەخۆیی و لەدەرەوەی فشاری حیزب و هێزە دەسەڵاتدارەکاندا کاربکەن. ڕۆژنامە کاتێک ئازاد ئەبێت کە کۆمەڵگا ئازادبێت، کۆمەڵگاش کاتێک ئازاد دەبێت کە دەسەڵاتەکان لە دەستی نوخبەیەکی بچووک و داخراودا کۆنەکرابێتەوە. لە کوێدا نوخبەی دەسەڵاتدارا نوخبەیەکی داخراو بوو، لەوێدا شتێک نامێنێتەوە ناوی ئازادی و ڕەخنە و کرانەوە بێت.

**١٥. ئەنجام**

کێشەی نێوان مەم بورهان قانیع و کاک عارف تەیفور دۆخێکمان نیشانئەدات کە تیایدا سیاسییەک دەتوانێت بڕیاری گرتنی ڕۆژنامەنووسێک دەربکات، هەرئەویش دەستنیشانی ئەوەدەکات کەی و چۆن و بەچ شێوەیەک سەریلێبدرێت، بەکەفالەت بەربێت یان بەرنەبێت، ناچاربێت نامەی لێبووردن بنووسێت، یان نەینووسێت، حوکمبدرێت یان نەدرێت. لەهەمانکاتدا ئەم کێشەیە لە ئامادەگی سیستمێکی دادگایی ئاگادارمان دەکاتەوە کە ناتوانێت خاوەنی لانیکەمی سەربەخۆیی نییە و ئیرادەی بڕیاردانی لەدەستی ئیرادەی بەرپرسە سیاسییەکاندایە. لەمەش بترازێت ئەم نموونەیە ئەوەمان نیشانئەدات ئێمە لە کۆمەڵگایەکدا دەژین بەتەواوی لەژێر ڕەحمی زەوق ق ویست و خواست و سایکۆلۆژیای سیاسییەکانیدایە و میکانیزمێکیشی نییە لەڕێگەیەوە بتوانێت سنوورێک بۆ ئەو ویست و خواست و زەوق و سایکۆلۆژیایە دابنێت.

لەهەر کۆمەڵگایەکدا نوخبەیەکی سیاسی داخراو هەبوو، زیندان هەبوو، حیزبی سیاسی هەبوو، میلیشیای چەکدار هەبوو، دەسەڵاتدارانێک هەبوون کە بتوانن دەرگای زیندانەکان بکەنەوە و دایبخەن، توانای بەکارهێنانی توندوتیژی هەبوو، ئەگەری سوکایەتیکردن بە ئینسان هەبوو، ترس هەبوو، بێقانوونی هەبوو، دەبێت ڕۆژنامەنووسی ئازاد هەبێت. کۆمەڵگایە ئەو هەموو ناشیرینیانەی هەبێت، دەبێت شتێکی بچووکی بۆ بەرگریکردن لە خۆی هەبێت. ئەزموونی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان نیشانیداوین کە ئامادەگی سیستمێکی ڕۆژنامگەریی ئازاد هەنگاوێکی گرنگی دروستبوونی ئەو میکانیزمەیە کە لانیکەم توانای باسکردن و ئاشکراکردنی ناشیرینییەکان بە کۆمەڵگا دەبەخشێت.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستویەکەمدا هەر کۆمەڵگایەک بیەوێت بەرگری لە ماف و هێز و ئیرادەی بەشە جیاوازەکانی ناو خۆی بکات، پێویستی بە سیستمێکی دادگایی سەربەخۆ و سیستمێکی ڕۆژنامگەریی ڕاستەقینە هەیە کە دەسەڵاتدارەکانی چاودێریبکات. دەسەڵات لەهەر کوێ بوو دەبێت کۆمەڵێک یاسا و هێز و تواناهەبێت چاودێریکات، مێژووی هاوچەرخی مرۆڤایەتی نیشانیداوین لەهەر شوێنێک دەسەڵاتێکی چاودێرینەکراو هەبوو یان دەسەڵاتێک هەبوو ئامادەنەبوو چاودێریبکرێت، لەوێدا ئەگەری سووکایەتیکردنی گەورە بە ئینسان ئامادەیە. دەسەڵات لە خشتەبەرە، چاودێریکردنی تەنها هۆکارێکی سنووردانە بۆ لەخشتەبردنی.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم نووسینە توانیبێتی هەندێک پرسیار بوروژێنێ و هۆکارێکبێت بۆ دروستبوونی دیالۆگێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەرفراوان لەسەر ئەم مەسەلانە. هیواداریشم کۆی بۆچوونەکانی ناو ئەم ووتارە وەک دەلاقەیەک بۆ چاکترکردن و جوانترکردنی ئەو ئەزموونە گرنگە ببینرێت کە لەکوردستاندا ئامادەیە نەک وەک پەلامار و هێرشی سیاسی و تاکەکەسی.

زۆر سوپاسی هاوڕێی ئازیزم کاک ئاراس فەتاح دەکەم کە ئەرکی
دەرهێنانی ئەم کتێبە و دروستکردنی بەرگەکەی گرتە ئەستۆ.

«زۆربەی هەرە زۆری [illegible] دۆگما تازەکانی ناو ڕۆشنبیری و فیکری سیاسی کوردین. هەڵەیەکی گەورە دەکەین پێمان وابێت دۆگماکانی ناو ڕۆشنبیرییەک توانای تازەبوونەوەیان نییە. چۆن توانا ڕەخنەییەکانی ناو ڕۆشنبیرییەک قابیلی تازەبوونەوەن ئاواش دۆگماکانی قابیلی تازەبوونەوەن.»

«ئەوەی بەجیهانی دەبێت تەنها کولتووری ئەمریکی یان فەرەنسی یان ئەڵمانی نییە، بەڵکو کولتووری هیندی و ئەفغانی و ئێرانیشە. وەک چۆن بەندەکانی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ بە جیهانیی دەبن و لەم سەری جیهانەوە بۆ ئەوسەری جیهان دەڕۆن، ئاواش بۆچوونە ئاینییەکانی گروپی ئەلقاعیدە و وێنەکانی ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیریش بەجیهانیی دەبن.»

«پڕمەترسیترین دەسەڵاتێک ئەو دەسەڵاتەیە کە بانگێشەی بنیادنانی بەهەشت دەکات و مژدەی ئەوەمان ئەداتێ کە لە جەهەنەمەوە بەرەو بەهەشت بمانگوێزێتەوە.»

«وەک چۆن سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سامانی نەتەوەیی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بنەمای مادییانەی ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی دادەڕێژێت، ئاواش سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی ماناکانی هەقیقەت بەسەر هێزە جیاجیاکاندا بنەما ویژدانی و ئەخلاقی و ڕەمزییەکانی هەمان ئاسایش مەیسەردەکات.»

«ئینسانی ئوسوڵی ئینسانێکی مژدەبەخشە و یەکێک لە کاراکتەرە سەرەکییەکانی ئوسوڵییەت مژدەبەخشینە. هیچ دیدێکی ئوسوڵی نادۆزینەوە، چەند خەمبار و مەرگدۆست و ڕەشبینیش بێت، هەڵگری کۆمەڵێک مژدەی بەهەشتی نەبێت.»

